تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

# خەرمان لۆغە



منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

نووسینی
محمدی شەلماشی

چاپی دووەم

خوێنەری بەڕێز ! ئەگەر ڕۆژێک خۆم بە غەریب دەزانی، چونکە لە سەردەشتێ ڕا هاتبووم بۆ سلێمانی و لەوکاتەیدا کە پێشنوێژ و دوان بێژی خانەقای حەزرەتی (مەولانا خالید) بووم و لە سەر حەوزەکەی بەردەمی حوجرەکەی (مەسنەوی مەولانای ڕۆمی)م تەرجەمە دەکرد و هەروەها لەسەر فەرمایشتی ڕەئیسی عولەمای شەریعت و تەریقەت شێخ (جونەیدی) بەغدادی ڕەزای خوای لێ بێ کە فەرموویەتی:

(حکایا تُ المشایخ جندٌ منْ جنودِ اللّهِ)، واتە فەرمایشت و قسەی پیاوچاکان لە عیلم و زانیاری دا لەشکرێکە لە لەشکرەکانی خوای گەورە و ڕوو بکەنە وڵات و مەنزڵ و ماڵی هەر دڵێکەوە نەفس و شەیتان و هەواو هەوەس لەو شوێنە بار دەکەن.

ژیانی (پێغەمبەران) و مەجلیسی ئەولیایانم دەنوسی، چونکە باسی بەسەرهات و فەرمایشتیان دەبێتە هۆی مەجلیس خۆشکردن و ڕوو کردنە چاکە و دووری لە خەراپە و سەوابی زۆری دواڕۆژ و فێربوونی زۆر زانیاری و هەرچەند لە سایەی خواوە لە سلێمانی لە ناو زۆر زانا و پیاوچاکاندا بووم و ڕێزو حورمەتم لە قەدەر خۆم زۆر زیاتر بوو. جێگا و ڕێگا و ماڵی خۆش و ئیمام و خەتیب بووم، بەڵام دوبارە هەر پێموابوو لە غەریبیم و ئەو فەرمایشتەی شێخی (سەعدی)م زۆر دەخوێندەوەکە فەرموویەتی : بەرد لە جێگای خۆی سەنگینە و بەزەییم بە حاجی قادر و نالی دا دەهاتەوەکە لە کوردستانەوە چووبوونە ئەستەنبوڵ و کەوتبونە وڵاتی غەریبی و نەمدەزانی کە قەزاو قەدەر لە ئاخری تەمەنمدا نزیک قوتبی شیمالیان بۆ دیاری کردووم و ئێستا کە ڕۆژی بیستی دوازدەی هەزارو نۆسەت و نەوەت و هەشتە لە وڵاتی فینلەندم و لە شاری هێلسنکی و لە قاتی هەشتی ئاپارتومانێکدا و لەبن پەنجەرەی ژوورەکەی خۆم دانیشتووم و دەڕوانمە ئەو بەحرە پان و بەرینە و دەڵێم : ئای خۆزگەم بەو بەردەی کە لە جێگای خۆی سەنگینە، بەڵام دوبارە دڵخۆشی خۆم بەوە دەدەمەوەکە خۆ هەموو کورەی زەوی مڵکی خوایە و دیارە

ئیرادەی خواش لە سەر هەرچی بێ، ڕەد نابێتەوە و دەبێ بێتەدی. جا ئەو فەرمایشتەی حەزرەتی (عەلی)م هاتەوە یاد، کە فەرموویەتی: (رَوِّحُوا الْقُلوبَ بِطرائِفِ الْحِكَمِ فَإنَّها تَمِلُّ كَما تَمِلُّ الأبدانُ).

واتە، ئەگەر هات و وەڕەز و بێتاقەت بوون، دڵی خۆتان بە قسە و باسی خۆش، خۆش بکەن، چونکە دڵ هیلاک و ماندوو دەبێ هەر وەکو جەستە، کە ماندوو دەبێ، بەڵام بە قسە و حیکایات و نەزیلەی خۆش ئیسراحەت دەکا و دێتەوە سەرخۆ. جا خۆ ئەگەر لەو دوور وڵاتیە بە شتێکەوە خەریک نەبی هەر شێت دەبی.

گوێگرینە؛ هەرچەندە سەبارەت بە مەزاح و گێڕانەوەی قسەی خۆش و نوکتە بۆ پێکەنین زۆر شت گوتراوە، بەڵام لە لایەکی تریشەوە مەدحی کراوە. تەنانەت حەزرەت دروودی خوای لە سەربێ، چەند جار مەزاحی کردووە. بۆ نموونە دەڵێن: بە ئافرەتێکی گوت : فریای مێردەکەت بکەوە لە چاوانیدا سپیایەتی هەیە. ئافرەتەکە بەپەلە چۆوە ماڵ و بە مێردەکەی گوت: ئەوە چیت لێ قەوماوە ؟ (پێغەمبەر) فەرمووی: چاوی پیاوەکەت سپیایەتی تێدایە. مێردەکەی حاڵی بوو کە حەزرەت چی فەرمووە: پێکەنی و گوتی: ئافرەت ، حەزرەت ڕاستی فەرمووە: ئەوە شۆخی لەگەڵ کردوی؛ خۆ خەراپی نەفەرمووە چاوی هەموو کەس سپێینەی هەیە.

هەروەها دەڵێن: جارێک پیرێژنێک عەرزی دەکات و دەڵێ: بە سەدەقەت بم، دوعام بۆ بکە تا خوای گەورە عەفووم بکات. حەزرەت لە وەڵامیدا دەفەرمووێ: بۆ نەتزانیوەکە پیرێژن ناچنە بەهەشتێ؟ پیرێژن هاوار دەکا و خەریک دەبێ بگری؛ حەزرەت پێدەکەنی و دەفەرمووێ: ئایا ئەو ئایەتەت نەخوێندوتەوەکە خوای گەورە دەفەرمووێ:

(إِنَّا أَنْشَأْنَاهُنَّ إِنْشَاءً فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَاراً عُرُباً أَتْرَاباً)، واتە ئێمە ئافرەتان دەکەینەوە بە کچی چواردە ساڵ و هەموویان لە یەک تەمەندا دەبن، پیرێژن لەخۆشیان گەش بۆوە. دوبارە دەڵێن: یوحەننا و شەمعون دوو حەواری حەزرەتی (عیسا) بوون. یوحەننا عادەتی وابوو لە هەر مەجلیسێکدا بوایە خەڵکەکەی وەپێکەنین دەخست، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو شەمعون بچوبایە ناو هەر کۆمەڵێکەوە، دەگریا و خەڵکەکەی وەگریان دەخست. جارێک شەمعون بە یوحەننا دەڵێ: بۆ ئەوەندە پێدەکەنی؟ دەڵێی لە هەموو شتێک بویتەوە. یوحەنناش لە وەڵامیدا دەڵێ: ئەی تۆ بۆ ئەوەندە دەگری دەڵێی لە ڕەحمەتی خوا نائومێد بوی. دەڵێن: لەوکاتەدا خوای گەورە وەحی کرد بۆ حەزرەتی عیسا و فەرمووی: یا عیسا پێیان بڵێ من خووی یوحەننام پێ باشترە لە گریانەکەی شەمعون. جا لەسەر ئەو پێوودانە هاتم

دەستم کرد بە گەڕان بە سەرخەرمانانداو لە خەرمانی هەر خاوەن جۆخینێک هێندێکم هێناو تێکەڵم کرد و ئەو کۆ خەرمان لۆغەی لێ پەیدابوو. بەڵام هەروەک دەزانن خەرمان لۆغە چاک و خەراپی تێکەڵە و ئەگەر چاوتان بە خەراپەکانی کەوت خەتای من مەگرن و لۆمەی خاوەن خەرمانەکان بکەن، کە چاک و خەراپ بۆ هەژاران تێکەڵ دەکەن.

بەڵام من بەرچاوتەنگ نیم و ئەوا خەرمان لۆغەکەم پێشکێش بە ئێوەی بەڕێز دەکەم تا بەشە باشەکانی بکەنە شەوچەڵەی کوڕەکانتان تا لە لایەک دڵتانی پێخۆش بکەن و لە لایەکی دیکەشەوە پەندی لێ وەرگرن و لەسەر خەرمانی خۆتان بەشی چاک بدەن بە برای هاوولاتیتان و ئەگەر زۆر بەخیلیش نەبن، جارجار بە دوعای خێر یادی ئەو برا غەریبە دوور ولاتەتان بکەنەوە و لە خەرمانی دوعاکانتان خەرمان لۆغەی بەش بدەن، خێرتان دەگاتێ.

محەممەدی شڵماشی

(ئەسکەندەر) کە دنیای داگیر دەکرد؛ زۆری هەوڵدا تا بە فێڵ قەڵاتێکی زۆر قایمی گرت و فەرمانیدا وێرانی بکەن. گوتیان: قوربان ! حەکیمێکی زۆرزان و دانای موشکیل گوشا و بە توانای تێدایە؛ گوتی: بچن بۆم بانگ بکەن. کە هات ئەوەندە ناشیرین بوو نەدەچۆ دڵانەوە و نەفرەتی لێ دەکرد. ئەسکەندەر کە تەماشای کرد گوتی: ئەوە چ وێنەیەکی بێ وێنەیە و چ شکڵێکی ترسێنەرە هەتە؟ زاناکە بە قسەی ئەسکەندەر تورە بوو؛ لە تورە بوونەکەیدا زۆر پێکەنی و گوتی:

تانە لەمن مەدە کە ناشیرینم
ئەی بەتاڵ لە فەزیلەت و ئینساف
لاشە وەک کالانە و گیا ن شەمشێر
ئەوەی دەکرێ بە شیرە نەک کالان

دوبارە گوتی ئەی ئەسکەندەر! ئەوەی کە خولقی لەگەڵ خەڵکدا خۆش نەبێ، ئەوە پێستی بەدەنی زیندانی ئەوە و لە وجودی خۆیدا ئەوەندە لە تەنگانە و نارەحەتیدایە کە زیندان لە چاو وی وەک سەیرانگایە. گوتی: ئینسانی رژد و بەخیل و حەسود هەمیشە لە رەنج و نارەحەتی دایە و لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا لە شەڕ دایە و هەرچی خوا بیدا بە خەڵک ئەو پێی ناخۆشە و ئەوەی بە نسیب ئەویش نەبێ دڵی پێوەیە. ئینسانی حەسود رەخنە لە کارەکانی خوا دەگرێ و کە شتێکی خەڵکیشی چاوپێکەوت دەڵێ: بۆچی خوا داویەتی بەو و نەیداوە بەمن؟

ئەسکەندەر هەر گوێی بۆ راگرتبوو. دوبارە کابرا گوتی: ئینسانی عاقڵ و سەخی ماڵی دنیای بۆ پیاوەتی دەوێ؛ بەڵام ئینسانی بێ عەقڵ و بەخیل بۆ واریسانی کۆ دەکاتەوە. گوتی: ئەگەر پیاوی گەورە لەگەڵ منداڵان گاڵتە بکات، ئەوە ئابروی خۆی دەبا و تۆزی بێ نرخی بەخۆیدا دەکا و ئەوەی لەگەڵ ژێردەستانی خۆیدا چنگە پەپۆ بکا، ئەوە بە پێڵاوی دەسەڵاتداران دەخرێتە ژێرپێ. ئەسکەندەر کە گوێ و هۆشی لەو پەند و حیکمەتانە پڕ بوو، کابرای خەڵات کرد و دەستی لە وێرانکردنی شارەکەش هەڵگرت. جا ئەوەیە کە دەڵێ: عەقڵ و زانیاری فریای خاوەن عەقڵ و

خەڵکیش دەکەوێ.

*****

رۆژێک (ئەسمەعی) لەسەر سفرەی هارونەڕەشید حازر بوو؛ باسی پالودەیان کرد. ئەسمەعی گوتی: زۆر عەرەبی دەشتەکی هەن کە پالودەیان نەدیوە و نایناسن. هارونەڕەشید گوتی: لەسەر ئەو قسەی خۆت بەڵگەیەکم بۆ بێنەوە، دەنا وانیە. بەرێکەوت رۆژێک هارونەڕەشید چوو بۆ راوێ و ئەسمەعیشی لەگەڵ بوو. دیتیان عەرەبێک لە دوورەوە دێ، هارونەڕەشید بە ئەسمەعی گوت: بچۆ بیهێنە بۆ لام، ئەسمەعی چوو بۆ لای کابرا و گوتی: کاکە! ئەمیری موسوڵمانان داوات دەکا، وەرە بچین بۆ لای، کابرا گوتی: بۆچی ئەوە ئەمیری موسوڵمانانە و موسوڵمان دەبێ ئەمیریان هەبێ؟ ئەسمەعی گوتی: بەڵێ. کابرا گوتی: ئەمن ئیمانم پێ نیە؛ ئەسمەعی تورە بوو جنێوی پێدا و گوتی: (یاولدُالزّنا). کابرا بە بیستنی ئەو جنێوانە تورە بوو و ئێخەی ئەسمەعی گرت و ئامبازی بوو. ئەسمەعی دوبارە دەستی کردەوە بە جنێو پێدانی. هارونەڕەشیدیش هەر سەیری دەکردن و پێدەکەنی. لە پاشان کابرا هات بۆلای هارونەڕەشید و گوتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان!

حەقم لەو پیاوەی خۆت بستێنە جنێوی پێدام. هارونەڕەشید گوتی: باشە تۆ دوو درەمی بدەیێ. عەرەبەکە تورە بوو گوتی: (سوبحانَاللّە) جنێویشی پێداوم و دەبێ دوو درەمیشی بدەمێ؟ هارونەڕەشید گوتی: بەڵێ حوکمی ئێمە ئاوایە. کابرا لەسەرخۆ رووی کردە ئەسمەعی و گوتی: (یاابنَ الزّانِیَین)! واتە ئەی کوڕی دوو زیناکەران. گوتی: دەبرۆ بە حوکمی ئەمیری موسوڵمانان چواردرەمم بۆ بێنە. هارونەڕەشید ئەوەندە پێکەنی بەپشتدا کەوت؛ لە پاشان کابرایان لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە بۆ قەسری هارونەڕەشید؛ کە چاوی بەو عەزەمەت و شەوکەتە کەوت و مەجلیسی هارونەڕەشیدی دی، بەلایەوە زۆر گەورە بوو؛ هاتە پێشەوە و گوتی: (السّلامُ علیکَ یااللّە)، هارونەڕەشید گوتی: ئەوە دەڵێی چی؟ بێدەنگ بە. کابرا گوتی: (السّلامُ علیکَ یانبیَ اللّە). گوتیان: بێدەنگ بە ماڵ نەوێران ئەوە دەڵێی چی؛ ئەوە ئەمیری موسوڵمانانە. ئنجا گوتی: (السّلامُ علیکَ یاأمیرَالمؤمنین). هارونەڕەشید گوتی: (وعلیکَ السّلام). لەپاشان دایاننا و سفرەیان راخست و ئەنواعی تەعامیان خوارد. لەپاشان پالودەیان هێنا. ئەسمەعی گوتی: ئومێدەوارم کە نەزانێ پالودە چییە؛ هارونەڕەشید گوتی: ئەگەر نەیزانی کیسەیەکت دراو دەدەمێ. هەرکە عەرەبەکە دەستی کرد بە پالودە خواردن؛ وا دیاربوو کە قەتی نەخوارد بوو

هارونەڕەشید لێی پرسی: ئەوە چیە دەخۆی؟ گوتی: سوێند بەو خوایەی کە تۆی کردوە بە خەلیفە، نازانم چیە، بەڵام خوای گەورە لە قورئاندا دەڵێ: (وَفَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ) میوە و خورما لە لای ئێمە هەیە؛ لام وایە ئەوە ڕومانەیە، واتە هەنارە. ئەسمەعی گوتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان! ئێستا دوو کیسەت لەسەر واجبە؛ چونکە ئەو هەروەک نازانێ پالودە چیە ؛ نازان ڕومانیش چیە، هارونەڕەشید ئەمری کرد دوو کیسەیان دایە. ئەسمەعی و کابرای عەرەبیشی خەڵات کرد.

*****

کابرایەک بە(بالولی) گوت : بالوڵ ! شێتەکانی شاری (بەسرا)م بۆ حیساب کە؛ بالوڵ لە وەڵامدا گوتی: ئەوە بەکەس ناکرێ؛ چونکە ئەوەندە زۆرن لە حیساب نایەن. ئەگەر دەتەوێ عاقڵەکانت بۆ حیساب کەم؛ چونکە ئەوان لە چەند کەس زیاترنین.

*****

پیاوێک خەریک بوو نامەیەکی بۆ یەکێک لە دۆستە خۆشەویستەکانی دەنوسی؛ یەکێکی لە تەنیشت دانیشتبو؛ بە دزیەوە تیلەی چاوی دەدایە و نامەکەی دەخوێندەوە. خاوەن نامەکە زۆری پێ ناخۆش بوو؛ لە نامەکەدا نوسی: ئەگەر دزێکم لە تەنیشت دانەنیشتایە و نامەکەی نەخوێندایەوە هەموو نهێنییەکی خۆم بۆ دەنوسی. کابرای تەنیشتی گوتی، گەورەم بەخوا نامەی تۆم تەماشا نەکردووە و نەم خوێندۆتەوە خاوەن نامەکە گوتی: ئەی بێ عەقڵ! ئەی ئەوەی کە دەیڵێی لە کوێت زانی؟

*****

سەرخۆشێک لە ماڵ هاتەدەرەوە. لە ڕێگادا کەوت و ڕشایەوە و دەمولێوی خۆی پیسکرد؛ سەگێک هات دەمولێوی لستەوە؛ کابرا وایزانی ئینسانە پاکی دەکاتەوە؛ دەستی کرد بە دوعاکردن و گوتی: یاخوا خوای گەورە کوڕ و کوڕەزاکانت بکاتە خزمەتکارت، لەپاشان سەگەکە قاچی بەرز کردەوە و پێی هەڵمیزت؛ کابرا گوتی: ئەی ئافەرین گەورەم بۆ پیاوەتیت کە ئاوی گەرمت هێنا و دەم و چاوت پێ شتم.

*****

(جۆلا)یەک ئامانەتیەکی لە لای(مەلا)یەک دانا و پاش ماوەیەک جۆلا چوو وەریگریتەوە. لەوکاتەدا(مەلا) دەرسی بە فەقێکان دەگوت؛ جۆلا سڵاوی کرد و گوتی: قوربان ! هاتووم بۆ ئامانەتیەکە؛ مەلا گوتی: سەبر بگرە با لە دەرسەکە وەبم؛ جۆلا دانیشت. دەرسەکە زۆر درێژەی کێشا. مەلا کاتی دەرس گوتن عادەتی بوو، سەری دەجولاند. جۆلا وایزانی کە دەرس گوتنەوە هەر سەر جولانەوەیە؛

گوتی: مامۆستا زۆر بەپەلەم ؛ هەستە من بکە بە وەکیل تا دەچی بۆ ماڵ و ئامانەتییەکەم بۆ دێنی ئەمن لەباتی جەنابت دەرسەکەت دەڵێمەوە و سەر ڕادەوەشێنم. مەلا دەستی کرد بە پێکەنین و چوو ئامانەتییەکەی بۆ هێناوە.

*****

(کوێر)ێک لە شەوێکی تاریکدا چرایەکی بەدەستەوە بوو؛ گۆزەیەکی لە سەرشانی نابوو بە ڕێگادا دەڕۆیی. کابرایەک تووشی بوو گوتی: ئەی کوێری بێ عەقڵ ! خۆ شەو و ڕۆژ بەلای تووە وەک یەکە؛ ڕووناکی و تاریکی لەپێش چاوی تۆ فەرقیان نیە؛ ئەو چرایەت بۆ بەدەستەوە گرتووە؟ کوێرە پێکەنی و گوتی: کەرە؛ خۆ ئەو چرایەم لەبەر ئەوە هەڵنەگرتووە تا ڕێگای پێ ببینم؛ بەڵکو لەبەر خاتری بێ عەقڵێکی وەک تۆم هەڵگرتووە تا خۆم لێ نەدەی و گۆزەکەم لێ نەشکێنی.

*****

(عەمرو لەیس) تەماشای کرد لەشکرچییەک سواری ئەسپێکی زۆر لاواز بووە ؛ زۆری پێ ناخۆش بوو گوتی؛ لەعنەت لە لەشکرچیەکانی من؛ چونکە هەر پووڵ و پارەیەکی دامنێ قوزی ژنەکانیان پێ قەڵەو کرد و وەڵاغەکانیان لە برسان تواندنەوە. کابرا گوێ لێ بوو و گوتی: بەخوا ئەی ئەمیر! ئەگەر بە دیقەت تەماشای ئی ژنەکەی من بکەی لە کەفەڵی ئەسپەکەم لاوازترە. (عەمرو لەیس) بەو قسەیە زۆر پێکەنی و کابرای خەڵات کرد و گوتی: برۆ هەر دوو ماینەکانت قەڵەو بکە.

*****

زانایەکی ڕەنگ و ڕوو ناشیرین دەڵێ: ڕۆژێک لەگەڵ دۆستێک لە سەر ڕێگایەک ڕاوەستابووین و قسەمان دەکرد؛ ژنێک بەوێدا هات و لە ڕووبەڕووی ئێمە ڕاوەستا و تەماشای منی دەکرد؛ کاتێ تەماشا کردنەکەی لە ئەندازە تێپەڕی بە غولامەکەم گوت: بچۆ لەو ژنە بپرسە داخوا بۆ وا لەمن دەڕوانی و چ کارێکی هەیە. غولامەکە چوو بۆلای و هاتەوە و گوتی، دەڵێ:

چاوم گوناحێکی گەورەی کردبوو؛ دەمویست لە تۆڵەی ئەو گوناحەیدا سزای بدەم ؛ هیچ عەزابێکم لەوە باشتر نەدی کە بە تەماشاکردنی ئەو پیاوە ناشیرینە تۆڵەی لێ بکەمەوە.

*****

جاحیز) دەڵێی: قەت ئەوەندە خۆم بە خەجاڵەت نەدیوەکە ڕۆژێک ئافرەتێک هات و پیلی منی گرت و بردمی بۆلای پەیکەرتاشێک؛ زۆرم بەلاوە سەیربوو؛ لە وەستاکەم پرسی: ئەرێ ئەو ژنە بۆچی منی هێنا بۆلای تۆ؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەو ژنە بەمنی

گوتبوو کە وێنەیەکی لە سەر شکڵی شەیتان بۆ ساز بەم ؛ پێم گوت: من نازانم وێنەی شەیتان چۆنە؛ ئەویش تۆی هێنا و گوتی: وەک ئەو پیاوەیە.

*****

کابرایەکی ناشیرین چوو بۆلای دوکتۆر و گوتی: جەنابی دوکتۆر ! زۆر نارەحەتم. دومەڵێکم لە ناشیرینترین جێگا هاتووە؛ دوکتۆر تەماشای کابرای کرد و گوتی: درۆ دەکەی؛ ئەوە نیە دەموچاوت دەبینم کە هیچ دومەڵی پێوە نیە.

*****

کابرایەکی لووت زل چووبووە خوازبێنی ئافرەتێک و زۆری تەعریفی خۆی کرد و گوتی: من پیاوێکی سووک وبێ عەقڵ نیم و لە بەرامبەر ناخۆشی و نارەحەتیاندا زۆر خۆم ڕادەگرم . ژنەکە گوتی: ڕاست دەکەی؛ ئەگەر ئەوەندە خۆڕاگر نەبویتایە چل ساڵ نەتدەتوانی ئەو لووتە زلەت هەڵگری.

*****

(مەعاویە) و(عەقیلی) کوڕی (ئەبوتالیب) بەینیان زۆرخۆش بوو. ڕۆژێک پێکەوە دادەنیشن. مەعاویە دەڵێ، ئەی خەڵکینە! ئەو ئایەتەتان بیستووەکە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ: (تَبَّتْ يدا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ) ؟ گوتیان: بەڵێ. مەعاویە گوتی: دە ئەبولەهەب مامی ئەو (عەقیلە)یە. ئنجا عەقیل گوتی: ئەی ئەهلی شام ! ئەی ئەو ئایەتەتان بیستووەکە خوای گەورە هەر لەو سورەتەدا دەفەرمووێ: (وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ)؟ گوتیان: بەڵێ بیستومانە. (عەقیل) گوتی: دە ئەو ژنە پوری (مەعاویە)یە.

*****

(سەید)ێک لەگەڵ پیاوێک بە شەڕ هات و پەلاماری یەکتریاندا؛ سەیدەکە بە کابرای گوت: تۆ چۆن جنێو بەمن دەدەی؟ تۆ لە سەرت واجبە کە لە هەموو نوێژێکدا سڵاوەتم لە سەر لێ بدەی و بڵێی (اللهم صَلّ علیٰ محمّدٍ و علی آلِ محمّد). کابرا گوتی: ئاخر لەگەڵیدا دەڵێیم: (من الطیبین الطاهرین) و تۆ لەوان نی.

*****

یەکێک لە خەلیفەکانی بەغدا؛ کە ڕۆژێک عەرەبێکی دەشتەکی میوان بوو نانی لەگەڵ دەخوارد؛ لە وەختی پارو بردنی عەرەبەکە بۆ دەمی؛ خەلیفە گوتی: کاکە ! ئەو مووە لە پاروەکەت بکەوە ؛ عەرەبەکە توڕە بوو و گوتی: لە سەر سفرەی کەسێک کە ئەوەندە چاوی لە پاروەکانت بێ و مووی پێوە ببێنێ، نابێ نان بخۆی؛ دەستی لە خواردن هەڵگرت و سوێندی خوارد کە جارێکی دیکە قەت لە سەر سفرەی خەلیفە نان نەخوا و هەستا و ڕۆیی.

*****

کۆمەڵێک دانیشتبوون قسەی خۆشیان دەکردن؛ هاتنە سەر باسی پیاوەتی و ناپیاوی. یەکێک لە ناویاندا گوتی: کوڕە ئەوە دەڵێن چی؟ بەلای منەوە ئەوەی دوو چاوی کوێر و نابینابێ، ئەوە نیوە پیاوە و ئەوەی سواری کەشتی نەبووبێ و بە دەریادا نەگەڕابێ ئەوە نیوە پیاوە و ئەوەی ژنی جوانی لە ماڵەوە نەبێ ئەوە نیوە پیاوە.

کوێرێک لە ناویاندا بوو بە سەر کابرایدا نەڕاند و گوتی: ئەرێ برادەری ناعەزیز! خۆ تۆ هیچت بۆمن تێدا نەهێشتەوە؛ خۆ من لەو سێ یانە هیچکامیانم نیە؛ مەعنای وایە کە من بە نیوە مەردیش حیساب نیم.

*****

ڕۆژێک (باڵووڵ) چووە مەجلیسی هارونەڕەشید. یەکێک لە وەزیرەکان گوتی: ئەی باڵووڵ ! مـوژدە بێ لە تۆ کـە ئەمـیری مـوسـوڵمـانان تۆی کـردووە بە گـەورە و سەرداری مەیمون و بەرازان. باڵۆوڵ لە سەرەخۆ گوتی جا کەوایە لەورۆ بە دواوە هەرچی گوتم بە قسەم بکە و لە فەرمانی من دەرمەچۆ ؛ چونکە تۆ یەکێک دەبی لە ڕەعیەت و ژێردەستەکانم.

*****

گەدایەک چوو لە دەرگای ماڵێکی داو داوای شتێکی کرد؛ خاوەن ماڵەکە نەهاتە دەر و لە ژوورەوەڕا گوتی: کاکە ببورە خانم لە ماڵ نیە. سوالکەرەکە گوتی جاخۆ ئەمن پارەوە نانێکم دەوێ؛ خۆ نەهاتووم بەزۆری خانمێ بگێم.

*****

دە ڵێن: لە مامۆستای قوتابخانەیەکیان پرسی: تۆ گەورەتری یان براکەت؟ مامۆستا لە وەڵامدا گوتی: من گەورەترم ؛ بەڵام ئەگەر ساڵێکی دی بەسەر تەمەنیدا تێپەڕێ بەقەد منی لێدێ.

*****

نەخۆشێک لە گیانداندا بوو؛ کابرایەک بۆنی دەمی زۆر ناخۆش بوو، چوبووە بن سەری و دەمی دەبردە بن گوێی نەخۆشەکە و شادە و ئیمانی پێ دێنا و هەناسەی لە دم و گوێیانی دەکرد؛ هەرچەندە نەخۆشەکە ڕووی خۆی وەردەگێڕا ئەو زیاتر دەچووە پێشەوە و دەمی لێ نزیک دەکردەوە. کابرای نەخۆش کە تینی بۆ هات و زانی لێی دوور ناکەوێتەوە، پێی گوت: ئەرێ کاکە ! لێم دەگەڕێی کە بە پاک و خاوێنی بمرم؛ یان دەتەوێ زۆر بە پیسی بمرم ؛ دە لێم دوورەکەوە با بەدەری

خۆمەوە بمرم.

*****

بە پشتکۆمێکیان گوت : ئارەزوت ئەوەیە کە خواوەندی گەورە وەک خەڵکی دی پشتت ڕاست وەکا؛ یان پشتی خەڵکی دیش وەک پشتی تو کۆم وەکا؟ پشتکۆم لە وەڵامدا گوتی: ئارەزوم ئەوەیە، هەموان وەک من لێ بکا؛ تا بەو چاوەی کە ئەوان پێیان لە من دەڕوانی منیش بەو چاوە تەماشیان بکەمەوە.

*****

ژنێک لە دەست مێردەکەی چووە لای قازی شکایەتی کرد و گوتی: جەنابی قازی! ئەو پیاوە تاوێک لێم ناگەڕێ ئاسودە بم؛ بە دزی و ئاشکرا و لەکاتی نوێژ و وەختی هەویر شێلاندا ؛ لە وەختی نان کردندا و ئەو کاتەش کە بەڕۆژوم؛ هەر داوام لێ دەکا.

مێردەکەی گوتی: جەنابی قازی ! من ئەو ژنەم هەر بۆوەی هێناوە. ژنەکە گوتی: جەنابی قازی! تو لەبەر ڕەزای خوا شتێک دیاری بکە تا لە شەو و ڕۆژێکدا چەند جارم بێتەلا؛ تابزانم و خۆمی بۆ حازر بکەم. قازی گوتی: (دە) جار باشە ؟ ژنەکە گوتی تاقەتی ئەوەندەم نیە. قازی گوتی (نۆ) جار باشە ؟ ژنە گوتی ئەوەندەش ناتوانم. هەروەها پێداهاتنە خوارێ تا هاتنە سەر (پێنج ) جار. ژنەکە گوتی تاقەتی ئەوەندەشم نیە. قازی گوتی ئەی ماڵ نەوێران وادیارە ناتەوێ ئەو پیاوە هەژارە بەهەرەیەکی دەست کەوێ. ژنەکە گوتی، دەباشە جەنابی قازی لەبەر خاتری جەنابت بە (پێنج ) جارەکە ڕازیم. مێردەکەی گوتی: باشە، بەڵام جەنابی قازی ! پێی بڵێ با یەکێک بکا بە کەفیلی خۆی. ژنەکە گوتی: زۆرباشە با قازی کەفیلم بێ، خۆ لەو باشتر دەست ناکەوی. قازی تورە بوو و گوتی: قاحْبە دەتەوێ خۆت رزگار کەی و من تورش بکەی، هەستە لاچووە لەبەر چاوانم، لەعنەتی خوات لێ بێ.

*****

کابرایەک بەئارەزوی خۆی سەردەمی گەنجایەتی خۆی بردبووە سەر و تاقەت و توانای لێبڕابوو. کەنیزەکێکی کڕی و شەوێ وەختی نوستن دەباوەشی خۆی گرت و دەستی کرد بە ماچ کردن و خۆ پێوەنان و یاری لەگەڵ کردنی. هەرچەند کردی ئالەتەکەی یارمەتی نەدا. بە کەنیزەکەکەی گوت: تکات لێ دەکەم پیاوەتیم لەگەڵ بکە و دەستی یارمەتیم بۆ درێژ بکە و بە دڵ. دەستێکی پێدا بێنە با ئەو نوستووە وەخەبەر بێ و ئەو مردووە زیندو بێتەوە، چونکە هەودای خاو تا بەدەست بای نەدەی و گرژی نەکەی بە کونی سوژن و دەرزیدا ناڕوا. کەنیزەکەکە هەرچەند دەستی

پێداهێنا و ئەمدیو ئەودیوی پێکرد فائیدەی نەبوو. گوێیان لێ بوو بەدزی کابرا دەیگوت: ئالەتی پیاوی پیر ناگاتە مەنزل ، وەک لاشەی ولاغێکی کز وایە، ئەگەر بەزۆری دەستیش لە جێگای خۆی ڕاستی وەکەی، کە دەستت لێ بەردا دوبارە بەلادا دێتەوە.

*****

کابرایەک (دە) درەمی لە سەر (جاحیز) بوو، چوو لە لای قازی شکایەتی لێکرد و گوتی: جەنابی قازی (دە) درەمم لە سەریەتی و نامداتەوە. قازی گوتی: شاهیدت هەیە؟ کابرا گوتی: شاهیدم نیە. قازی گوتی باشە سوێندی دەدەم، کابرا گوتی: جەنابی قازی سوێندی چی دەدەی؛ ڕۆژێ هەزار سوێندان بە درۆ دەخوا باوەڕی پێناکەم (جاحیز) گوتی: جەنابی قازی، لە مزگەوتی گەڕەکەکەمان مەلایەکی زۆر لە خوا ترس و ڕاستگۆ و پیاوچاک هەیە، بانگی کە با ئەو لەباتی من سوێندی بۆ بخوا تا دڵی ئاسودە بێ.

*****

عەرەبێک وشترەکەی ون بوو، سوێندی خوارد و گوتی: ئەگەر وەیبینم بە درهەمێکی دەفرۆشم، بەلام کە وشترەکەی دیتەوە لە سوێندەکەی پەشیمان بۆوە و هات (زەنگولەیەکی) بە ملی وشترەکەی هەلاوەسی و جارپدا کێ ئەو وشترەم لێ دەکڕی، بە درهەمێک و زەنگولەکەی بە (سەت) درهەم، بەلام بە سەریەکەوە نەبێ نایاندەم. کابرایەک گوتی، ئەو وشترە چەندە هەرزان بوو، ئەگەر ئەو زەنگولەی لە ملدا نەبوایە.

*****

دوکتۆرێکیان دەدی کە هەرکاتێک بەلای گۆڕستانی شارەکەیاندا دەڕۆی پارچە قوماشێکی بەسەر چاوی خۆی دادەدا. ڕۆژێک لێیان پرسی: ئەرێ جەنابی دوکتۆر! ئەوە بۆ هەتا بەلای گۆڕستاندا دەڕۆی سەروچاوی خۆت دادەپۆشی؟ لە وەلامدا گوتی، ئاخر شەرم لە مردوەکانی ئەو گۆڕستانە دەکەم و زۆر شەرمەزاریانم، چونکە بەلای هەر کامێکیاندا دەچم، دەبینم زەبری منی وێ کەتووە و بە دەرمانی من مردووە.

*****

شێخی (جامی) دەڵێ: ڕۆژێک لە وەرزی بەهاردا لەگەڵ کۆمەلێک لە دۆستان بەهەوای گەشت و تەماشای سەحرا و دەشت لە شار چوینە دەرێ و لە جێیەکی زۆرخۆش و بە سەفا دانیشتین و سفرەمان ڕاخست نان بخۆین. سەگێک لە

دوورەوە چاوی لێ بوو. خۆی گەیاندە لامان، یەکێک لە هاوڕێکان بەردێکی هەڵگرت و وەک پاروە نان بۆ سەگەکەی هاویشت، سەگەکە پەلاماری دا و بۆنی پێوەکرد و بەپەلە بە ڕێگای خۆیدا گەڕایەوە، هەرچەند بانگمان کرد ئاوڕووی نەدایەوە، زۆرمان لا سەیر بوو. یەکێک لە دۆستان گوتی: کوڕینە! دەزانن ئەو سەگە چی گوت؟ گوتمان نازانین، گوتی: دڵێ: ئەو بەد بەختانە لەبەر بەخیلی و سەقیلی و ڕژدی خۆیان لەبرسان بەردان دەخۆن. جا چ چاوەڕوانێکم لە سفرەی ئەوان بێ.

*****

دەڵێن: بە کوڕێکیان گوت: پێتخۆشە باوکت بمرێ؟ لە وەڵامدا گوتی نا، بەڵام پێمخۆشە بیکوژن، تا هەروەک میراتەکەی دەگرم، خوێنیشی بستێنم.

*****

دەڵێن: ئافرەتێکی زۆر جوان بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت. پیاوێک چاوی پێکەوت و وەدوای کەوت، ژنە کە زانی وەدواوی کەوتووە، ئاوڕوی دایەوە و گوتی: کاکە! ئەوەی مێردەکەم لەگەڵمدا دەیکات، ئەوەت دەوێ؟ کابرا گوتی: بەڵێ! بەقوربانیشت دەبم، ژنەکە گوتی، دە لێرە دانیشە ئێستا مێردەکەم دێ، ئەوەی لەگە ڵ منی دەکا لەگەڵ تۆشی دەکات، غەمت نەبێ.

*****

شاعیرێک شیعرێکی بۆ زانایەک خوێندەوە و لە مەدحی شیعرەکەیدا گوتی: قوربان! ئەو شیعرەم لە سەر پێشاو داناوە، دەنا شیعری زۆر لەوە جوانتر دەڵێم. زاناکە پێکەنی و گوتی: ڕاست دەکەی، چونکە شیعرەکەت ئێستاش بۆنی سەر پێشاوی لێ دێ.

*****

(واعیزێک) لە سەر مینبەر شیعرێکی زۆر بێتامی خوێندەوە و لە مەدحیدا گوتی: ئەو شیعرەم لە نوێژێدا داناوە. شێخی (جامی) دەڵێ: بیستم کە یەکێک لە دانیشتوانی کۆڕەکە دەیگوت: ئەگەر شیعرێک لە نوێژدا گوترابێ و ئاوا بێتام و بێمەزە بێ، دەبێ نوێژەکە چ تام و مەزەیەکی بووبێ؟

**خوێنەری بەڕێز ! لێرەدا چەند حیکایات دەگێڕمەوە کە شێخی (جامی) لە (ڕەوزەی) هەشتدا لە بەهارستنەکەیدا لە زمانی بێ زمانانەوە دەیان گێڕێتەوە، کە زانایان و نوکتە زانان دایان ناون تا لەبەر ئەوەی کە سەرنج ڕاکێشن سودیان لێ وەرگرن.**

دەڵێ: (ڕێوی)ێک لەگەڵ (گورگ)ێک بوو بە هاوڕێ و لافی دۆستایەتی لێدەدا. ڕێوی و گورگ بەلای باغێکدا تێپەڕین، دەرگای باغەکە زۆر قایم بوو. دیوار و پەرژینەکەشی زۆر دڕکاوی بوو. بە هەر(چوار) دەوریدا گەڕان تا کەلێنێکیان دیتەوە. ڕێوی بەتاقی کردەوە و زانی کە خۆی زۆر بەئاسانی دەتوانی پێیدا بچێتە ژوور و بێتەوە دەر، بەلام بۆ گورگ زۆر تەنگە بەرە. مام ڕێوی زۆر بەئاسانی چووە ناو باغەکە، بەلام گورگ بەزەحمەت تێوە چوو. کاتێ چاویان بە ترێی جۆراوجۆر و میوەی ڕەنگاوڕەنگ کەوت، ڕێوی زۆر زیرەکانە بیری لە چوونە دەرەوە کردەوە و کەمی خوارد، بەلام گورگ هەتا توانی خواردی. لە ناکاو باغەوان پێی زانی و تێلایەکی بەدەستەوە گرت و بۆیان هات. ڕێوی چونکە کەمی خوارد بوو، بەئاسانی بە کەلێنەکەدا دەرچوو، بەلام گورگی ورگ زل ئەوەندەی خواردبوو لە کەلێنەکەوە نەچوو و تێگیرا و باغەوان گەیشتە سەری و ئەوەندەی لێ دا بە نەمر نەژی و بریندار ڕزگاری بوو.

*****

دەڵێ: (دوپشک)ێک زاری کوشندەی لە کلک دا و تیری خەیانەتی لە کەوانی خوو تەبیعەتی دابوو، نیازی سەفەری کرد و ڕۆیشت تا گەیشتە سەر ڕووبارێکی قووڵ و پان و بەرین. دوپشک بە دیتنی ئاوەکە داماو ڕەق ڕاوەستا. نە توانای هەبوو لە ئاوەکە وەپەڕێ، نە دەگەڕایەوە. (کیسەڵێک) لە دوورەوە چاوی لێ بوو، زانی دوپشک ناتوانێ لە ڕووبارەکە بپەڕێتەوە. بەزەیی پێداهات و لێی نزیک بووەوە و سواری پشتی خۆی کرد و چووە ناو ئاوەکە و کەوتە مەلە کردن و ویستی لە ئاوەکە بیپەڕێنێتەوە. کاتی مەلە کردن گوێی لە چزە و دەنگێک بوو، زانی کە دوپشک شتێکی دەپشتێ ڕۆ دەکا. ڕوی کردە دوپشکەکە و گوتی: ئەو دەنگە چیە؟ دوپشک وەلامی دایەوە و گوتی: ئەوە دەنگی پێوەدانی منە کە بە پشتی تووە دەدەم و هەرچەند دەزانم کار لە پشتی تۆ ناکا، بەلام ناتوانم دەست لە خووڕەوشتی خۆم هەلگرم. کیسەڵ لەبەر خۆیەوە گوتی، هیچ لەوە چاکتر نیە، کە ئەو بەدخووە لە کۆڵ ئەو خووڕەوشتەی بکەمەوە و چاکان لە دەست پێوەدانی ئەو بێ ئەخلاقە ڕزگار بکەم. خۆی بن ئاو کرد و دوپشک ئاو بردی و کەس نەیزانی چی لێهات.

*****

دەڵێ: (مشک)ێک ماوەی چەند ساڵێک لە دوکانی بە قاڵێکدا بوو. تێرو پڕی لە نوقڵ و دانەوێڵە و میوەی تەڕ و وشکی دوکانەکەی دەخوارد و بە ئارەزوی خۆی ڕای دەبوارد. کابرای بەقالیش دەیزانی، بەلام چاوپۆشی لێ دەکرد و گوێی نەدەدایە

تارۆژێک هەروەک پێشینیان گوتویانە: سپڵەی پێنەزان کە سگی تێر بوو ناترسی و لە هەزار شەڕ و خەراپە ناسڵەمیتەوە. مشکی سپڵەش تەماعی دە هەمبانەی پارەی کابرای بەقاڵ کرد و چوو هەمبانەکەی کون کرد و هەر پووڵ و پارەیەکی تێیدابوو، بردی و چوو لە کونەکەی خۆیدا شاردیەوە.

ڕۆژێک کابرا پێویستی بە پارە هەبوو، دەستی دە هەمبانە ڕۆکرد، پارە بێنیتە دەرێ، بەڵام هیچی تێدا نەمابوو، دەتگوت کیسەی موفلیسانە و سگی لە برسان مردووان. کە تەماشای کرد کون کراوە، زانی ئەوە کاری مشکەکەیە، وەک پشیلە خۆی بۆ مەڵۆسدا و مشکەکەی گرت و هەودا دەزوێکی دەلاقی خست و بۆی شل کرد تاچووە ناو کونەکەیەوە. کابرای بەقاڵ بە ئەندازەی درێژی پەتەکە زانی قووڵ و درێژی کونەکە چەندە وماڵی مشکەکە لە کوێ یە. بەدوا پەتەکەدا هەڵیکەند و وەدوای کەوت تاچووە سەر ژوور و هێلانەکەی. کە تەماشای کرد، دەتگوت دوکانی پارە گۆڕینەوەدیە، زەرد و سور بەسەریەکدا ڕژاوە و دینار و درهەم تێکەڵاو کراوە. پارەکەی خۆی هەلگرتەوە و مشکی هێنایە دەرەوە و خستی یە بەر چنگی پشیلەیەکەوە، تا بە سزای خۆی بگەیەنێ و تۆڵەی خراپەی خۆی ببینێ.

*****

دەڵێ: (ڕێوی)ێک ڕاوەستابوو، بەچاوی سەرنجدانەوە دەیڕوانییە لای ڕاست و چەپی خۆی. تەماشای کرد لە دووردوە تارماییەکی ڕەش وددەر کەوت. کە نزیک بۆوە. دیتی (گورگ)ێکی درندە و (سەگ)ێکی گەورە وەک دو دۆست و هاوڕێی ڕاستەقینەی گیان گیانی پێکەوە دێن، نە گورگ بیر لەوە دەکاتەوە سەگ خیانەتی پێ بکا و نە سەگ بەخەیاڵیدا دێ گورگ تووشی موسیبەتێکی بکا. ڕێوی بەپیلیانەوە چوو، سڵاوی لێکردن و وەزیفەی ئیحتیرامی بەجێهێنا و گوتی: حەمد بۆ خوا کە ڕقی کۆنتان بەخۆشەویستی تازە گۆڕیوەتەوە و دوژمنایەتی قەدیمتان وەلا ناوە و بوونە دۆست. زۆرم پێخۆشە بزانم کە سەبەب و هۆی ئەو دۆستایەتیەتان چیە و کێ بوو بەهۆی ئەو نیعەتە پاکەتان؟ سەگ گوتی، سەبەب و هۆی دۆستایەتی ئێمە شوانە؛

چونکە ئێستا شوان دوژمنی هەردوکمانە. گوتی: دوژمنایەتی گورگ و (شوان) پێویستی بە باسی ئێمە نیە، چونکە هەموو کەس دەزانی ئەو دوانە لە قەدیمەوە دوژمنی یەکترن. هۆی دوژمنایەتی منیش ئەوە بوو، دوێنێ ئەو گورگەی کە ئەمڕۆ بووەتە ڕەفیق و هاوڕێم، پەلاماری مێگەلەکەی ئێمەی دا و مەڕێکی فڕاند. منیش هەروەک عادەتی هەمیشەیی خۆم بووە، دوای کەوتم تا مەڕەکەی لێ وەستێنم: بەڵام

نەیگەیشتمێ، کاتێ گەڕامەوە، شوانەکە دارێکی لێ بەدەستەوە گرتم و لە خۆڕا دەستی کرد بە لێدانم. منیش لەداخان پەیوەندیم لەگەڵ بڕی و هاتم بوومە دۆستی کۆنە دوژمنی شوانەکە.

*****

دەڵێ: بە (ڕێوی)یێکیان گوت: دەتوانی هەواڵێک بۆ (سەگە)کانێ ئاوایی بەری و لە پاداشتیدا (سەت) دینار وەرگری؟ ڕێوی لە وەڵامدا گوتی: بەخوا کرێیەکی زۆرە، بەڵام خەتەری گیانی زۆری تێدایە.

*****

دەڵێ: (وشتر)یێک لە دەشتێک دەلەوەڕا و لە دڕک و داڵی ئەو دەشتە خۆی تێر دەکرد. ڕۆژێک ڕۆیی تا گەیشتە بن دار موغەیلانێک، لەق و پۆی دارەکە وەک زولفی لاوان لێک هاڵا بوون و وەک ڕووی مەحبوبان تازە و گەش بوون. وشتر گەردنی تەماعی بەرز کردەوە تا لەزەت لە خواردنی گەڵا و چرۆیەکەی بەرێ. تەماشای کرد ئەوا (مار)یێک لە ناو لقەکانیدا پاپۆکەی بەستووە و سەری وەکلکی ناوە، وشترەکە گەڕایەوە و دەستی لە ئارەزوی خواردنی هەڵگرت. دارموغەیلانە کە وەی زانی لەبەر تیژی سەرە دڕکەکانی وی و بریندار بوونی دەمی دەستی لە خواردن هەڵگرت. وشترەکە کە زانی دارموغەیلانە کە وا حاڵی بووە، گەڕایەوە و گوتی ئەی دارموغەیلان! ترسی من لەبەر میوانە نهێنییەکەیە، نەک لەبەر خاوەن سفرەکە. لە ژاری ددانی مارەکە دەترسم، نەک لە برینی پەیکانی دڕکەکانی تۆ. خۆ ئەگەر لەترسی میوانەکە نەبوایە خاوەن ماڵم بە لووقمەیەک دەخوارد.

*****

دەڵێ: (سەگ)یێک لە هەموو خواردنێک بێبەش بوو. زۆری برسی بوو. لە دەروازەی شار وەستابوو، تەماشای کرد با نانێکی هەڵگرتووە و هێنای بۆ دەری شار و ڕوی کردە دەشت و سەحرا. سەگ بەپەلە وەدوای کەوت و بانگی کرد و گوتی: ئەی توانای بەدەن و قووتی گیان و ئارەزووی دڵ و ئارامی گیان، نیازی کوێت هەیە و ڕوو دەکەیە دەکەی؟ لە وەڵامدا گوتی: لەو دەشت و بیابانەدا لەگەڵ کۆمەڵێک لە گەورەکانی (گورگ) و (پڵینگ) ئاشنایەتیم هەیە و ئیحرامی زیارەتی ئەوانم بە ستووە. سەگەکە گوتی: ئەی نان! بەوانەم مەترسێنە، ئەگەر بچیتە ناو دەمی نەهەنگەوە، یان بچیە قووڕگی شێرەوە دەستت لێ هەڵناگرم هەر بە دواتەوەم. وەدوای کەوت تا گرتی و خواردی.

*****

دەڵێ: بە (کۆتر)ێکیان گوت: ئەوە بۆ لە دوو بەچکە زیاتر پێناگەیێنی و وەک مریشکی ماڵێ جوجیلەی زۆر هەڵناهێنی؟ لە وەڵامدا گوتی: ئاخر بەچکە کۆتر خواردن لە دەمی باوک و دایکیان وەردەگرن، بەڵام جوچکەی مریشک لە سەرگوێلک خواردن هەڵدەگریتەوە و دەیخوا. قورگ و جیکەڵدانە هەر دەتوانی خواردنی دوو بەچکە بدا، بەڵام هەزار جوچکە دەتوانن لە سەرگوێلکێک خۆیان تێر بکەن. گوتی: جا ئەوەیە هۆی جیاوازیمان.

*****

دەڵێ: (چوێلەکە پاسارییەک) هێلانە میراتییەکەی لە کەلێنی هێلانەی (لەکلەک)ێکدا ئاوەدان کردەوە. پێیان گوت: تۆ چ موناسەبەیەکت هەیە بەو بەدەنە بچوکەوە لەگەڵ ئەو گیاندارە گەورە ببیە دراوسێ و خۆت لەگەڵ وی بەهاومەنزڵ و هاوپایە بزانی؟ لە وەڵامدا گوتی: منیش ئەوە دەزانم، بەڵام ناتوانم بە زانیاری خۆم عەمەل بکەم، چونکە من دراوسێی (مار)ێکم، هەموو ساڵێک کە جوچکەم هەڵێنان و بەخوێنی دڵ پەروەردەم کردن لە ناکاو دێ پەلاماری ماڵەکەم دەدا و بەچکەکانم دەکاتە ڕزق و ڕۆزی خۆی. ئەو ساڵ لە دەست وی ڕامکردووە و پەنام بۆ داوێنی ئەو گەورە هێناوە و دەستم بەداوێنی گرتووە، ئومێدەوارم کە دادی من لەو بستێنی و تۆڵەی چەند ساڵەی منی لێ بکاتەوە.

هەروەک هەموو ساڵێک بەچکەکانی منی دەخوارد، ئەمساڵ ئەو بکاتەڕزق و ڕۆزی خۆی و بیخواو لە کۆڵ شەڕی ئەوم بکاتەوە، چونکە گوتویانە: ئەگەر ڕێوی لە بیشەی شێردا بێ لە دەست گورگان ڕزگاری دەبێ و ئەوەی لەژێر سایەی گەوراندا بێ لە زوڵمی ناکەسان ئەمین دەبێ.

*****

دەڵێ: لە (سەگ)یان پرسی: هۆی چیە تۆ لە هەر ماڵێکدا بی، سواڵکەر و گەدا بە دەورەی ئەو ماڵەدا نایەن و لەبەر دەرگای هەر ماڵێک بخەوی، ڕووی تێناکەن؟ سەگ لە وەڵامدا گوتی، لەبەر ئەوە نیە کە من سەگم و لێم دەترسن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە، کە من لە حیرس و تەماع دوورم و بەبێ تەماعی و قەناعەت و خۆڕاگری ناسراوم و لە سفرەیەکی ڕازاوەی پڕ لە ئەنواعی

خواردەمەنی، بە لەتە (نانێک) قەناعەت دەکەم و لە لاشەی مەڕێکی بوریانی و برژاو بە ئێسقانە کرو زاوەکان دڵخۆش و ڕازیم، بەڵام گەدا و سواڵکەر پابەندی حیرس و تەماعن. دەڵێن: برسیمانە، بەڵام ئەگەر تەماشای هەمبانەی کۆڵیان بکەی، نانی حەوتوێکی تێدایە، بە زمان داوای نان و پێخۆری شەوێ دەکەن، کەچی

خواردنی ده ڕۆژیان له پشته و عەسای گەداییان له مشته. جا ئەوەیه هۆی دووری ئەوان له من، چونکه قەناعەت له تەماع دووره و قانیع دووری و نەفرەت دەکا له تەماعکار.

*****

دەڵێ: بەچکە(ڕێوی)یەک به دایکی گوت: دایه! فێڵێکم فێر بکه تا ئەگەر چوومه دەرێ و تووشی (سەگ) بووم، خۆم ڕزگار بکەم. دایکی گوتی: ڕۆڵه! فێڵ زۆرن، بەڵام له هەموو فێڵێک باشتر ئەوەیه که له ماڵی خۆت دانیشی، نه سەگ بت بینی و نه بیبینی.

*****

دەڵێ: (ژمنگه سووره)یەک تینی بۆ مێشه هەنگوینەیەک هێنا و ویستی بیگری. مێشه هەنگوینەکه دەستی کرد به گریان و گوتی: ئاخر لەگەڵ ئەوەدا که من ئەو هەمووه شەهد و هەنگوینەم هەیه بۆ ئەو ناخۆی؟ ئەمن چ قەدر و نرخێکم هەیه تا دەست لەو هەڵگری و ڕو بکەیته خواردنی من. (ژمنگه سووره) گوتی: ئاخر ئەگەر ئەو شەهد و شیرینه، ئەتۆ کان و کارخانەکەی ئەوی و ئەگەر ئەو هەنگوینه، ئەتۆ سەرچاوەکەی وی، بۆیه دەتخۆم.

*****

دەڵێ: (مێروێک)یان دی خۆی ئازا کردبوو، (کولله)یەکی ده ئەوەندەی خۆی ڕادەکێشا. به سەرسوڕمانەوه گوتیان: تەماشا ئەو مێروه بکەن بەو جەسته بچوکەی چۆن ئەو باره گرانەی هەڵگرتووه. مێروەکه گوێی لەو قسه بوو، پێکەنی و گوتی: خەڵکینه! پیاوی مەرد و ئازا بەهێزی هیممەت و بازووی مەردایەتی باری گران دەخاته سەرشانی خۆی و هەڵی دەگری، نەک به جەسته و بەدەنی قەڵەو و قالب ولاشەی.

*****

دەڵێن: (وشتر)ێک ئاوسارەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا و له دەشت و سەحرادا دەلەوەڕا. (مشک)ێک تووشی بوو، تەماشای کرد خاوەنی لەگەڵ نیه و بێساحەبه، تەماعی تێکرد. ئاوسارەکەی گرت و بەرەو ماڵی خۆی برد. وشتر که خوای گەوره خوورەوشتێکی وای داوەتێ به قسەی هەموو کەس بکا، وەدوای کەوت تا گەیشتنه بەردەمی کونه مشکەکە. وشتر تەماشای کرد کونەکه زۆر تەنگه و گوتی: ئەی مشکی بێ عەقڵ ئەوه چیت کرد؟ ماڵی تۆ چوکەڵەیه و من بەو زلییه، کوجا مەرحەبا؟ خۆ ماڵەکەی تۆ لەوه زلتر نابێ و منیش لەوه چوکتر نابمەوه. جا چۆن

دەبینە هاوڕێ و پێکەوە ئیدارە دەکەین؟

*****

دەڵێن: (گـا)یەک گـەورەی گـاگـەلێک بوو. لە نـاو گـایاندا بەتاقـەت و بە قـووەت ناوبانگی کردبوو، هەرکاتێ (گورگ) پەلاماری بدانایە ئەو بەهێزی خۆی لێی دوور دەخستنەوە. لە ناکاو بەڵای ناگەهان تووشی کارە ساتێک بوو، تواناکەی زەرەدی پێگەیشت. لە پاش ئەو بەسەرهاتە کە چاوی بە گورگ دەکەوت خۆی لە پەنای گایەکاندا دەشاردەوە.

ڕۆژێک لێیان پرسی: خۆ تۆ جاران وا نەبووی، بۆ ئێستا کە چاوت بە (گورگ) دەکەوی خۆت دەشاریەوە؟ لە وەڵامدا گوتی: لەو ڕۆژەوە کە لە هێزی خۆم جیا بوومەوە، ئازایەتیم سارد بۆتەوە. هەروەک دەڵێن لە ڕۆژی شەڕدا زەربە لە حەربەیە و دەعوا لە مەردە.

*****

دەڵێن: (وشتر)ێک و (گوێدرێژ)ێک پێکەوە دەڕۆیشتن. گەیشتنە سەر جۆگە ئاوێکی گەورە و لە پێشدا وشتر چووە ناوی و کاتێ گەیشتە ناوە ڕاستێ، ئاوەکە گەیشتە بەرسگی. بانگی کەرەکەی کرد و گوتی: وەرە وەپەڕە، ئاوەکە هەر هەتا بەرسینگ دێ. کەرەکە گوتی: ڕاست دەکەی، بەڵام سینگ تا سینگ فەرقی هەیە. ئاوێک کە لە زگی تۆ نزیک بێ بەبێ شک وەسەر پشتی من دەکەوی.

*****

دە لێ: (تاوس)ێک و (قەلەڕەشکە)یەک لە ناو باغێکدا تووشی یەک بوون و عەیب و هونەری یەکتریان دی. تاوس بە قەلەکەی گوت: ئەو چەکمە سورەی کە لە پێی تۆ دایە، لایقی ئەو پەڕە ئەتلەسە زێڕ کفتە ڕەنگاوڕەنگانەی منە و وادیارە ئەوکاتەی لە تاریکە شەوی نەبوونێدا هاتوینە ڕۆژی ڕووناکی وجوود بونەوە، لە لەبەرکردنی ئەو چەکمانەدا بەسەهو چوین و لێمان تێکچوە. من چەکمە ڕەشەکەی تۆم لەپێ کردووە و تۆ چەکمە سورەکەی من. قەل گوتی: نەخەیر وا نیە. بەپێچەوانەی ئەوە وەیە، ئەگەر بەسەهو چووبین لە دەبەرکردنی بەرگ و لیباسەکەماندا لێمان گۆڕاوە، چونکە تەواوی بەرک و پۆشاکەکەی تۆ موناسبی دوو چەکمە سورەکەی منە. وادیارە کاتی هەستان لە خەوی عەدەم، تۆ بەرگی منت لەبەر کردووە و منیش سەرم لە بەرۆک و ئێخە کراسی تۆ داهێناوەتە دەر. لە نزیک تاوس و قەلەکە کیسەڵێک سەری بەردابۆوە و کەوتبووە بیرکردنەوە و گوێی لەو گفتوگۆیانە بوو، سەری بەرز کردەوە و گوتی: ئەی هاوڕێیانی عەزیز و دۆستانی خاوەن تەمیز! دەست لەو

گفتوگۆیە بێ مەعنایە هەڵگرن. خوای گەورە هەموو شتێکی نەداوە بەیەک کەس و جڵەوی هەموو ئاواتێکی نەداوەتە دەست کەس، بەڵام هیچ کەس نیە کە خوا خاسیەتێکی نەدابێتێ، دەبێ هەرکەس بەبەشی خۆی ڕازی و دڵخۆش بێ و حەسودوی بە خەڵکەوە نەبا.

*****

دەڵێ: (ڕێوی)ێک بەدەست (کەمتیار)ێکەوە گرفتار بوو. ددانی تەماعی لێ تیژ کرد و قەستی خواردنی کرد. ڕێوی هاواری لێ بەرز بووە و گوتی: ئەی شێری بیشەی ئازایەتی و ئەی پڵنگی قەڵاتی سەربڵندی، بەزەییت بە بێدەسەڵاتی مندا بێتەوە و دەستم لێ بەردە. خۆ من هەرمستە کولک و ئێسقانێکم، تۆ لە خواردنی من چت پێدەبڕێ؟ هەرچەند لەو بابەتە ڕستی فایدەی نەبوو. ئینجا ڕێوی گوتی: ئاخرمن حەقێکم لە سەرتۆیە، وەبیر خۆتی بێنەوە، لەبیرتە داوات لێکردم بتگێم و بەقسەم کردی و چەند جارت سوار بووم. کەمتیار، کە ئەو قسەی لە ڕێوی بیست، توڕە بوو، غیرەتی جوڵا و لەپڕ دەمی کردەوە و گوتی: ئەو قسە بێ مەعنایانە چین دەیانکەی؟ کەی و لە کوێ شتی وا ڕووی داوە، کەمتیار بەهۆی گوتنی ئەو قسانەوە دەمی لە ڕێوی کردەوە بۆ قسەکان. ڕێوی هەلی بۆ ڕەخسا و ڕایکرد و بەو فێڵە خۆی ڕزگار کرد.

*****

دەڵێ: یەکێک لە زانایان دەڵێ: (چل) دەفتەرم لە حیکمەتدا نوسی، سودم لێوەرنەگرت. هاتم چل کەلیمەم لێ هەڵبژارد و لەوانیشم بەهرەیەک دەست نەکەوت. لە ناو ئەوانیشدا چوارم لێ هەڵبژاردن. ئەوەی دەمویست لەو چوار کەلیمەدابوو. یەکەمیان ئەوەیە، کە دەڵێ: وەک پیاوان پشت بە ژنان مەبەستە، چونکە ژن با لە ڕیزی باوەڕ پێکراوانیشدا بێ، وەک وان نابێ و جێگای باوەڕ پێکردن نیە. دووەم ئەوەیە، قەت بە ماڵی دنیا لەخۆت بایی مەبە، با زۆریشت هەبێ، چونکە عاقیبەت بەهۆی ڕووداوی ڕۆژگارەوە لە ناو دەچی. سێیەم ئەوەیە ئەسرار و نهێنی خۆت لا لای هیچ دۆستێک باس مەکە، چونکە زۆر جاران ڕوو دەدا دۆستایەتی دەبێتە دوژمنایەتی و نهێنیەکانت ئاشکرا دەکا. چوارەم دەڵێ: خەریکی فێربوونی عیلم زانیارییەک بە، کە پێویست و زەروری بێ و بۆ دین و دنیات بەکەڵک بێ.

*****

(ئیبنو موقەفەع) دەڵێ: کتێبخانەی حوکەمای هیندستان باری (سەد) وشتر بو. مەلیکی هیند داوای کرد کورتیان بکەنەوە، کردیانن بە باری (دو) وشترو لە کۆتای

دا لە چوار کەلیمەدا خولاسەیان کردنەوە. کەلیمەی یەکەم لە دادگەری و عەدالەتی پاشایاندا. چونکە ئەگەر پاشا دادگەر و عادڵ بوو، ولات پڕ دەبێ لە ئەمن و ئاسایش. کەلیمەی دووەم لە ئامۆژگاری خەڵکدا بەکردەوەی چاک و دووری لە خەراپە و لانەدان لە یاسادا بوو، چونکە گوتراوە تۆوی زوڵم کردنی ئەمیری وەخت لە بەڕێوە نەبردنی یاسایە لە لایە ن خەڵکەوە و دیارە کە تۆ (جۆ) بچێنی گەنم نادرویتەوە. کەلیمەی سێیەم بریتی بوو لە ئاگاداری سیحەتی لەش و دەڵێ: تا برسیتان نەبێ دەست بۆ خواردن مەبەن، کە خواردیشتان لەپێش ئەوەدا تێر بن دەست لە خواردن هەڵگرن. کەلیمەی چوارەم باسی حەیا و حورمەتی ژنان دەکات و دەڵێ، دەبێ تا دەتوانن خۆیان لە پیاوی خەراپ و نامەحرەم بپارێزن. تا ئێرە چەند حیکایەتی شێخی جامی بوون.

*****

شێخ ئەبو سەعیدی (مەیهەنە) لەگەڵ پیاوێکی پیر دەچن بۆ حەمام. حەمامەکە زۆر گەرم و خۆش دەبێ. کابرا دەڵێ: یا شێخ، دەزانی حەمامێکی زۆر خۆشە. شێخ لە وەڵامدا دەفەرمووێ: بەڵێ خۆشە، بەلام دەزانی بۆچی خۆشە؟ کابرا دەڵێ: لەبەر ئەوە خۆشە کە جەنابت لە حەمامی. شێخ دەڵێ، مادام باسی منت کرد، با پێت بڵێم: کە لەبەر بوونی من نیە کە خۆشە، بەڵکو لەبەر ئەوە خۆشە کە (سەتڵ)ێک و(خاولی)یەک نەبێ هیچمان پێنیەو ئەوانیش هی خۆمان نین. وەک ئەوە دەچێ تازە لە دایک بووبین و ڕوتیان کردبینەوە بۆ سەر تاتەشۆر.

*****

دەڵێن: چوار کەلیمە، چوار پاشا گوتویانن: کە وەک تیرێک دەچن لە چوار کەوانەوە هاوێژابن. (کیسرا) گوتویەتی: قەت لەوەی کە نەمگوتووە پەشیمان نەبوومەوە، بەلام زۆرجار بەهۆی گوفتەی خۆمەوە لە خاک و خوێندا نوستوم لە داخان.

(قەیسەر) گوتویەتی: توانا و دەسەلاتم بە سەر ئەو قسانەدا زۆرترە کە نەمگوتوون لەو قسانەی کە تا ئێستا گوتومن. ئەوەی نەمگوتووە دەتوانم بیانڵێم، بەلام ئەوەی گوتومە، ناتوانم وەی شارم.

(خاقانی چین) لەو بابەتەوە گوتویەتی: زۆرجار ڕوو دەدات، کە نارەحەتی گوتن ناخۆشترە لە پەشیمانی نەگوتن.

(مەلیکی) هیندیش دەڵێ: هەر وشەیەکی لە زمان هاتەدەر دەسەلاتم بە سەریدا نەما، بەلام ئەوەی نەمگوتووە خۆم خاوەنیم و ئارەزوم لێ بێ دەیڵێم و ئارەزوم لێ

نەبێ نایڵێم.

*****

لە مەجلیسی (کیسرا)دا سێ زانا کۆبونەوە. (فەیلەسوفی) ڕۆم، (حەکیمی) هیند و (بوزورجومیهری) ئێران. لە قسانداهاتنە سەر ئەو باسە کە سەخت ترین و ناخۆشترین شت چیە؟

(فەیلەسوفی) ڕۆمی گوتی: پیری و سستی دەگەڵ بێدەسەڵاتی و نەداری.

(حەکیمی) هیندی گوتی: لەشی نەخۆش و ناساغ لەگەڵ غەم و خەفەتی زۆر.

(بوزورجومیهری) ئێرانی گوتی: نزیک بوونەوەی ئەجەل لەگەڵ دوری لە حوسنی عەمەل. لە کۆتایدا هەموویان هاتنە سەر قسەکەی (بوزورجومیهر). *****

لە(حەکیم)ێکیان پرسی: ئینسان کەی دەست بکا بەخواردن باشە؟ لە وەڵامدا گوتی: دەوڵەمەند هەرکاتێ برسی بوو، فەقیریش هەرکاتێ خواردنی دەست کەوت.

*****

دەڵێن: (پێنج) شت لە دنیادان، ئەوەی ئەو پێنجانە دەزانێ، جڵەوی ژیانی خۆشی دراوەتێ. یەکەم لەش ساغی. دووەم ئەمن و ئاسایش. سێیەم بژیوی زۆر. چوارەم هاوڕێی میهرەبان و دڵسۆز. پێنجەم فەراغەت و ئاسودەیی. ئەوەی لەوانە بێبەش بوو دەرگای ژیانی خۆشی لە سەر پێوە دەدرێ.

*****

بە(حەجاجی سەقەف)یان گوت: لە خوا بترسە و زوڵم لە موسوڵمانان مەکە. لە وەڵامدا هەستا چۆوە سەر مینبەر و گوتی: خواوەندی گەورە منی بەسەر ئێوەدا زاڵ کردووە، ئەگەر منیش بمرم ئێوە بەهۆی کردەوەی خۆتانەوە لە دەست زوڵم ڕزگار نابن. دوای مردنم، خوای گەورە بەندەی لە منی خەراپتر هەیە بیکاتە گەورە بە سەرتانەوە.

*****

دەڵێن: (مەئمون) غولامێکی بوو، کار و پیشەی حازر کردنی ئاوی دەستنوێژی مەئمون بوو. لەنێوان هەر دوو سێ ڕۆژێکدا ئافتاوەیەک ون دەبوو. مەئمون پێی زانی، ڕۆژێک غولامەکەی ئافتاوەی بە دەستەوە بوو، ئاوی بەدەستی مەئمون دادەکرد، مەئمون گوتی: خۆزگە ئەو ئافتاوانەی لێمان دەدزی بەخۆمانی بفرۆشیەوە. غولامەکە گوتی: قوربان! ئەوجار وادەکەم و ئێستاش ئەو ئافتاوەم لێ بکڕە. مەئمون گوتی: بەچەندەی دەفرۆشی؟ گوتی بە دوو دینار. ئەمری کرد دوو دیناریان دایە، ئینجا گوتی خۆ ئیتر ئەوە لەدەست تۆدا لە ئەمان دایە و چیتر

نادزرێ ؟ گوتی: بەڵێ.

*****

(حەجاج) کاتێ ڕاو لە لەشکرچیەکانی هەڵبڕا و تووشی عەرەبێک بوو، کە خۆی دەدۆزی و وشتر لە دەورەی دەلەوەڕان. وشترەکان کە چاویان بە حەجاج کەوت سڵەمینەوە، عەرەبەکە سەری بەرز کردەوە و بە تورەیییەوە گوتی: ئەوە کێ یە لەو چۆڵ و بیابانەدا بەو بەرگ و لیباسە جوانە دەخولێتەوە، لەعنەتی خوای لێ بێ. حەجاج دەنگی نەکرد، هاتە پێشەوە و سڵاوی لێکرد و گوتی: (سەلامو عەلەیکە) یا ئەعرابی! کابرای عەرەب گوتی، لا عەلەیکە سەلام و لارەحمەتو للّەهی ولابەرەکاتە. حەجاج داوای ئاوی لێکرد. کابرا گوتی، دابەزە ئاو وەخۆوە، بەخوا من نۆکەری کەس نیم. حەجاج دابەزی و ئاوی خواردەوە و لەپاشان گوتی: ئەی کاکی عەرەب ! باشترین ئینسان کێ یە؟ گوتی: ڕەسوڵی خوایە بە کوێرایی چاوی تۆ. دووبارە حەجاج گوتی: سەبارەت بە(عەلی) کوڕی (ئەبوتالیب) دەڵێی چی؟ گوتی، ئەوەندە گەورەیە بە دەمدا نایە. حەجاج گوتی، ئەی سەبارەت بە (عەبدولەلیکی) کوڕی (مەروان) دەڵێی چی؟ دەنگی نەکرد. حەجاج گوتی، وەڵامم بدەوە ئەی ئەعرابی! گوتی، پیاوێکی زۆرخەراپە. حەجاج پرسی بۆ خەراپە؟ گوتی، چونکە خەتایەکی گەورەی کردووە کە ئەو فاسقە بێ ئەخلاقەی کە ناوی حەجاجە لە سەر موسوڵمانانی کردووە بە گەورە، خەتایەکە لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوای پڕکردوە. حەجاج دە نگی نەکرد. لە نکاو باڵندەیەک هەڵفڕی و دەنگێکی لێوەهات. کابرا ڕووی کردە حەجاج و گوتی، تۆ کێیی؟ حەجاج گوتی، بۆ دەپرسی؟ گوتی، ئەو باڵندە ئاگاداری کردمەوە کە ئێستا لەشکرێک دەگاتە ئێرە و گەورەکەیان تۆی.

لەو قسانەدا بوون لەشکرچیەکان گەیشتنە وێ و سڵاویان لە حەجاج کرد. عەرەب کە ئەوەی دی ڕەنگی پەڕی. حەجاج ئەمری کرد لەگەڵ خۆیاندا هێنایان بۆ بەغدا. ڕۆژی دوایی کاتی نان خواردن کە سفرە ڕاخرا، عەرەبەکەیان بانگ کرد. کە هات گوتی، (سەلامون عەلەیکە ئەی ئەمیر وَ رحمةُاللّه و برکاتُه).

حەجاج گوتی: من وەک تۆ کە بەمنت گوت ناڵێم، وعلیک السلام. لە پاشان حەجاج گوتی، نان دەخۆی؟ گوتی، نانی تۆیە، ئەگەر ئیجازە بدەی دەخۆم. گوتی، ئیجازەم دای. کابرا هاتە پێشەوە و دەستی درێژ کرد و گوتی: (بسمِ اللّه، ئینشااللّه) ئەوەی لە دوا خواردنەکە دێ خێر دەبێ. حەجاج پێکەنی و گوتی، دەزانی دوێنێ ئەمن چیم بەسەر هات ؟ عەرەبەکە گوتی: خوا ئەمیر ڕاوەستاو بکات، نهێنیی دوێنێ لە نێوان من و تۆدا بوو، ئەمڕۆ هەوڵ مەدە ئاشکرای بکەی.

لەپاشـان حەجـاج گوتـی، ئەی ئەعرابی! دەبێ یەکێ لەو دوو شتـە و لەو دوو کـارە ئیـختـیـار بکەی، یان لە لای من وەمـێنی تا بتکەمە پیـاوی خۆم، یان دەتبـەمە لای (عـبـدولەلـیک) و ئەوەی دوێنێ پێت گـوت، بۆی دەگـێـڕمـەوە تا ئەوەی ئارەزوی بوو لەگەڵت دا بکا. عەرەبەکە گوتی: شتێکی دیکەش دەکرێ، حەجاج گوتی، چیدی؟ گوتی، ئەوەی کە لێم گەڕێی بە سەلامەتی بچمەوە جێگای خۆم و لەمە بەدواوە نە تۆ من ببـینی نە من چاوم بەتۆ بکەویتـەوە. حـەجـاج پێکەنـی و ئەمـری کـرد هەزار درهەمیان دایە و بەڕێیان کردەوە.

*****

(یەزدیجـورد) جـارێـک (بەهرامـی گـۆڕی) کـوڕی لەکـاتی نامـوناسـیـبـدا لە حەرەمسەرادا دی، بانگی کرد و گوتی: برۆ دەرەوە و (سی) دار لە دەرکەوانەکە بدە و دەریکە و فـلان کەس بکە بە دەرکـەوان. بارام بە قـسـەی باوکی کـرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کـە ئەوکـاتە تەمـەنی لە سـێـزدە سـاڵ زیاتر نەبوو نەیزانی بۆچی باوکی لە دەرکەوانەکە تورە بووە و دەری کرد. لە پاشـان بەهرام ڕۆژێـک هات بۆ بەردەرگای حـەرەمـسـەرای پاشـا و ویسـتی بچـێـتـە ژورەوە، دەرکـەوانی دووەم دەسـتی بە سینگیەوە نا و نەیهێشت بچێتە ژورەوە و گوتی: ئەگەر جارێکی دی لێرەدت ببینم (سی) دارت لێ دەدەم، لەبەر ئەوەی خەیانەتت بە دەرکەوانی پێشـوو کـرد و (سی) دیکەشت لێ دەدەم لەبەر ئەوەی دەتەوێ خـیانەت بە منیش بکەی. ئەو خـەبەردیان دا بە(یەزدیجورد). دەرکەوانی دووەمی بانگ کرد، ئافەرینی کرد و خەڵاتیشی کرد.

*****

وەزیری (هۆرمزی) کوڕی (شاپور)، نامەیەکی بۆ شاپور نوسی، کە بازرگانەکانی دەریا جەواهێرێکی زۆریان هێناوە و بە (سەد) هەزار دینار بۆ پاشام کڕیوە، بەڵام بیستـومە کە پاشـا نایەوێ، ئەگـەر ئەو خـەبەرە ڕاستـە، فلا ن بازرگـان حـازرە بە (سەد) هەزار دینار قازانج بیکڕێتەوە. هۆرمز پاشـا لە وەڵامی وەزیردا نوسی کە هەزار دینار و سەدهەزار لە لای ئێمە ئەوەندیان قەدر و بایەخ نیە و ئەگەر ئێمە بازرگانی بکەین کێ پاشایەتی بکا و بازرگانەکان چ بکەن؟

*****

ئەمیری موسـوڵمانان حەزرەتی (عومەر) ڕەزای خوای لێ بێ، لە کـاتی خەلافەتیدا لە(مەدینە) خەریکی سواغ کردنی دیوارێک بوو. جولەکەیەک هـاتە خزمەتی و گوتی: حاکمی (بەسرا) کالایەکی بە سەدهەزار دینار لێکڕیوم و لە پارە دانەکەدا بەهانان دێنیتـەوە و نامداتێ. حـەزرەتی عـومـەر (لەتکە سـواڵە)تێکی هەڵگرت و لە سـەری

نوسی، شکایەتکەر زۆرن و شوکرگوزار نایاب و لە دوارۆژی شکایەت خۆت بپارێزە، یان دەست لە بەرپرسایەتی هەڵگرە. لە ئاخرەکەیدا نوسی (کتبه عمر بن الختاب). نە مۆری کرد و نە ئیمزای لێ دا، بەڵام ئەوەندە سام و هەیبەتی عەدالەت و سیاسەتی چوبوو لە دڵانەوە، کاتێ کابرای جولەکە ئەو (لەتکە سوالەتە)ی دا بە حاکمی (بەسرا) کە سواری ئەسپ بوو، لە ئەسپەکەی دابەزی و (سوالەتە)کەی ماچ کرد و پارەی کابرای جولەکەی بە تەواوی دایەوە و کابرا گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی.

*****

دەڵێن: (کوڕ)ێکیان لە سەر دزی گرت و خەلیفە حوکمی دا کە دەستی ببڕن تا دەست لە ماڵی موسوڵمانان هەڵگری. کوڕەکە پاڕایەوە و گوتی: خەلیفە! خوای گەورە دەستی ڕاست و چەپی داوە بەمن، تۆ بەڕەوای دەزانی کە دەستی ڕاستم لە دەستی چەپم جیا وەبێ؟ خەلیفە گوتی: دەستی ببڕن، چونکە ئەوە سزایەکی خواییە و نابێ لێی لابدرێ . دایکی کوڕە کە لەگەڵ کوڕەکەی بوو گوتی، ئەی خەلیفە! ئەوە کوڕی منە و بەهۆی یارمەتی ئەوەوە ژیان دەبەمە سەر و ئەو بەخێوم دەکا. خەلیفە گوتی، دەستی ببڕن و لەو گوناحە خۆش نابم و ئەو گوناحە ناخەمە سەر ئەستۆی خۆم. دایکی کوڕەکە گوتی، ئەی خەلیفە! ئەو گوناحەشت وەک ئەو گوناحانە حیساب بکە، کە هەمیشە لەبەر خوا دەپاڕییەوە و تۆبە و ئیستیغفاریان لێ دەکەی. خەلیفە ئەو قسەی زۆر پێخۆش بوو گوتی: بەرهەڵدای بکەن لەبەر خاتری دایکی.

*****

بە(ئەسکەندەر)یان گوت: قوربان! بەهۆی چیەوە ئەو سەڵتەنەت و پاشایەتی و گەورەییەت دەست کەوت؟ خۆ تۆ گەنجی و تازە پێدەگەی؟ لە وەڵامدا گوتی: بە دڵنەوایی دوژمنان تا ڕوو لە دوژمنی وەرگێڕن و بە ڕاگرتنی وەفا لەگەڵ دۆستان تا لە سەر دۆستایەتی پایەدار بمێنن.

*****

دەڵێن: لە پیاوێکی سەخییان پرسی: ئایا بەهۆی ئەو شتانەوە کە دەیدەی بە داماوان و بە فەقیران و سوالکەران، بە دڵ پێت ناخۆش نیە و منەتیان بە سەردا ناکەی؟ لە وەڵامدا گوتی: نەخێر. من لە هەوڵدان و بەخشین دا وەک (ڕفیدەی) نانکەرانم، هەرچەند نانکەر، نانەکە دەدا بە ڕفیدە و ئەویش دەیداتەوە بە (تەندور)، بەڵام ئەرفێدە قەت بیر لەوە ناکاتەوە کە بەخشندەیە.

*****

(ئیبراهیمی) کوڕی (سلێمانی) کوڕی (عەبدولمەلیکی) کوڕی (مەڕوان) دەڵێ:

لەوکاتەدا کە نۆبەی خەلافەت لە (بەنیئومەییەوە) هاتە دەست (بەنی عەباسی)یەکان، ئەوان بەدوا بەنیئومەییەکاندا دەگەڕان بیانگرن و بیانکوژن، ئەوەی بیاندیایێ دەیانگرت و دەیانکوشت.

دەڵێ: من لە دەرەوەی شاری (کوفە) لە سەربانێکی بڵند لە سەحرا دانیشتبووم تەماشام کرد چەند بەیداغی ڕەش لە شاری کوفە دەرکەوتن، وام هاتە دڵەوە کە ئەوە بەدوای مندا دەگەڕێن، بە بێدەنگی لە بانەکە هاتمە خوارێ و بەدزییەوە چوومە ناو شارەوە. کەسم نەدەناسی، بچم لە ماڵەکەیدا خۆم وەشارم، گەیشتمە بەر دەرگای خانووبەرەیەکی گەورە. تەماشام کرد پیاوێکی ڕەنگوڕو جوان بە سواری ڕاوەستا وەکو مەلیک، غولام و دەست و پێوەند دەوریان گرتووە. سڵاوم کرد، گوتی: تۆ کێی و کارت چییە؟ گوتم، پیاوێکم لە دوژمنانی خۆم دەترسم و پەنام بۆ ماڵی تۆ هێناوە. کابرا بردمیە ماڵەوە و لە هۆدەیەکی نزیک حەرەمسەرای دانام. چەندڕۆژ لەوێ بووم، زۆر خۆشم ڕادەبوارد و هەرچی خۆشبوو لە خواردن و خواردنەوە و جل وبەرگ لە لام بوو. کابرا هیچ پرسیاری لێ نەدەکردم. ڕۆژی جارێک سواری ئەسپ دەبوو، ماوەیەک دەڕۆی و دەهاتەوە. ڕۆژێک لێمپرسی و گوتم، هەموو ڕۆژێ دەبینم سواری ئەسپ دەبی و ماوەیەک دەڕۆی و دێیەوە، ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ لە وەڵامدا گوتی، برایمی کوڕی سلێمان باوکی کوشتووم و بیستومە خۆی شاردووەتەوە، هەموو ڕۆژێ دەچم بەدوایدا دەگەڕێم، بەڵکو وەیبینم و تۆڵەی باوکمی لێ بکەمەوە. دەڵێ، کە ئەو قسەم لێ بیست سەرم لە بەدبەختی خۆم سوڕما کە قەزاو قەدەر چۆن منی هێناوەتە ماڵی کەسێک کە بەدوای کوشتنی مندا دەگەڕێ.

لە ژیانی خۆم بێزار بووم و گوتم، ناوت چییە و باوکت ناوی چی بوو؟ کە ناوی بردن، زانیم ڕاست دەکا گوتم، ئەی پیاوی باش! تۆ چاکەت زۆر بە سەر منەوەیە، لە سەرم واجبە دووژمنەکەت پێ بڵێم و ئەو هاتوچۆیەت لەکۆڵ کەمەوە. ئیبراهیمی کوڕی سلێمان منم و تۆڵەی باوکتم لێ بکەوە. باوەڕی نەدەکرد گوتی: وادیارە لە ژیان وەڕەز بووی و دەتەوێ لەکۆڵ ناخۆشی وەبی. گوتم، ناواڵلا من کوشتوومە و چەند نیشانەم بۆ باسکرد، زانی کەڕاست دەکەم، ڕەنگی گۆڕاو چاوی سوور هەڵگەڕان و ماوەیەک سەری بەردایەوە و پاشان گوتی، بەوزووانە دەگەیە باوکم و خوێنی خۆت لێ داوا دەکا، بەڵام من ئەو پەنایەی داومە بە تۆ لێی پەشیمان نابمەوە، هەستە زوو برۆ، چونکە لەخۆم ئەمین نیم کە نەگۆڕێم. نەکا زەرەدێکت پێبگەیێنم . دەڵێ، هەزار دیناریشی دامێ، بەڵام لێم وەرنەگرت و هاتمە دەرەوە.

*****

(پشیله)یەک کۆتری کابرایەکی گرت و خواردی. کابراکە پێی زانی زۆر تورە بوو، بەردێکی هەلگرت و پەلاماری پشیلەکەیدا و زۆر بە رقەوە پێی دادا و گوتی: ئەی حەیوانی بێ نرخی خاین. لە وەلامیدا پشیلەکە گوتی، ئەی ئینسان! ئایا تۆ پێت ڕەوایە بەو سیفەتە ناشیرنانەوە ناوم بەری و باسم بکەی؟ لە کاتێکدا خۆت هەموو ئەو سیفەتانەت تێدابێ؟ کەسێک داوێنی خۆی پاک نەبێ، نابێ بەخەلک وابلێ: باشە ئەی پێم نالێی شەرەف و ئەمانەتداری و ئەمینی تۆ لەچ دایە و لە کوێ یە؟ تۆ چیت کردووە تا پێت بلێن بەشەرەفی و خاین نی. کابراگوتی، بەڕاستی پشیلە من سەرم سوڕماوە لە بێ ئەدەبی تۆ سەبارەت بە ئادەمیزاد. تەماشا ناکەی ئامیزاد دنیایان چۆن پڕکردووە لە عیلم و زانیاری و چۆنیان ئاوەدان و ڕووناک کردووەتەوە؟ هەموو گیانلەبەرێکیان هێناوتە ژێردەست و کەمەندی خۆیانەوە.

پشیلە گوتی، ئەی ئینسان! خۆ تۆ باسی شەرەفی خۆت نەکرد و نەتگوت: شەرەف چیە، تەنانەت هەر خۆت هەلنایەوە و باسی زۆری حیرس و تەماعی خۆتانت کرد، خۆ ئەمن پرسیاری خووڕەوشتی جوان و شەرەفم لێ نەکردی. ئینسان وەلامی دایەوە: ئەی پشیلە تەماشا ئینسانان بکە بزانە چۆن بەزانیاری کارگەی پیشە سازی سەرسوڕهێنەریان دامەزراندووە، خۆ پشیلە هەر ناتوانی چوکترین ئەشیای ئەو کارخانانە دروست بکا. ئایا ئەوە بەلگە نیە کە ئینسان لە هەموو گیانلەبەرێک زاناترە و لە هەموان گەورەترە؟

پشیلە وەلامی دایەوە گوتی، ئەی ئینسان! ئەوە بزانە کە ئەندازیاری ئەو کەونە گەورەیە و ڕێکخەری کائنات پشیلە و حەیواناتی دروست کردوون و هیچ پێویستیان بە ئادەمیزاد نیە، پێستی وای دەبەرکردوون، لە سەرماو گەرمادا دەیانپارێزێ، ددان و چنگ و نینۆکی داونێ تا خۆیان لە شەڕی دوژمنان ڕزگار بکەن، بەلام تۆ ئەی ئینسان! خواوەندی گەورە لە هەموو لایەکەوە بە هەژارو دەسکورت و موحتاجی خەلق کردووی. بۆ ژیانێکی وەک بچوکترین گیانلەبەران پێویستیت بە یارمەتی عیلم و سەنعەت و زانیاری هەیە، لەگەل ئەوەشدا تا ئێستا وەک دەتەوێ بەمەبەستی خۆت نەگەیشتووی.

ئینسان وەلام دەداتەوە و دەلێ، ئەی پشیلە! بڕوانە ئادەمیزاد چ یاسا و نیزامێکی داناوە و چۆن کار و کاربەدەستی دیاری کردوون تا بەسەر حە ق و مافی خەلکدا ڕابگەن و کاروباریان بۆ جێبەجێ بکەن تا بەو هۆیەوە تەواوی خەلک لە ئاسایش دا بن و ماف و مال و ژیانیان لە ئەماندا بن، ئایا لە ناو کۆمەلی حەیوانات

دا هەرگیز شتی وا دەبیندری؟ یان نیزامی وا هەیە؟
پشیلە گوتی: ئەی ئینسان! لەو لیدوانەی تۆڕا بۆم دەرکەوت کە ئیوە زۆر زۆر خەراپن وادیارە هەر لە خلقەتدا بە زالم و خاین و بۆ خەراپە و غەدر و دوژمنایەتی هاتوونە دنیاوە و زۆر شەڕانین. هەر لەبەر ئەوەشە، کە موحتاج بە دانانی یاسا و نیزام بوون تا هێندێکتان لە شەڕی ئەوانی تر بپارێزرێن و بۆ ئەوەی کە ئەمن و ئاسایش و ئاشتیتان لە ناودا پەیدا بێ. لەگەڵ ئەوەشدا کوا سولح و ئاشتی، پێم ناڵێی؟ دە وەڵامم بدەوە؟
ئینسان گوتی: ئەی پشیلە تەماشای فەلسەفە و حیکمەت و زانیاری ئادەمیزاد بکە و بزانە کە چۆن پەیوەندیان لەنێوان خۆیان دامەزراندوە، چەندین گەورە و سەرۆک و وەزیر و کاربەدەستیان داناون تا هەریەکەی وەک دەنکی تەسبیح و ملوانکە وا بن بۆ پێکەوە گرێدانی خەلک بەیەکترەوە. تا بەهۆی یارمەتی دانی یەکترەوە بە ئامانج و خۆشبەختی بگەن و هەموویان وەک ئەندامی یەک لاشە و جەستە بن. بەڵام ئێوەی حەیوانات و باقی گیانلەبەرانی تر وا نین و پەیوەندی واتان لەنێودا نیە.
پشیلە: ئەی ئینسانی فێڵباز، ئەوەی تۆ گوتت، مەعنای ئەوەیە کە ئێوە زۆر بێ نرخن. ئارەزوتان لە بەندەیی و کۆیلەتیە. چونکە ئینسانی ئازاد قەت نایەوێ سەر بۆ کەس دانەوێنێ، بەڵام بە پێچەوانەوە ئێوە هەوڵتان داوە ببنە بەندەی گەورەکانتان و زاڵ بن بە سەرتاندا و بۆ مەبەست و مەرامی خۆیان کاتی شەڕ و ئاژاوە بەهیلاکتان بدەن. ئێوە ئەوەندە ئازار و ئەزیەت دەکێشن کە بە پێنوس نانوسرێ. زۆری وا هەن کە لەژێر باری زوڵم و ستەمدا دەمرن لە پێناوی ئارەزوی گەورەکانتاندا. هەروەها ئەو م ال و سەروەتەی کە بە هەزار کوێرەوەری پەیدای دەکەن، ئەوان دەستی بەسەردا دەگرن، خۆ ئەگەر نەیاندەنێ بە زۆر لێتان دەستێنن. ئەگەر بە ئارەزوی خۆیان شتێکتان بۆ وەهێڵن، ئەوە بۆ ئەوەیە تا پێی بژین و کارتان پێبکەن. جا توخوا هەر فەخر بەوەوە دەکەن؟
ئینسان گوتی: ئەی پشیلە تۆ نەتبیستووە، دانەری کائینات بەرەی ئادەمیزادی بەهۆی پێغەمبەرانەوە چۆن گەورە کردووە. تازە تۆ چۆن ئینکاری شەرەف و گەورەیی ئینسانان دەکەی؟ چۆن لە هەموو گیانلەبەرێک خاوەن کەرامەت تر نیە؟
پشیلە: ئیمان و باوەڕم بە گەورەیی و شەرافەتی ئینسان هەیە، بەڵام ئەی لەڕێ لادەران! کوا ئیستا ئیمان و بەو پێغەمبەرانە ماوە؟ کوا ئێوە پەیڕەوی لەوان دەکەن؟ کوا ئێوە لە سەر خووڕەوشت و ئەخلاقی ئەوانن؟ خۆ ئێوە لە دوای ئەوان هەر

فیسقوفجور و زوڵم و دوژمنایەتیتان زیاد کردووە. ئەو حەق و ڕاستییەی کە ئەوان هێنایان، ئێوە پشت گوێتان خست، ئێوە سوپاسی ئەو پێغەمبەرانە و شوکرانەی ناز و نیعمەتی خوا ناکەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەی ئینسان! تۆ نازانی کە ئەوەی ساغ بێ، پێویستی بە دوکتۆر نیە؟ خۆ پێویستی ئێوە بە پێغەمبەران بەڵگەیە لە سەر ئەوە کە دڵتان نەخۆشە و وەک هەر بە نەخۆشی لە دایک بووبن دەچێ، بەڵام خۆتان هەستی پێناکەن. تۆ بەڵگەیەک ناهێنیتەوە کە نەبێتە هۆی ڕیسوا بوونتان، ئەوە چیت لێ قەوماوە؟

ئینسـان گـوتی، ئەی پشـیلەی بێ نرخ و بێ قـیمـەت، تۆ بەو چەنەبازییـەت لە مـەبەست دوورت خسـتمـەوە، تۆ بۆچی کۆترەکەمت خـوارد و خیانەتت بە مـاڵی من کرد و شەرمت نەکرد؟

پشـیلە وەڵامی دایەوە و گـوتی: ئەی ئینسـانی خۆ بەزل زانی نەفام، یەکـەم تۆ و ئەوانەی وەک تۆن ڕێیان ناکەوی بە من بڵێن خاین، چونکە خالقی بوونەوەر ڕێگای داوم لە قـەدەر پێـویسـتی ژیانم هەرچی وەبەر دەسـتم کـەوێ و بەهەر جـۆرێک بێ بیخـۆم، بەڵام ئێـوە هـەرکامـتان هەڵتان بۆ بڕەخسێ مـاڵی یەکتر دەخۆن و ئەوەی دەسـتی بڕوا لە ئێـوە مـاڵی هەژاران دەبا و لە کـۆشک و تەلار و لیبـاسی جـوان و خواردنی خۆشـدا خـەرجی دەکـا، زۆرتان بە ژنەکـانی خۆتـان ناوەستن و خیـانەت لەگەڵ ژنی دۆست و دراوسـێکانتـان دەکەن. درۆ دەکەن و دوو ڕوون بۆ گەیشتن بە ئاوات و ئارەزوەکانتـان. تەنانەت بـاوک بە ئەولاد و ئەولاد بە باوکی خیـانەت دەکا و برا لەگەڵ برا ڕاست نیـە. بەڕواڵەت خۆشـەویسـتی و وەفا و سەفـا و دۆسـتـایەتی و ئەمـینی و ئەمـانەت نیـشـان دەدەن، بەڵام لە باتیندا زاڵم و خـاینن. سـوێندی درۆ دەخۆن، بەڵێنییـەکـانتان نابەنە سەر، کەسـتـان لە کەس ئەمین نیە. هەمیـشـە لە خەراپەی یەکتر دەترسن. تۆ بەمن دەڵێی خاین و خەسیس و دەنی، بەڵام ئەوە بزانە کە من و هاونەوعانی من خاوەنی عیزەتی نەفس و هیممەتی بەرزین، هیچمـان حازر نابین ببینە عەبد و بەندەی کـەسی تر و پشت بۆ کـەس دانەوێنین. چوکتـرینمـان ئەگـەر بە شیر و تیرەوە پەلاماری بدەن و دەوری بگرن و ڕێگای مردن نـەبێ، هیچ چارەی نەمێنی، هەمـوو توانای خۆی بەکار دێنی و وەکو شێر و پڵنگ پەلامار دەداو بە بچوکی خۆیەوە شالاو دەباتە سەریان وەکو شێر چنگوڕک لەمیان دەدا و ئەوی تریان دەگەزی، تا بە سـەربەرزیەوە دەمری. مردنی بەشـەڕەفی پێ باشـترە لە مـانی بە کـۆیلەتی، بەڵام ئـەی ئینسـان، تۆ و ئەوانەی وەک تۆن خـووتان بـە زەلیلی و کۆیلەتی گرتووە. دەبینم، زاڵمێکتان زوڵم لە پیاوچاک و زانا و نەزان و دەوڵەمەند و

فەقیر و شەریف و دەنی و هونەرمەند و قەڵەم بەدەستان دەکات و بە چاوی سووک تەماشایان دەکات. هەتکی شەرەف و ناموسیان پێدەکات، ماڵیان بەفیڕۆ دەبا، بێگارییان پێدەکا، بەڵام ئێوە دەنگ ناکەن. خۆ ئەگەر ئینسان کار بە کەر یان گایەک بکا ناچارە ئالک و تفاق و ئاوی بداتێ، بەڵام ئێوە لە لای ئەو زاڵمانە لە حەیوان کەمترن. بە چاوی ڕەزامەندییەوە تەماشاتان ناکا. پاداشتی ئەو هەموو خزمەتەتان ناداتەوە. تەنانەت قسەی خۆشیشتان لەگەڵ ناکا و ڕووی خۆشتان ناداتێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئێوە زیاتر کورنوشی بۆ دەبەن و باشتری بەقسە دەکەن. ئێوە ئەوەندە نازانن، کە تەماشای ئەو هەموو زیندانانە بکەن کە لە سەرتاسەری دنیا بۆیان دروست کردوون. زانیاری زاناکان چ سودێکی هەیە بۆتان؟ ئەی فائیدەی ئەدەبی ئەدیب و شاعیرەکانتان چیە؟ ئەی زانیاری حەکیمەکانتان بەکەڵکی چیدێ ؟ ئەی ئازایی و ڕەشیدی ئازاکانتان؟ خۆ بەزۆری ئەوانەی ئازا و نەبەزن بۆ سودی زاڵمەکان خۆیان بە کوشت دەدەن یان خەڵکیان بۆ دەکوژن. کە واتە مردنتان باشترە ئەی ئینسانی دەنی و ڕەزلیل لەو ژیانەتان. ژیانتان ماندوو بوونە ئازادیتان بەندەگی یە، عەزیزتان زەلیلە. بەرز بوونەوەتان نزم بونەوەیە، ئازایەتیتان ترسەنۆکی یە. کە ئەوەم لە پشیلە بیست پێنوسەکەم فڕێدا و گوتم: پشیلە ڕاست دەکات، مادام ئینسان ئاوا بێ، لە هەموو حەیواتێک بێ نرخ ترە.

جەمال الدینی ئەفغانی

*****

دەڵێن: ئیمام (حەنەفی) ڕەزای خوای لێ بێ کابرایەکی پینەچی لە شاری (کوفە)دراوسێی بوو. کابرا بە ڕۆژ کاری دەکرد و ئێواران گۆشت و ماسی دەکڕی و دەهاتەوە گۆشتەکەی دەکوڵاند و ماسیەکەی دەبرژاند و دەستی دەکرد بە ڕابواردن. تا کاتێ سەرخۆش دەبوو. کە سەرخۆش دەبوو، دوو شیعری دەخوێندەوە، کە مەنایان ئەوە بوو، ئەو دراوسێ یانە ئاگایان لە من نیە. نازانن چ کوڕێکیان لە دەست داوە بۆ ڕۆژی تەنگانە و بەرگری لە دوژمنان. ئیمامی حەنەفی تا بەیانی نوێژی دەکرد و گوێی لەو شیعرانەی کابرا بوو، بەڵام وەسەر خۆی نەدێنا. لەپاش سێ شەو کابرا دەنگی نەهات. ئیمامی حەنەفی پرسیاری لێکرد گوتیان، پۆلیس گرتویەتی ئیمامی حەنەفی نوێژی بەیانی کرد و سواری وڵاغەکەی بوو و چوو بۆ لای ئەمیری کوفە. خەبەریاندا بە ئەمیر. ناوبراو گوتی، ئیمام دانەبەزی هەر بەسواری بێتە ژوورەوە، بەڵام ئیمام دابەزی و چووە لای ئەمیر. کە چوو ئەمیر زۆری ڕێز لێگرت و گوتی چ دەفەرمووی؟ ئیمام گوتی ئەمیر! دراوسێکەمان گیراوە،

سێ ڕۆژە دیارنیە، هاتووم بۆ بەردانی. ئەمیر ئەمری کرد لەبەر خاتری ئیمام هەرچی لەو ڕۆژەدا گیرابوون بەریاندا. ئیمام خواحافیزی کرد و سوار بوو گەڕایەوە و کوڕەکە وەدوای کەوت. ئیمام فەرمووی، ئیستاش لات وایە ئێمە ئاگامان لە دراوسێ نیە؟ کوڕەکە گوتی: نەخێر قوربان خوا جەزای بەخێرت بداتەوە. قەرار بێ لە سەردەستی جەنابت لەو ڕۆ بە دواوە ئارەق نەخۆمەوە و تۆبە بکەم، تۆبەی کرد و ڕووی کردە خواپەرستی.

*****

جارێک یەکێک لەو زانایانەی کە حەدیس ڕیوایەت دەکەن لەگەڵ کابرایەکی مەسیحی لە کشتی دا دەبنە هاوڕێ. کابرای مەسیحی مەشکاڵەیەکی پێ دەبێ، زارکی مەشکاڵەکە دەکاتەوە و پیالەیەکی لێ پڕ دەکات و دەیخواتەوە و دوبارە پڕی دەکاتەوە و بۆ زاناکەی ڕادەدێری. زاناکەش بەبێ ئەوەی بیری لێ بکاتەوە دەیخواتەوە. کابرای مەسیحی دەڵێ، خۆ ئەوە شەڕاب بوو. زاناکە دەڵێ، بەچ دەزانی شەڕاب بوو؟ کابرا دەڵێ، غولامەکەم لە جولەکەیەکی کڕیوە و سوێندی خواردووە کە شەڕابی کۆنە. زاناکە دەڵێ، ئێمە ڕاستگۆترین، ئێمە ڕیوایەت لە ئەسحاب و تابیعینان دەکەین، ئینجا ئەو شتە بەڕاست دەزانین، جا چۆن بەقسەی مەسیحی کە ئەو لە غولامەکەی بیستبێ و ئەویش لە زمان جولەکەوە وەیگێڕی. (واللاهی) بۆیە خواردمەوە، چونکە ئیستنادەکەی بەلای منەوە لاواز بوو.

*****

کابرایەک تەماشا دەکا کۆمەڵێک خۆیان سازکردووە بڕۆن بۆ جێگایەک. کابرا لە دڵی خۆیدا گوتی: ڕەنگە بانگهێشتن کرابن بۆ سەرشایێ، بێ پرس و ڕا دوایان کەوت، تا گەیشتنە کۆشکی پاشا. تەماشای کرد هەموویان شاعیرن و هەر یەکە لە مەدحی پاشادا سەر و قەسیدەیان خوێندەوە و خەڵاتی خۆیان وەرگرت. هەرئەوما یەوە و دەنگی نەکرد. ڕوویان تێکرد و گوتیان، تۆش قەسیدەکەت بخوێنەوە، گوتی، ئەمن شاعیر نیم، گوتیان: ئەی تۆ چی؟ گوتی، ئەمن لە (غاویانم) کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسیان دەکا و دەفەرمووێ: (وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ) پاشا زۆر پێکەنی و ئەمری کرد وەک شاعیرەکان خەڵاتی بکەن.

*****

(ئەبو دولامەی) شاعیر دەچی بۆلای (مەهدی) خەلیفە و قەسیدەیەکی بۆ دەخوێنیتەوە. خەلیفە دەڵی، چت دەمێ؟ لە وەلامدا دەڵی، (سەگ)ێکم بدەیە. مەهدی تووڕە دەبێ و دەڵی: من دەڵێم چت دەوێ، تۆ دەڵێی سەگ. گوتی، قوربان هەر سەگم

دەوێ. (مەهدی) گوتی، سەگێکی بدەنێ. (ئەبو دولامە) گوتی، باشە قوربان دەکرێ بە پێ بچم بۆ ڕاوێ؟ خەلیفە گوتی، ئەسپێکیشی بدەنێ. گوتی، قوربان! ئەدی کێ خزمەتی بکا؟ خەلیفە گوتی، غولامێکی بدەنێ. گوتی باشە ئەگەر نێچیرم کوشت و هێنامەوە کێ بۆم لێنێ؟ خەلیفە گوتی، جارییەکی بدەنێ.

ئەبو دولامە گوتی: بەخوای خەلیفە بارت گران کردم جا چۆنیان بەخێو کەم؟ خەلیفە گوتی، ئەوە فلان باغە خورماشم دایتێ. لە دوایی خەلیفە گوتی، چی ترت ماوە؟ گوتی بەڵێ: ئەگەر ئیجازەم بدەی دەستت ماچ کەم و لە خزمەتت مەرخەس بم.

*****

(هەیسەمی) کوڕی عەدی (عودە)ی دەڵێ: جارێک لە خزمە ت ئیمامی (حەنەفی)دا چەند کەسێک چوین بۆلای نەخۆشێک. کابرای نەخۆش بە بەخیل ناسرابوو. لە ڕێگادا بڕیارماندا کەچوین و دانیشتین و ئەحوالپرسی تەواو بوو، یەکێک داوای خواردن بکا. کاتێ چوین و ئەحوالپرسیمان کرد و ماوەیەک دانیشتین، یەکێکمان ئەو ئایەتەی سورەی (الکهف)ی خوێندەوەکە دەفەرموێ:

(آتِناغَداءَنا لَقدْ لقِينامِنْ سَفرِنا هَذا نَصَبًا). نەخۆشەکە لە وەلامدا ئەو ئایەتەی سورەی تۆبەی خوێندەوە کە دەفەرمووێ: (ليسَ عَلَىٰ الضّعَفاءِ ولاعلىٰ المَرْضىٰ وَلاعلىَ الّذينَ لايَجِدُونَ ماينْفِقونَ حَرَجٌ). ئیمامی حەنەفی فەرمووی: وادیارە نەی وێرانێ.

*****

زانای بەناو بانگ (ئەبو نەسری فاڕابی) دەچی بۆ شاری (دیمشق) و دەچێتە لای سەیف الدەولەئکوڕی حەمدان. فاڕابی هەمیشە لیباسی تووکی لەبەردا بووە و سەیف الدەولە نەیناسی، سڵاو دەکا و ڕادەوستی. سەیف الدەولە دەڵێ، دانیشە، ئەبو نەسر دەڵێ، بە ئارەزوی تۆ یان بە ئارەزووی خۆم؟

سەیف الدەولە دەڵێ: بە ئارەزووی خۆت، ئەبو نەسر دەچێ لە تەنیشت سەیف الدەولە دادەنیشی.سەیف الدەولە بە زمانێکی تایبەتی ڕودەکاتە ئەو کەسانەی لە مەجلیسەکەیدا بوون و دەڵێ، تەماشا ئەو کابرا پیرە چەند بێئەدەبە. چەند پرسیارێکی لێ دەکەم ئەگەر نەیزانین دەری کەنە دەرەوە.

فاڕابی حاڵی بوو گوتی، جەناب ئاخری کار حیسابە. سەیف الدەولە زۆری بەلاوە سەیربوو کە لێی حاڵی بووە. لە پاشان لەگەڵ زاناکان دەکەونە باسی عیلمی و لە هەموو زانیارییەک پرسیاری لێ دەکەن بەسەریاندا زاڵدە بێ، تا هەموویان بێدەنگ

دەبن و هەر ئەو قسەیان بۆ دەکا و ئەوان قسەکانی دەنوسنەوە.
سەیف الدەولە زۆری بەلاوە سەیر دەبێ و لە پاشان دەڵێ: نان و چایی ناخۆی؟ فاڕابی دەڵێ نەخێر. سەیف الدەولە دەڵێ، ئەی گوێ لە تار و ئاواز ڕاناگری؟ دەڵێ، بەڵێ. سەیف الدەولە گۆینده و هونەرمەندان بانگ دەکا و دەست پێدەکەن. سەیف الدەولە دەڵێ، هیچ لەو بەزمە دەزانی؟ دەڵێ، بەڵێ. کەمێکی لێ دەزانم. لە پاشان تورەکەیەکی پێ دەبێ، دەیکاتەوە و دوو سێ داری لێ دەردێنێ و لەسەریەکیان دادەنێ و یارییەکیان پێدەکا. تەواوی خەڵکەکە بێ ئیختیار دەست دەکەن بە پێکەنین. لەپاشان دارەکان لێک جیادە کاتەوە و بەجۆرێکی دی لێکیان دەدا، هەموویان دەست دەکەن بەگریان، ئینجا بەجۆرێکی دیکە ڕێکیان دەخا هەتا هەموو خەویان لێ دەکەوێ. تەنانەت دەرکەوانەکانیش دەنوون و (فاڕابی) بێدە نگ دێتە دەرێ. لەپاشان سەیف الدەولە بە دوایدا دەنێری و زۆری ڕێز لێ دەگری و دەڵێ، با مەعاشت لە بەیتوالمال بۆ وەبرم، لە وەڵامدا دەڵێ، چوار درهەمم بەسە. (فاڕابی) لە شاری (دیمشق ) دەمێنیتە و خەریکی دانانی کتێبان دەبێ تا لە ساڵی (٩٣٣)ی کۆچیدا هەر لەوێ وەفات دەکات.

*****

ڕۆژێک (مەنسور) خەلیفەی عەباسی لە سەر هەیوانی خانووی شاری (مەدینە) دادەنیشی، تەماشا دەکا کابرایەک زۆر بە شێواوی بەناو شاردا دەڕوا. مەنسور ناردی هێنایان بۆلای و گوتی: ئەوە چت لێ قەوماوە؟ گوتی، قوربان! لەو ڕۆژانەدا توجارەتم کرد و زۆرم قازانج کرد. چووم پارەکەم دا بە ژنەکەم هەڵی گری، کەچی ئەمڕۆ چوومەوە داوای پارەکەم کرد گوتی، دزراوە، تەماشا دەکەم خانوەکەشمان نەبڕاوە و نیشانەی دزی پێوە دیار نیە. مەنسور گۆتی، کەی ژنت هێناوە؟ گوتی، ئەوە ساڵێکە. گوتی، کاتێ هێنات کچ بوو یان بێوە ژن؟ گوتی، بێوە ژن. مەنسور گوتی، گەنجە یان پیر؟ گوتی، گەنجە. مەنسور شوشە عەترێکی دا بە کابرا و گوتی، غەمت نەبێ، هەرکاتێ ئەو عەترە بە بۆنەوەکەی هیچ غەمت نامێنی. کابرا چۆوە ماڵێ و عەترەکەی دا بەژنەکەی و گوتی، ئەوە عەترێکی زۆر بۆن خۆشە، هی ئەمیری موسوڵمانانە، کەس عەتری وا بۆن خۆشی دەست ناکەوێ. ژنە تۆزێکی لە خۆیدا، بۆنی زۆرخۆش بوو. هەڵی گرت و لەپاشان دای بەو کوڕەی کە حەزی لێ دەکرد.
مەنسور چەند پیاوێکی لە سەر ڕێگاکان دانا و گوتی: هەر کەسێک بەلاتاندا هات و بۆنی ئەو عەترەی لێهات بیگرن و بیهێنن بۆلام. کوڕەکەش عەترەکەی لە

دۆستەکەی وەرگرت و هێندێکی لە خۆیدا و هاتە بازاڕ. بەلای چەند پیاوی خەلیفەدا ڕۆیی و بۆنەکەیان ناسییەوە، گرتیان و بردیان و دایان بە پۆلیس و پێیان گوت: ئەگەر ئەوەندە پارە نەدەی هەزار دارت لێ دەدەین. کابرا کە زانی دارکاری دەکەن گوتی، باشە لە گەلی چوون لە مالەوە پارەکەی هێنا، بەقەد پارە دزراوەکەی کابرا بوو. خاوەن پارەکەیان بانگ کرد و مەنسور گوتی، ئەگەر دەمکەی بە حەکەم ئەوە پارە دزاوەکەت دەدەمەوە. کابرا گوتی، قوربان! وەکیل و حەکەم بە. مەنسور پارەکەی دایەوە بە کابرا و ژنەکەی پێ تەلاق دا.

### باسی زەکاوەتی ئیمامی حەنەفی

جارێک دوو سێ دز دەچنە سەر مالی کابرایەک و کابرا دەگرن و مالەکەی تالان دەکەن و سێ بە سێ تەلاقی پێدەخۆن و بە قورئان سوێندی دەدەن کە ناویان نەبا و بە خەراپە باسیان نەکا، ئەگینا دەیکوژن. کابرا بەیانی دەچێتە بازاڕ و تەماشا دەکات ئەوە خەریکن مالەکەیان هەراج کردووە و دەیفرۆشن. لەترسان ناوێرێ دەنگ بکا و دەچێتە خزمەت ئیمامی (حەنەفی) و کارەساتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە.

ئیمام دەفەرمووی. کەسوکار و دراوسێکانت بانگ بکە با دوانیوەڕۆ بێن بۆ مزگەوت. کابرا چوو بە هەموانی ڕاگەیاند و هاتن. ئیمامی حەنەفی ڕووی کردە خەلکەکە و فەرمووی: حەز دەکەن ئەو پیاوە مالەکەی دەست کەوێتەوە؟ گوتیان: زۆر حەز دەکەین.

فەرمووی: یەک لە دوای یەک هەستن بچنە دەرێ و هەرچی چووەدەر ئێوە بلێن ئەوە بوو، ئەگەر ئەو نەبوو بابلێ نا ئەوە نیە و ئەگەر ئەویش بوو با دەنگ نەکا، کە دەنگی نەکرد دیارە ئەوە دزەکەیە. بەوجۆرە دز دەبیننەوە و مالەکەی لێ دەستێننەوە.

*****

هەرلە باسی زیرەکیدا دەلێن: (عەقەبەی نوزدی) ناوبانگی کردبوو بەوەی کە دوعای شێت بوون و ئەجندان دەزانی. ڕۆژێک ئافرەتێک دەبەن بۆلای و دەلێن، شێت بووە و نوشتەیەکی بۆ بنوسە. لەو وەختەدا ئافرەتەکە خۆ بەعەرزدا دەدا. عەقەبە بەوانەی لەگەل ئافرەتەکە دەبن دەلێ، ئێوە بچنە دەرەوە. ئەوان دەچنە دەرەوە و عەقەبە و ئافرەتەکە دەمێننەوە. ڕوو دەکاتە ئافرەتەکە و دەلێ: دەزانم شێت نی، ڕاستیم پێ بلێ، چیت لێ قەوماوە، ڕزگارت دەکەم. ئافرەتەکە دەلێ، چیت

لێوەشارم، ڕاستیەکەی ئەوەیە، من حەزم لە کوڕێک دەکرد و نەیاندامێ و دایانم بەو پیاوەی کە ئەمڕۆ بۆیان گواستمەوە و کچ نیم. جا لەترسی ئەوەی ئابڕووم نەچی خۆم شێت کردووە. ئەگەر بتوانی بە فێڵێک ڕزگارمکەی زۆرت سوپاس دەکەم. عەقەبە گوتی: زۆر باشە، هاتە دەرەوە بۆلای کەسوکارەکەی و گوتی، ئەجندەکەم ڕازی کردووە و دەڵێ، بەقسەت دەکەم و لە سەری لادەچم، بەڵام دەبێ ئێوە بڕیار بدەن، داخوا بەچ ئەندامێکیدا بێتەدەرێ؟

چونکە بەهەر ئەندامێکیدا بێتەدەر، ئەو ئەندامە لەبەین دەچی، گوتی ئەگەر بەچاویدا بێتەدەرێ کوێر دەبێ و ئەگەر بە گوێیانیدا بڕوا کەڕ دەبێ و ئەگەر بەدەمیدا بێتەدەر لاڵ دەبێ و ئەگەر بە دەستانیدا بێ شەلەل لێیان دەدا و ئەگەر بە قاچانی دا بێ گۆج و ئیفلیج دەبێ و ئەگەر بە هەرامەکەشیدا بێ کچێنیەتی نامێنی. جا خۆتان سەرپشک بن، چۆنتان پێ باشە تا ئاوا بکەم. گوتیان، وەڵلا بە هەرامەکەیدا لەهەموان ئاسانترە و هەمومان شاهیدی بۆ دەدەین با کچێنیەتی نەمێنی. عەقەبە بە زیرەکی خۆی وای پێسەلماندن کە بەوێدا ئەجیننەکەی دەرکردووە و کچە بە ڕوسوری چۆوە لای مێردەکەی و دەردی لێ نەما.

*****

ڕۆژێک (هارونەڕەشید) بە (فەزلی) کوڕی (ڕەبیع) دەڵێ: وەرە با بچینە دەر تۆزێک بای باڵی خۆمان بدەین. سواری ئەسپ دەبن و دەچنە دەرەوەی شار. تووشی پیاوێکی پیری زۆر کز و لاواز دەبن بە سواری کەرێک دەڕوا بۆ دەرەوەی شار و ئاوی بەچاواندا دێتەخوار. هارونەڕەشید ئاماژە بە فەزل دەکا، کە کابرا پیرە بدوێنی. فەزل دەچێتە پێشەوە و سڵاو دەکا و دەڵێ: خاڵە پیرە بۆ کوێ دەچی؟ لە وەڵامدا دەڵێ، دەچم بۆ ناو باغەکەم. فەزل دەڵێ، ئادیارە چاوت ئاو دەکەن، دەڵێ، بەڵێ، فەزل دەڵێ. دەرمانێکت پێ بڵێم، چاوت چاک بکاتەوە؟ دەڵێ، دەبەرێشت دەمرم.

فەزل دەڵێ، هێندێک تۆزی هەوا و یەک دوو بڵقی سەر ئاو و چەند پەلکە گەڵای کارگ واتە قارچک بێنە و تێکەڵیان کە و بیکە ناو توێکڵی گوێزو دەچاوانی کێشە، چاک دەبنەوە. کابرا پیرە لە سەر پشتی کەرەکە پاڵدەداتەوە و ترێکی دوورودرێژ بەردەداو دەڵێ، ئەوە حەقی پێگوتنی دەرمانەکەتە، ئەگەر خوا کردی و چاوەکانم چاک بوونەوە زیاتریشت دەدەمێ. دەڵێ، هارونەڕەشید ئەوەندە پێکەنی خەریک بوو لە سەر ئەسپەکە بکەوێتە خوار.

*****

(ئیبن و جەوزی) لە کتێبی (ئەزکیا)دا دەڵێ: ڕێبوارێک بەلای گۆڕستانێکدا ڕۆیشت، تەماشای کرد قەبرێک گومبەزێکی لە سەر کراوە و لە پێشی نوسراوە ئەوە گۆڕی (سەگ)ێکە و ئەوەی دەیەوێ بەسەرهاتی ئەو سەگە بزانێ بابچێتە فلان گوند و پرسیار بکا. کابرا زۆری بەلاوە سەیربوو، چوو بۆ ئاواییەکە و پرسی، گوتیان: فلان پیاو تەمەنی لە سەد ساڵ زیاترە و ئەو دەزانێ بچۆ ئەو بۆت باس دەکا. کە چوو پرسیاری کرد کابرا گوتی، بەڵێ بەسەرهاتی ئەو سەگە ئاوا بوو. پاشایەکی گەورەی خاوەن دەسەلاتی باش لێرە بوو، زۆری حەز لە ڕاوێ بوو، بۆ ئەمەش هەمیشە سەگێکی لە لابوو.

ڕۆژێک پاشا چوو بۆ گەڕان و بە پیاوەکانی گوت، بە چێشت لێنەرەکە بڵێن، تا دەگەڕێمەوە تێگوشیوی شیرم بۆ حازر بکات. چوون بە چێشت لێنەرەکەیان گوت. شیریان هێنا، بەلام لە بیریان چوو سەری داپۆشن. چێشت لێنەرەکە خەریکی نان حازر کردن بوو، ئاگای لێ نەبوو مارێک لە کونی دیوار دێتە دەر و دەم دەخاتە جامی شیرەکە. ئافرەتێکی لاڵ و سەگەکە چاویان لێ دەبێ. پاشا لای ئێوارێ هاتەوە و داوای تێگوشیوی شیری کرد. کاتێ بۆیان هێنا ئافرەتە لاڵەکە زۆری ئیشارە بۆ کردن حاڵی نەبوون.

سەگەکە دەستی کرد بە وەڕین و لوراندن، زۆریان بەلاوە سەیر بوو، کە بۆ وا دەکا، بەلام گوێیان نەدایە و پاشا گوتی دووری خەنەوە خۆ قەتی وانە کردووە. پاشا پارویکی بۆ سەگەکە هاویشت و دەستی برد بۆ تێگوشیوەکە. سەگەکە زانی پاشا خەریکە پارو بۆ دەمی دەبا، پەلاماری جامەکەی داو دەمی تێنا و هێندێکی لێخوارد. سەگ لەبەر دەمی پاشا بەلادا هات و تەواوی گۆشتەکەی هەڵوەری.

پاشا و خەڵکەکە واقیان وڕماو زۆریان بەلاوە سەیر بوو. ئافرەتە لاڵەکە ئەوەندەی ئیشارە بۆ کردن حاڵی نەبوون چ کارەساتێک ڕووی داوە. پاشا سوپاسی خوای کردو ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: خەڵکینە! ئەو سەگە ئەوەندە بە وەفابوو ڕوحی خۆی فیدای گیانی من کردووە و لە سەرم واجبە پاداشی بدەمەوە تا لێرە بەدواوە ببێتە دەرس و پەند و عیبرەت. کفن و دفنی کرد و ئەو گومبەزەی لە سەر کرد و ئەوەی لە سەر نوسی کە دەی بینی.

*****

دەڵێ: کابرایەکی عەرەب چوو بۆ (مزگەوت) نوێژی جەماعەت بکات و لە ڕیزی پێشەوە نوێژی دابەست. کابرا ناوی (موجریم) بوو. مەلای مزگەوت دوای سورەی فاتیحا دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا) تا گەیشتە ئایەتی (أَلَمْ

نُهْلِكِ ٱلأَوَّلِينَ) واتە ئایا ئێمە ئەوانەی لە پێشەوەن بە هیلاکیان نادەین؟ کابرای عەرەب کە گوێی لەو ئایەتە بوو زۆر ترسا. خێرا هاتە سەفی ئاخرەوە. مەلاکە گەیشتە ئایەتی ( ثُمَّ نُتْبِعُهُمُ ٱلآخِرِينَ) واتە لەپاشان ئەوانەی دواوەش وەک ئەوانی پێشەوە بە هیلاک دەدەین. کابرا ئەوەندەی دی ترسا و چووە سەفی ناوەڕاست. مەلاکە گەیشتە سەر ئایەتی (كَذَالِكَ نَفْعَلُ بِالْمُجْرِمِينَ ) واتە هەر بەوجۆرەش لەگەڵ موجریمان ڕەفتار دەکەین. کابرای عەرەب کە گوێی لەو ئایەتە بوو گوتی: بەخوا وادیارە هەر لەمن دەگەڕێن. نوێژەکەی بڕیو ڕایکردە دەرەوە.

*****

دەڵێن:(ئاخوندێکی) شیعە دێتە شاری (سنە). ڕۆژێک دەچی بۆ لای (ئایەتوڵلا) مەردوخ و لە قساندا دەڵێ: ئەوڕۆ سەگێکم دی بە قەبری سونییەکی دا هەڵدەمیزت. ئایەتوڵلا لە سەرەخۆ وەلامی دەداتەوە و دەڵێ: هیچ نیە، لە کۆنەوە شیعە و سوننی ئەو کێشەیان هەبووە.

*****

لە فینلەدە دەڵێن: ئاغایەک ئەسپێکی پێدەبێ، تا دەچێ دەست بە ئاو بگەیینێ ئەسپەکەی دەدزن. ئاغاکە تەماشا دەکا ئەسپەکەی نەماوە و دزراوە دەڵێ. خەڵکینە ئەسپەکەم بۆ بێننەوە ئەگینا وەک باپیرم دەکەم. کابرای دز لە ترسان ئەسپەکەی بۆ دێنیتەوە. دەڵێن، بۆ باپیرت چی کردووە؟ لە وەلامدا دەڵێ، جارێک ئەسپەکەی لێ دەدزن. ناچار بە پێیان دەڕواتەوە بۆ ماڵ.

*****

لەو سالانەی پێشوودا میسری زۆر دەهاتنە عێراق. کوڕێکی گەنجی میسری هاتبۆ سلێمانی. لەبەر دەرکی مزگەوتی گەورە عەڕەبانەی ڕاگرتبوو (سەموون)ی دەفرۆشتن. لەلای خۆی فێری کوردی ببوو، لەباتی ئەوەی بڵێ: گەرمە سەموون، هاواری دەکرد و دەیگوت، کێرمە سەموون، کێرمە سەموون.

*****

حاجی مەلا عەلی وەرماوایی لە سلێمانی گوتی: دوکانی بەقالیم هەبوو. مێوژ، گوێز، کشمیش، قەیسی، بادام، پستە، قەزوان و ئەوجۆرە شتانەم دانابوو. ڕۆژێک پیاوێکی شارەزوری هات لەبەر دەمی دوکانەکەم ڕاوەستا و هەر تەماشای دەکردم. لەپاشان دوو قامکی بەجووت بۆ چاوانم هێنا. گوتم، ئەوە بۆ وادەکەی؟ گوتی، بزانم کوێر نی؟ گوتم نا. گوتی، ئەی کە کوێر نی، ئەو هەموو شتە جوانەت لەبەر دەمە بۆ نایانخۆی؟

*****

دوباره دەڵێن: عەرەبێک چووبووە جەماعەتی نوێژی بەیانی. ئیمامەکە لە دوای سورەی فاتیحا سورەی (بەقەرەی) خوێند. کابرای عەرەبیش زۆر بەپەلە بوو، بەڵام هەرچۆنێک بوو خۆی ڕاگرت تا جەماعەتەکە تەواو بوو. ڕۆژی دوایی ئیمام لە جەماعەتی بەیانی دوای سورەی فاتیحا دەستی کرد بەخوێندنی سورەی (الفیل). کابرای عەرەب گورج نوێژەکەی بڕی و ڕایکرد و گوتی: دوێنێ سورەی (بەقەرە)ی خوێند تا نیوەڕۆیەی پێوە بوو، بەخوا ئەمڕۆ سورەی (فیلە) تا ئێوارەش دەگرێ، جەنابی مەلا.

*****

دەڵێن: کابرایەک نوێژی زۆر دەکردن لە نوێژدا بوو، کۆمەڵێکی لەلا بوون گوتیان: بەخوا پیاوی چاکە و نوێژان زۆر دەکا. کابرا لە نوێژەکەیدا گوتی، دەنا بەڕۆژوشم.

*****

(هیشامی) کوڕی (عەبدولمەلیک)ی کوڕی (مەروان) خەلیفەی بەغدا، دەچێتە حەج و پاش حەج، ڕۆژێک لە(مەکە) دەڵێ. ئەسحابەیەکی پێغەمبەرم بۆ بانگ بکەن چەند پرسیاری لێ دەکەم. دەڵێن، قوربان هیچکام لە ئەسحابەکانی پێغەمبەر نەماون، ئەگەر دەفەرمووی لە تابیعینانت بۆ بانگ بکەین. دەڵێ باشە. دەچن عەرزی (تاووسی یەمانی) دەکەن، دەڵێن خەلیفە داوات دەکا. تاووس دێ بۆلای. کاتێ دەگاتە وێ، بێ پرس و ڕا نەعلەکانی دەردێنێ و لە سەر گۆشەیەکی فەرشیان دادەنێ و سڵاو لە خەلیفە دەکا و بەبێ ئەوەی ناوی بە کونیە بەری و بێ ئیزن دەچێ لە تەنیشتی دادەنیشێ و دەڵێ، هیشام چۆنی؟ خەلیفە لەو کاردەی ئەوەندە نارەحەت دەبێ، کە دەیەوێ ئەمری کوشتنی دەرکا. عەرزی دەکەن و دەڵێن چۆن قوربان! لە حەرەمی خوادا پیاو دەکوژی؟ هیشام ڕوو دەکاتە تاووس و دەڵێ، ئەوە بۆچی وات کرد؟ لە وەڵامدا دەڵێ، چیم کردووە؟ هیشام دەڵێ، نەعلەکانت لە سەر فەرشەکە دانا و لە وەختی سڵاوکردندا بە کونیە ناوت نەبردم و نەتگوت ئەی ئەمیری موسوڵمانان و هاتی بێ ئیجازە لە لام دانیشتی و گوتت هیشام چۆنی؟ تاووس لە وەڵامدا گوتی، یا هیشام! ڕۆژێ پێنج جار لە حزور خوادا نەعل دادەنێم، نە توورە دەبێ و نە لۆمەم دەکا. کە دەشڵێی، نەتگوت (یاأمیرالمومنین) لەبەر ئەوەی هەموو موسوڵمان ئەتۆ بە خەلیفە و ئەمیر نازانن. گوتم باشتر ئەوەیە بە درۆزن دەرنەچم، بۆیە بەناوی خۆت بانگم کردی و بە کونیە ناوم نەبردی، چونکە خوای گەورە پێغەمبەرەکانی بەناوی خۆیان ناو دەبا و دەفەرمووێ: یا(دود)، یا(یحیا)،

یا(عیسا)، بەڵام دوژمنەکانی هەر بە کونیە ناو دەبا و دەفەرمووێ: (تبت یدا ابی لهب)، لەبەر ئەوەش نەوەستام و دانیشتم، چونکە لە حەزرەتی (عەلی)م بیستووە دەیفەرموو: ئەگەر دەتەوێ تەماشای ناو چاوانی دۆزەخیان بکەی، تەماشا ئەو کەسە بکە کە دانیشتووە و خەڵک لە دەورەی بەپێوە ڕادەگرێ. ئنجا هیشام گوتی: ئامۆژگاریم بکە. گوتی لە حەزرەتی عەلیم بیست فەرمووی، دۆزەخ چەند مار و دووپشکی تێدان بەو گەورە و ئامیرانەوە دەدەن کە زوڵم لەخەڵک دەکەن. ئەوەی گوت و هەستا ڕۆیی.

*****

کابریەک ژنێکی زۆرجوانی هەبوو. ژنەکەی زۆرخۆش دەویست، بەڵام بەپێچەوانەی، ژنە کابرای مێردی خۆش نەدەویست و ڕقی لێبوو. ئاخری گەیشتە ئەو ڕادەیەی قسەی ناخۆش بەمێردەکەی بڵێ. ڕۆژێک کابرا ئەوەندە نارەحەت بوو، کە بە ژنەکەی گوت: سێ بە سێ تەڵاقت بکەوی ئەگەر قسێکت پێ گوتم. پێت نەڵێمەوە. ژنە ئەو هەلەی قۆستەوە و زوو گوتی، ئەتۆ سێ بە سێ تەڵاقت بکەوی. کابرا داما، چونکە ئەگەر وەڵامی بدایەوە ئەوە تەڵاقی دەکەوت. هەستا هات بۆلای زانای بەناوبانگ (ئەبو جەعفەری تەبەری) و بەسەرهاتی خۆی بۆ گێرایەوە. ئەبو جەعفەر گوتی: بچووە پێی بڵێ، ئەتۆ سێ بە سێ تەڵاقت بکەوی ئەگەر تەڵاقم دای. چونکە ئەگەر ئەوەی لێ زیاد بکەی ئەوە وەڵامیشت داوەتەوە و وەفات بە سوێندەکەشت کردووە و تەڵاقیشت ناکەوی. ئەبو جەعفەر بەو قیلە شەرعە کابرای ڕزگار کرد.

*****

ئافرەتی زیرەک وەک ئەو ئافرەتە دەبێ کە(مەدائینی) باسی دەکات و دەڵێ: جارێک (ئیبنو زیاد) لەگەڵ چەند پیاوێک بە ڕێگەیەکدا دەڕۆن، تووشی کابرایەک دەبن جارییەکی زۆر جوانی لەگەڵ دەبێ، تەماعی تێدەکەن و بە کابرا دەڵێن: ئەو جارییە بەجێ بێڵە. کابرا نایکاتە نامەردی تیروکەوانی پێدەبێ، گورج وەدەست دێ و تیرێک لە یەکیان دەدا، زۆری لێ دەترسن. بە هەموان پەلاماری دەدەن و دەیگرن و جارییەکەی لێ دەستێنن. خەریکی جارییەکە دەبن، ئاگایان لە کابرا نامێنی و کابرا ڕادەکا. تەماشا دەکەن جارییەکە گەوهەرێکی زۆر بەنرخی لە گوارەی گوێی دایە. خەریک دەبن لە گوێی دەربێنن. جارییەکە دەڵێ، ئەگەر دەتانزانی ژێرکڵاوی پیاوەکەم چەند گەوهەری بەنرخی تێدان، پێتان عەیب دەبوو ئەوە لە من بستێنن. بەقسەی ژنەکە بەپەلە وەدوا کابرا دەکەون و پێی دەڵێن ئەوەی لەژێر کڵاوەکەت

دایه داینی. کابرا تیریکی له قەراغ کڵاوەکەی چەقاند بوو، لەترسان لەبیری چووبوو، بە قسەی ئەوان هاتەوە یادی و دەستی بۆ برد و گورج خستییە ژنی کەوان و پەلاماری دان، لەترسانی رایانکرد و جارییەکەش بەو فێڵە خۆی و کابرای رزگارکرد.

*****

گێلەپیاوێک (دە) کەری وەپێش خۆی دابوون. لێی دەخوڕین لە پاشان سواری یەکیان بوو. کە بە سواری حیسابی دەکردن (نۆ) کەر بوون، زۆری بەلاوە سەیر بوو. دابەزی حیسابی کردنەوە (دە)ی تەواو بوون. گوتی ئەگەر بەپێ بڕۆم و کەرێک قازانج بکەم باشتر نیە، لەوەی سوار بم و کەرێک زەرەر بکەم؟ بە پێیان ڕۆی تا بردنیەوە ناو ئاوایی.

*****

گێلە پیاوێکی دی لە (مەلا)یەکی بیست حەدیسی دەخوێندەوە کە کەسێک لە ڕۆژی عەرەفەی مانگی قوربان دا بەڕۆژو بێ وەک ئەوەیە ساڵێک بەڕۆژو بووبێ. ڕۆژی عەرەفە هات و کابرا بەڕۆژو بوو. نیوەڕۆ، ڕۆژوەکەی شکاند و گوتی، شەش مانگم ڕۆژو لە سەرن، با ئەوە وەبەر شەش مانگەکە بکەون و هیچی دیکەم ناوێن.

*****

(ئەسمەعی) دەڵێ: کۆمەڵێک لە (بەنی غەفاریان) سواری کشتی دەبن. لەوکاتەدا بایەکی زۆر توند دێ و زۆر لە کشتی وەرگەڕان دەترسن. یەکێکیان گوتی: فڵان بەندەم لە ڕێگای خوادا ئازاد بێ. ئەوی دی گوتی، فڵانە جارییەم ئازادبێ، ئەگەر لەو بەلایە بەسەلامەتی نەجاتیمان بێ. کابرایەکیان مایەوە گوتی، ئەی خوای گەورە! خۆت دەزانی کە من هیچ عەبد و جارییەم نین ئازادیان بکەم و ئەوە لەبەر ڕەزا و لە ڕێگای تۆدا تەلاقی ژنەکەم بکەوی و ڕزگارمان بکە. خوایە خۆت دەزانی لەوە زیاترم لە دەست نایێت.

*****

دەڵێن، کابرایەک لە شاری بەغدا، ناوی (ئەبوالقاسم) بوو. دوو ساڵ بوو جوتێک سۆلی پینەکراوی لە پێدابوو. ڕۆژێک چووە بازاڕی شوشە فرۆشان. لەوێ دەلاڵێک پێی گوت، ئەبوالقاسم تاجرێک لە شاری حەڵەبەوە هاتووە قوتووە شوشەیەکی پێ یە هەر چواردەورەی زێڕکفتە، ئێستا بازاڕی کەسادە، تۆ لێی بکڕە، من بەینێکی دی بە دووقات بۆت دەفرۆشمەوە. ئەبوالقاسم بەقسەی کرد و لێی کڕی بە شێست دینار و هات بۆ بازاڕ بیفرۆشێ. دەلاڵێکی دی گوتی، ئەبوالقاسم! بازرگانێکی

خەڵکی شاری (نەسیبین) هاتووە عەترێکی زۆر بەنرخی پێ یە بۆی نافرۆشرێ، تۆ لێی بکڕە، من یەک دوو ڕۆژی دیکە بە دوو قیمەت بۆت دەفرۆشمەوە. گوتی زۆر باشە. ئەویشی بە شێست دینار کڕی و لە شوشە بەنرخەکەی کرد و بردییەوە ماڵ و لە سەر ڕەفێکی دانا. بەیانی چوو بۆ حەمام. لەوێ چاوی بە برادەرێکی کەوت. حەمامیان کرد و هاتنەوە ژووری لیباس لەبەرکردنەوە، برادەرەکەی گوتی، ئەبوالقاسم! بەڕاستی سۆڵەکانت زۆر کۆن بوون، ئەوەندەت پینە لێ داون، دیار نیە چۆنیان پێوە دەڕۆی؟ کوڕە خۆ تۆ دەوڵەمەندی. گوتی، باشە بەقسەت دەکەم دەیانگۆڕم، کە خۆی گۆڕی و خەریک بوو بێتەدەرێ، تەماشای کرد لەلای سۆڵەکانی جووتێکی تازە دانراون، بێدەنگ دەپێی کردن و هاتەدەر. تومەز ئەوکاتە قازی بەغدا لە حەمام دەبێ و سۆڵەکان هی ئەو دەبن. کاتێ قازی ویستی بێتە دەر تەماشا دەکات سۆڵەکانی نەماون، گوتی کوڕینە! سۆڵەکەیان بردووم و هیچیان بۆ بەجێ نەهێشتووم. کاتێ تەماشایان کرد سۆڵە کۆنەکانی ئەبوالقاسم لەوێ بوون، ئەوەندەی پینە لێ دابوون هەمووکەس دەیناسینەوە، گوتیان: ئەوە سۆڵی ئەبوالقاسمن. چوون گرتیان و سۆڵەکانی قازیان لێ ستاندنەوە و زۆریان لێدا و زیندانیان کرد.

پارەیەکی زۆریدا تا ڕزگاری بوو. کە هاتەوە بۆ ماڵەوە لە داخان هەڵی گرتن و بردنی دە ڕووباری (دیجلە)ی هاویشتن و گەڕایەوە بۆ بازاڕ. لەولاشەوە کابرایەکی ماسیگر تۆڕی هاویشتە ناو دیجلە و ڕایکێشایەوە، کابراکە سەرنجیدا ئەوە سۆڵەکانی ئەبوالقاسمە لە جیاتی ماسی بە تۆڕەکەوە بوون. گوتی ئەی ئەبوالقاسمی داماو وا دیارە لێی کەوتوونەتە ناو ئاوەکەوە، با بۆی بەرمەڕوە.

کابرا هات زۆری لە دەرگای ماڵی ئەبوالقاسم دا، بەڵام لە ماڵ نەبوو، لە پەنجەرەوە هەڵیدانە ژوورەوە و بەسەر ڕەفەکەدا کەوتن و شوشەکەیان بەردایەوە و شوشە شکا و عەتر ڕژا. کە ئەبوالقاسم هاتەوە و ئەو حاڵەی دی، لە داخان تووڕە بوو گوتی، ئەو سۆڵانە منیان ماڵوێران کرد. شەوێ هەستا پاچێکی بەدەستەوە گرت و دەستی کرد بەچاڵ هەڵکەندن، بۆ ئەوەی وەیان شاری و لەکۆڵ خۆیان بکاتەوە، دراوسێکان کە گوێیان لەو ڕمبەڕمبە بوو وەیان زانی دیواربڕە، خەبەریان لێ دا و گرتیان. ئەوجارەش بە پارەیەکی زۆر ڕزگاری بوو. لەداخان هەڵیگرتن و بردنی خستنیە ناو زێرابی ئاودەستەوە زۆری پێنەچوو بەری زێرابەکە گیراو ئاو پەندی خواردەوە، کە هەڵیاندایەوە چاکی بکەن، تەماشا دەکەن سۆڵەکانی ئەبوالقاسم بەری ئاوەکەیان گرتووە. گرتیان و بردیان بۆلای والی. والی گوتی،

پارەی چاککردنەوەی زێرابەکەی لێوەرگرن و بەری بدەن. پارەکەی دا و لەداخان گوتی، تازە فرێیان نادەم دەبێ هەر لەلام بن.
بردنی لە سەربانی دانان تا وشک وەبن، سەگێک وەیزانی چەرم و گۆشت و ئێسقانە و ڕفاندنی و بازیدا بۆ سەربانێکی دی و لە دەمی کەوتنە خوارێ و بەسەر ئافرەتێکی حامیلەدا کەوتن و ئافرەتەکە کورێکی لەبەر چوو. کە تەماشایان کرد، ئەوە سۆلەکانی ئەبوالقاسمە، گرتیان و بردیان بۆلای حاکم. حاکم گوتی، دەبێ خوێنی بدا. ئەوەی بووی لەخوێنی منداڵەکەی دا و هەستا هات بۆلای قازی و بەسەرهاتی خۆی و سۆلەکانی بەتەواوی بۆ گێڕایەوە و گوتی: جەنابی قازی! هاتوومە خزمەتت کە دوو کەلیمەیەک لەبەینی من و ئەو جوتە سۆلەدا بنوسی، کە لەمرۆ بەدواوە من و ئەو سۆلانە هیچ پەیوەندییەکمان بە یەکترەوە نەماوە. لەمڕۆوە هەرچی کردیان هۆباڵ بەئەستۆی خۆیان و کەس حەقی نیە تاوانی ئەوان بخاتە سەر ئەستۆی من. قازی زۆر پێکەنی و خەڵاتی کرد و گوتی، زۆر باشە. ئەوەیە کە بۆتە زەربولەسەل و دەڵێن لە سۆلەکانی ئەبوالقاسم گرانترە.

*****

(موسلیم و بوخاری) دوو کتێبی حەدیسی زۆر باوەڕپێکراون و چەند زانایەک هاتوون کورتیان کردوونەتەوە و پێ یان دەڵێن: موختەسەری موسلیم و بوخاری. ڕۆژێک کابریەک دەچی بۆلای کتێبفرۆشێک و دەڵێ: قورئانێکی موختەسەرم بدەیە، کابرا وەدەزانی هەروەک موسلیم و بوخاری کورت کراونەتەوە، قورئانیش کورت دەکرێتەوە. کابرای کتێبفرۆش زۆری بەلاوە سەیر دەبێ. لەوکاتەدا یەکێک دێ و دەڵێ: مامۆستا موسلیمێکی موختەسەرت هەیە؟ کابرای کتێبفرۆش ئاماژە بەو کابرایە دەکات، کە گوتبووی قورئانی موختەسەرت هەیە و دەڵێ، بەڵێ: ئەوەتا موسلیمی موختەسەر. جا ئەوەیە کە کورد دەڵێ: قیاسی کەشک لە مەشک ناکرێ.

*****

(سەید ڕەشید) یەکێک لە مورید و سۆفیە ناسراوەکانی شێخی بورهان، زۆر نوکتەباز و لەتیفە گۆ و قسەخۆش بووە.
لەوکاتەدا کە لە (سابلاغ) فەقێ دەبێ و لە مزگەوتی (ڕۆستەم بەگ) دەخوێنی، لەلای زانای بەناوبانگ مەلا حوسێنی سەقزی، میرزا حاجی قادر ناوێک دەچی بۆ (موسکۆ). سەید ڕشید دەڵێ: میرزا! سەعاتێکم بۆ بێنە. دەڵێ باشە. مەلا عەزیزی سەقزیش ڕفیقە فەقێی سەید ڕەشید دەبێ، ئەویش بە میرزا حاجی دەڵێ، میرزا سەعاتێک بۆ منیش بێنە. پارەی سەعاتەکان دەدەن و حاجی دەچێ و دێتەوە. دوو

سەعاتیان بۆ دێنی. یەکی قاپ سپی و یەکی قاپ ڕەش. سەید دەیەوێ ئەوەی قاپ سپی بۆ ئەو بێ. لەبەر ئەوە هەر دوو سەعاتەکە دەخەنە ناو گۆزێیکەوە و بە قورعە ڕایاندەکێشن، بە ڕێکەوت ئەوەی قاپ ڕەش وەبەر سەید دەکەوێ. ئەویش ئەو چوار خشتەکیە دادەنێ و دەڵێ:

بابە حاجی کە سەرم بێ بە فیدای چاوی گەشی
دوو عەدەد ساعەتی هێنابوو بەبێ غەلل و غەشی
ئەمن و کاکی سەقزی هەریەکە دەستێکمان برد
کەچی ئیوی بە سپی هاتەدەر ئیمن بەڕەشی

*****

(مەلا مارفە شەلە) نان و پێخۆری بەسەر سۆ فی و میوانی خانەقای بورهانی دا دابەش دەکرد و بە سەری ڕادەگەیشت. پیاوێکی دیکەش یارمەتی مەلا مارفی دەدا. ڕۆژێک جیرەی سەید ڕەشید دوا دەکەوێ و ئەویش ئەو دوو شیعرە بۆ مەلا مارف دەنێری.

ئەتو سستی ڕەفیقت ئەسپی خۆشڕەو
ئەتو بێداری ئەو کەروێشکی خۆش خەو
وەزیفەم جیرە نانێکە بەگەرمی
ئەگەر زوو پێم نەیەی تۆ، دەچمە زگ ئەو

مەلا مارفە شەلە تورە دەبێ دەڵێ: جارێکی دی ئەمن جیرە نادەم بە سەید ڕەشید. ئەوجار سەید ئەو دوو شیعرەی بۆ دەنێری:

ئەرێ مەعروفی ئەعرەج پیری مەکرۆ
وەزیفەم جیرە نانێکە بەبێ دۆ
لەوەی تورەی گوتومە دەچمە زگ ئەو؟
پەشیمانم لەوەی دوا دێمە زگ تۆ

*****

پیاوێک نازناوی (ئیفتخارالسادات) دەبێ، ڕۆژێک دەچێ بۆ دیتنی سەید ڕەشید و دەڵێ: قوربان! دوعای بەخێرم بۆ بکە. سەید ڕەشید لە وەڵامدا دەفەرمووێ:
دوعات بۆ دەکەم بەبێ زەڕافەت. یاخوا ئیفتیخار دووربێ لە (ئافەت)
شێخ محەمەدی کوڕی شێخی دەفەرمووێ: لە خانەقادا خەریکی دەرس گوتنەوە بووم، ئیفتیخار هات بۆلام و زۆر بەخۆشیەوە ئەو دوو شیعرەی سەیدی دووپات دەکردەوە. منیش گوتم: ئەو شیعرە هی کێ یە؟ لە وەڵامدا گوتی، هەر ئێستا بە

خزمەت سەید رەشید گەیشتتم و داوای دوعام لێکرد و لە وەلامدا ئەو دوو شیعرەی فەرموو. شێخ محەمەد دەڵێ: زانیم تێی نەگەیشتوە. گوتم، زۆر موبارەکە! بەلام ئیفتیخار دوای حالی بوونی زۆر توورە دەبێ و گلەیی لە سەید رەشید دەکات و دەڵێ: من داوای دوعای بەخێرم لێکردووە، کەچی ئەو جنێوی پێداوم. ئەو نارەحەتی و توورە بوونەی ئیفتیخار بۆ سەید رەشید دەگێرنەوە. سەید رەشید دەڵێ: لە وەختی دوعا کردنەکە دا لام وانەبوو کە دوعاکەم قبوڵ دەبێ، بەلام ئێستا دڵنیام کە دوعاکەم گیرابووە.

*****

جارێک کۆمەڵێک لە عەشایری مەنگوڕ دەچن بۆ خانەقا. لەوکاتەدا میوان زۆر دەبن و جێگای نوستن بەش ناکا. ناچار لە حەساری خانەقا جێگایان بۆ چاک دەکەن. سەید رەشید لە دوای نوێژی خەوتنان دەچێ بۆلایان و دەڵێ: کاکە چۆنن؟ هیچو کەم نیە؟ لە وەلامدا دەڵێن: قوربان باشین. سەید دەڵێ: نیگەران مەبن، ئەگەر خۆم پێدادابن نایەڵم بێ لێفە بن.

*****

جارێک چەند نەفەر دەچنە زیارەتێ و دەست دەکەن بە قسان. لە گەرمەی قسانداسەید رەشید بەیەکی لە گەنجەکانیان دەڵێ، دابابەڵێ هەستە فوویەک لەو سەماوەرە بکە بەقەرز. کوڕەکە دەڵێ، جا قوربان، فوو چۆن بەقەرز دەبێ؟ سەید لەسەردخۆ دەڵێ: چۆن نابێ؟ دوایە فووت دەدەمەوە.

*****

ڕۆژێک سەید رەشید دەستنوێژ دەگری و لە ژوری حەوزی خانەقا دێتە دەرێ و تووشی شێخ عەبدوڵلای کوڕە گەورەی شێخ دەبێ. شێخ عەبدوڵلا سەعاتەکەی خۆی بە دەستەوە دەبێ و بە سەید دەڵێ، سەید! هی تۆ چەندە؟ سەید دەڵێ: قوربان! هی من بسینکە. شێخ عەبدوڵلا تورە دەبێ و بە تورەییەوە دەڵێ: لەگەڵ هی من چەندی فەرقە؟ سەید دەڵێ قوربا ن! وەک دەڵێن، هی تۆ قولانجێک درێژترە. ئەوجارە شێخ عەبدوڵلا پتر توورە دەبێ و دەڵێ: کوڕە ئەتۆ بۆ هێندە سەیری، دە دەریهێنە و چاوی لێ کە. سەید زۆر بە لێبراوی دەڵێ، قوربان! باوەڕم پێبکە ئێستا لە حەوزی خانەقا دەرمهێنا و چاوم لێکرد. شێخ عەبدوڵلا بە توورەییەوە سەعاتەکەی دەباخەڵێ دەنێتەوە و دەڕوا.

*****

شێخ محەمەدی کو ڕی شێخ کە زۆر زانا و عالم بوو دەفەرمووێ: بەیانییەکی زوو

چوومە حەوزخانە، تەماشام کرد سەید لەوێ خەریکی دەستنوێژ هەڵگرتنە. منیش دمویست غوسلّی لەش پیسی بکەم. گوتم: کاکە ڕەش! ئەرێ بۆ ئەو بێگارەم لەباتی ناکەی؟ واتە لەجیاتی من غوسڵ بکە. سەید لە وەڵامدا فەوری گوتی: ئەدی بەقوربانت بم بۆ بێگارەکەی دیکەم پێ ناکەی.

*****

دەڵێن: لە مەجلیسێکدا باسی پیاوێکیان دەکرد و دەیانگوت: بەڕاستی ئەو پیاوە موسوڵمانی چاکە، شەو و ڕۆژ خەریکی نوێژو ڕۆژووە. کابرایەک ڕاست بۆوە و گوتی: چۆن بە پیاوی وا دەڵێن پیاوچاک؟ دیارە ئومێدی بە کەرەمی خوا نیە بۆیە ئاوا خۆی عەزاب دەدا.

باسی موناجاتی شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی :

ڕۆژێک شێخ ئەبولحەسەنی خەرقانی دوای نوێژ دەستی کرد بە موناجات و فەرمووی: ئەی خوای گەورە! بەیانی ڕۆژی قیامەت، لەوکاتەدا کە نامەی عەمەلی هەرکەس دەدرێتە دەستی و کردەوەی خۆیان نیشان دەدەن. خۆم دەزانم چ وەڵامێکی عاقڵانە بدەمەوە. بە ئەمری خوا فەوری لە غەیبەوە بانگیان کرد. ئەی ئەبوالحەسەن! ئەوەی لە ڕۆژی مەحشەردا دەیڵێی: ئێستا بیڵێ. شێخ ئەبولحەسەن گوتی: ئەی خواوەندا! کاتێ تۆ منت خستە ڕەحەمی دایکمەوە و دروستت کردم، لە تاریکی بێدەسەڵاتیدا دۆرتخستم، ئینجا کاتێ هێناتمە بازاڕی وجودەوە، مەعیدەیەکی برسیت دامێ، کە لە دایک بووم دەستم کرد بەگریان. وەختێ خستمیانە لانکەوە وەمزانی ئاسودە دەبم، کەچی دەست ولاقیان بەستم و نارەحەتیان کردم. کاتێ عەقڵم پەیدا کرد و دەستم کرد بەقسان گوتم: لەمڕۆوە ئاسودە دەبم، کەچی ناردیانم بۆ قوتابخانە و بە داری ئەدەب دەماریان دەرهێنام و زۆر لە مامۆستا دەترسام. دوای ئەوە شەهوەتت بەسەردا زاڵ کردم و بەهۆی شەهوەتەوە وەسەر شتی دی نەپڕژام، وەختێ لە ترسی زینا و سزای کاری خەراپ ژنم هێنا، ئەولادت دامێ و خۆشەویستی ئەوانت خستە دڵمەوە، لە غەمی نان و پێخۆر و بەرگ و لیباسیاندا تەمەنت بەفیڕۆ دام.

وەختێ لەوەش تێپەڕیم پیری و بێدەسەڵاتیت بەسەردا باراندم و دەرد و ژانی ئەندامەکانی لەشم بوونە سەربار. گوتم کە مردم دەحەسێمەوە، بەڵام دوبارە بەدەستی ئیزڕایل گرفتارت کردمەوە تا بەتیغی بێ حەیف و مەیلی گیانی کێشام. دوای ئەوەی خستمە ناو گۆڕی تەنگ و تاریکەوە، لەو گۆڕە تاریکە و لەو بێدەسەڵاتیەدا دوو زەلامت ناردە سەرم و پرسیان: خوات کێ یە و لەسەر چ دینێکی

و پێغەمبەرت کێ یە؟ لە دوا وەڵامدانەوە، دوبارە ڕاستت کردمەوە و وەبەر خۆت دام بۆ مەیدانی مەحشەر و نامەت دایە دەستم و گو تت (اِقْرَاْ کِتابَکَ) جا ئەی خوای گەورە! وەڵام و نامەی من ئەوەیە کە گوتم. ئەوانە هەموویان بوونە بەرگر و مانیع لەسەر ڕێگای خواپەرستیم و لەبەر ئەو هەموو دەرد و ڕەنج و کوێرەوەریانە شەرتی خزمەتی خوایەتی تۆم بەجێ نەهێنا، بەڵام بۆ تۆ چ دەبێتە ڕێگر کە لە گوناحم خۆش بی و عەفووم بکەی؟ دەڵێن: لە غەیبەوە بانگیان کرد کە ئەی ئەبولحەسەنی خەرقانی! ئەوا بە کەرەم و گەورەیی خۆم بەخشیمی.

*****

(شێخ جەمالەالدینی) کوڕی (نەباتە) لە کتێبی (سەرح العیو ن)دا لە شەرحی ڕیسالەی (ئیبنو زەید)دا دەڵێ: دانەری ئالەتی(عود) ئەبو نەسری فاڕابی بووە. کاتێ لە دروست کردنی بۆوە، ناوی نا(بربت) واتە دەرگای نەجات، یانی لە جیرەی دەرگای بەهەشت وەرگیراوە. ئەو دانەرە چوار تاری بۆ عودەکە داناوە کە هەر یەکەی لە بەرامبەر یەکێک لە چوار تەبیعەتی ئینساندایە. یانی (زیر) لە بەرامبەر (سەودایی)دا و (بەم) لە بەرامبەر (سەفرا) و (مەسانە) واتە دوو تاکی لە بەرامبەر (خوێن)دا و (سێ چوکڵە) لە بەرامبەر (بەڵغەم)دا. هەرکاتێ ئەو چوار تارە ڕێکخران لەگەڵ تەبیعەتی ئینسان دێنەوە و مرۆڤ دڵخۆش دەکەن و نەفسی ئینسان دەچێتەوە سەر یەک حاڵەت.

*****

لە گیلە پیاوێکیان پرسی: ئەرێ بەلای تووە(موعاویە) گەورەترە یان (عیسا)ی کوڕی (مریەم)؟ کابرا ڕووی کردە پرسیارکەرەکە و گوتی: تا ئێستا کەسم لەتۆ بێ عەقڵتر نەدیوە، چۆن پێغەمبەری گاوران وەک کاتبی وەحی پێغەمبەری خۆمان دەبێ؟ (موعاویە) زۆر گەورەترە، جارێکی دی قسەی وا مەکە.

*****

ڕۆژێک کۆمەڵێک موسوڵمان لە جێگایەک کۆبوونەوە و یەکێیان بوو بە پێشنوێژیان و جەماعەتی بۆ کردن. کاتێ (فاتیحا) خوێندن زۆر ڕادەوستا. لە ئاخری نوێژەکەیدا دوو سوجدەی سەهوی برد. گوتیان: ئەوە بۆ سوجدەت برد خۆ سەهوت نەکرد لە نوێژەکەتدا؟ لە وەڵامدا گوتی: ئاخر لە نوێژەکەدا کەوتەوە یادم کە دەستنوێژم نەبوو، بۆیە سوجدەی سەهوم برد.

*****

ڕۆژێک (جوحا) فەردەیەک ئاردی کڕی و دای بە حەماڵێک بۆیان بەریتەوە. کابرا

کوڵە ئاردی هەڵگرت و بەرەو ماڵی جوحا وەڕێکەوت، لە ناو بازڕدا کەوتە ناو قەلەبالغی زۆر و نارەحەت بوو، کوڵە ئاردی بەعەرزێ دادا و ڕایکرد. جوحا بەدوایەوە بوو دەنگی نەکرد و ئاردەکەی هەرچۆنێ بوو بردەوە. دوای چەند ڕۆژ چاوی بە حەماڵەکە کەوت و خۆی لێ شاردەوە. گوتیان، بۆ خۆت دەشاریەوە؟ گوتی نەکا چاوی بەمن بکەوێ و داوای کرێی ئەو ڕۆژەم لێ بکا.

*****

دەڵێن: کابرایەک ماڵێکی زۆر و دایکێکی پیری هەبوو. ڕۆژێک دراوسێکەی پێی گوت: تۆ ماڵێکی زۆرت هەیە، بۆ خێر و خێراتی لێ ناکەی؟ خۆ کە مردی هەمووی دەبێتە میرات و دایکت بەمەلا و ئەولای دادەدا. لە وەڵامدا گوتی: لەوە ناترسم، چونکە دایکم میراتم لێ ناگری. کابرا گوتی چۆن دایکت میراتت لێ ناگری؟ گوتی، ئاخر باوکم پێش مردنی دایکمی تەڵاق داوە.

*****

(مەیدانی) نازناوی ئەبو (فەزل) ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی مەیدانیە و زۆر زانا و ئەدیب بووە و بەرهەمێکی زۆری لێ بەجێ ماوە، وەک (مجمع الامسال). ئەو زانایە، ڕۆژی شەمە بیست و پێنجی ڕەمەزانی ساڵی ٥١٨ی کۆچی لە شاری (نەیشاپور) وەفاتی کردووە و لە گەڕەکەکەی خۆیان کە ناوی (مەیدان) بوو، نێژاوە. شێخی (سیوطی) لە کتێبی (تَبَقاتُ النّجاتْ)دا دەڵێ: شێخی (زەمەخشەری) کە چاوی بە کتێبی (مجمع الامسال) کەوتووە، حەسودی بە مەیدانی بردووە و لەسەر وشەی (مەیدانی) کە ئەوکاتە بە زمانی فارسی بە(میدانی) دەنوسرا، نونێکی زیاد کردووە و بووەتە (نمیدانی) نەمیدانی واتە (نازانی). مەیدانیش کە بەوە دەزانێ دەچێ میمی وشەی (زمخشری) کە ئەوکا تە بە فارسی ئاوا نوسر وە دەکا بە نوون و دەبێتە (زنخشری ) زەنەخشەری واتە ژنفرۆش.

پێغەمبەر فەرموویەتی عەسا هەڵگرتن سوننەتە !

(شەرەفی) کوڕی (قەطام)ی کە زۆر زانا و دانا بووە و هەمیشە لەگەڵ (مەئمون) بووە، دەڵێ: جارێک لە شاری موسڵەوە دەچوومە شاری (ئورفا). کابرایەکم بە وەڵاغەوە لەگەڵ بوو، لە ڕێگادا کوڕێکی خەڵکی شاری (جەزیر)مان لەگەڵ کەوت. پێپێچێک نان و دۆدانێکی ئاو پێ بوو، سواری کەرێک بوو و گۆچانێکی بە دەستەوە بوو. گوتی، تۆ دەزانی زۆربەی موعجیزەکانی حەزرەتی (مووسا) بەهۆی

گۆچانەکەیەوە بووە؟ بە ڕاستی ئەوە بەلامەوە زۆر سەیرە. کابرای هاوڕێم کاری ئاوێی هەبوو و، دوا کەوت. وەلاغەکانمان ماندوو ببوون و نەدەڕۆین، کوڕەکە بە گۆچانەکەی وەلاغەکەی خۆی لێخوڕی و من وەدوا کەوتم: چونکە هیچم پێ نەبوو پێی لێخوڕم. کاتێ گەیشتینە مەنزڵ گوتم: ئەوە یەک لە خاسیەتەکانی گۆچان. ڕۆژی دوایی بەپێ ڕۆیشتین، ئەو کە ماندوو دەبوو خۆی داویشتە سەر گۆچانەکە و دەحەسایەوە، گوتم: ئەوە دوو. ڕۆژی سێیەم تووشی مارێک بووین پەلاماری داین، من ڕامکرد و ئەو بە گۆچانەکەی کوشتی، گوتم: ئەوە سێ. ڕۆژی چوارەم زۆرمان ئارەزو لە گۆشت بوو، تووشی کەروێشکێک بووین، گۆچانەکەی ڕێهالاند، وەبەری کەوت و خستی، گرتمان و سەرمان بڕی، گوتم، خۆزگە ئاگر ببوایە، ئێستا دەمان برژاند. کوڕەکە گورج هێندێک دار و پوشی کۆکردەوە و لە باخەڵی دارێکی دەرهێنا و لە گۆچانەکەی خشاند و ئاگری پێ کردوە و برژاندی و خواردمان. گوتم، ئەوە چوار. پاشان چووینە کاروانسەرایەک زۆر پیس بوو، کوڕەکە گورج ئاسنێکی دۆزیەوە و هێنای بە سەری گۆچانەکەیەوە کرد و ژورەکەی پێ پاک کردەوە گوتم: ئەوە پێنج. پاشان ئاسنەکەی لێکردەوە لە دیوارەکەی چەقاند و جلەکانی پێداکردن گوتم، ئەوە شەش. کاتێ گەیشتینە دووڕیانێک، کە لەوێ لێک جیاوە بینەوە، گوتی ئەم شەو وەرە لای من بمێنەوە. قەبوولم کرد و چوینە ماڵەکەیان. ماڵەکەیان دراوسێی کەنیسەیەک بوو. کوڕە هەتا بەری بەیانی قسەی بۆ کردم، بەیانی دارێکی هێنا و لە گۆچانەکەیدا، وەک ناقووسی کەنیسە دەنگی لێهات. گوتم، ماڵ نەوێران ئەوە تۆ موسوڵمان نی؟ گوتی، بەڵێ، موسوڵمانم، گوتم ئەی بۆ زەنگی کەنیسەت لێ دا؟ گوتی، ئاخر لەبەر باوکم، چونکە ئەو خاچ پەرستە و پیر بووە، دڵی ناشکێنم. پاشان گوتی، ئەگەر چاکەی گۆچانت بۆ باس بکەم وا زوو تەواو نابێ.

*****

شێخی (جامی) زۆر قسەخۆش و نەترس و حازر وەلام بووە. لە سەفەری حەج دا چووتە بەغدا و لەوکاتەدا شێخ جەمالی عێراقی لە بەغدا زۆر بەناوبانگ دەبێ، کە دەزانی شێخی جامی هاتووە لەگەڵ موریدەکانی دەچێ بۆ دیدەنی. پاش چاوپێکەوتنی و گفتوگۆ، شێخ جەمال دەڵێ: (جَمالِ الاٰهی) دیدەم، واتە جەمالی خوام دی، یەعنی شێخی جامی وەک نوور و جەمالی خوایە. لەوکاتەدا شێخ جەمال بەخۆی و موریدەکانیەوە لیباسی تووکی وشتریان لەبەردا دەبێ، فەوری شێخی جامیش دەڵێ: منیش (جِیمالی الاٰهی)م دی، واتە وشتری خوام دی، جەمال بە

ماناى جوانيە، بەلام جيمال بە ماناى وشترە.

*****

شێخی جامی جارێک لە مەجلیسی میرزا بابر دەبێ لە شاری (هەرات). لەوکاتەدا مەلایەک بەناى مەولانا مەزید دێتە مەجلیسەکە. پاش ماوەیەک میرزا بابر لێی دەپرسی و دەڵێ: مەولانا مەزید! دروستە لەعنەت لە یەزید بکەی؟ مەولانا دەڵێ، لەبەر ئەوەی ئەهلی قیبلەیە دروست نیە. ئینجا میرزا بابر ڕودەکاتە شێخی جامی و دەڵێ، قوربان! تۆ دەفەرمووی چی؟ لە وەڵامدا دەڵێ، من دەڵێم، لەعنەت لە یەزید و سەتی دیکەش لە مەزید.

*****

کابرایەک زۆر بە بەخیل و سەقیل و ڕژد و نان نەخۆر ناوبانگی دەرکردبوو. دەچێتە مەجلیسی شێخی جامی و دەیەوێ قسەی نەستەق بکا. لەبەینی قساندا دەڵێ: سێ زێڕم هەیە دەمەوێ شتێکیان پێ بکڕم لێی تێربخۆم و پاشان بیانفرۆشمەوە پارەکەی خۆی بکاتەوە. شێخ دەفەرمووێ: زۆر باشە بچووە قەسابخانە، ورگێک بکڕە و ناوەکەی بخۆە و چەرمەکەی بفرۆشە، پارەکەت بۆ دەکاتەوە.

*****

شێخی جامی لە کتێبی (سامان و ئەبسال)دا ئەو چەند چیرۆکە کورتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە.

دەڵێ: کوردێکی لادێیی لەبەر نارەحەتی ڕۆژگار ڕوو دەکاتە شار، تەماشا دەکات شار زۆر قەڵەباڵغە و وەک (مێش) دەچێ کە پورەی دابێتەوە. یەک دێ و یەک دەڕوا، یەک دەچێتەدەر و یەک دێتە ژورێ. کوڕە، کە ئاوای دی، چوو لە گۆشەیەک دانیشت و لەبەر خۆیەوە گوتی: ئەگەر بچمە ناو ئەو خەڵکەوە لەوانەیە خۆم ون کەم. ئەگەر خۆم نیشانە نەکەم چۆن دەتوانم خۆم بناسمەوە؟ بەڕێکەوت کولەکە ئاویەکی پێبوو هات لە قاچی خۆی بەست تا بەو نیشانەیە ئەگەر خۆی لێ ون بوو خۆی وەناسی. کاتێ ماوەیەک گەڕاو چوو لە پەسیوێکدا نووست. کابرایەکی زۆر زان بەوەی زانی و بە سپایی چوو کولەکەکەی لە قاچی کردەوە و دەقاچی خۆی خست و لە تەنیشت ئەو خەوی لەخۆ خست. کاتێ کوڕە وەخەبەر هات و هاتەوە سەرخۆ، تەماشای کرد کولەکە لە قاچی کابرایەکی دی دایە، زۆری بەلاوە سەیر بوو، بەسەر کابرایدا نەڕاند و گوتی: هەستە ئەی بێ ئەخلاق، سەرم لە کاری خۆم و تۆ سوڕماوە، ئەگەر ئەوە تۆی ئەی من کێم؟ ڕووی کردە ئاسمان و گوتی، ئەی خوای گەورە! داماو و

بێدەسەڵاتم لەو بەڵایە ڕزگارم کە.

*****

دەڵێ: کابرایەکی عەرەب سواری وشتر بوو، خەو تینی بۆ هێنا و لەسەر وشترەکە بەلادا هات و بەربووە و بەخۆی نەزانی و وشتر ڕۆیی. بەیانی کە وەخەبەر هات و ڕوانی وشتر دیار نیە بەخۆی دادا و گوتی: ئەی هاوار بەماڵم و شترەکەم ون بووە، بریا خۆشم لەگەڵ و شترەکە ون بوومایە، بەس نیە تووشی ئەو خەفەتە نەدەبووم و بۆ هەرکوێ دەچوو لەگەڵی دەبووم و ئاوا لێک دوور نەدەکەوتینەوە و هەرکەسێک ئەوی بدیبایە منیشی دەدیتەوە و پێکەوە دەگەڕاینەوە.

*****

دەڵێ: بانگدەرێک جارێک بە(کەڵەشێرێک) دەڵێ: بەڕاستی هیچ بانگدەرێک وەک تۆ کاتی نوێژ نازانی و بە ئەندازەی تۆ لە فەوتانی وەختی بانگ ناترسی، لەگەڵ ئەو هەمووە ئاگاداریەت دەبوو جێگات لەگەڵ کەڵەشێری عەرش بوایە، کەچی دەبینم هەر لە سەرگوێلکان بەدوای مریشکانەوەی. لە وەڵامدا گوتی: لەپێشدا پلە و پایەم زۆر بەرزبوو، بەڵام ئارەزووی نەفس، ئاوا پەستی کردم. ئەگەر وەدوا ئارەزووی نەفس نەکەوتمایە بۆ جێگام سەرگوێلک دەبوو؟

*****

(مەلا)یەک جبەیەکی زۆرکۆنی لەبەردا بوو، پارەی نەبوو بیگۆڕی. ڕۆژێک کابرایەک گوتی: مامۆستا! لەوەتی دەتبینم هەر ئەو جبەت لەبەر دایە، ئەوە بۆ نایگۆڕی؟ مامۆستا لە وەڵامدا گوتی: لەبەر ئەوە نایگۆڕم، چونکە دوو سیفەتی خوای تێدا مەوجودن. یەکیان قەدیمی یە و ئەویتریان بێ وێنەییە. جبەکەی ئەوەندە کۆن و قەدیم بوو.

*****

ڕۆژێک کابرایەکی دەشتەکی دەچێ بۆ وڵاتی میسر، کە بە سواری کەرێ دەگاتە ناو بازاڕ، ئەوەندە قەڵەبالغ دەبێ، کە هەرچەند دەکا ڕێگای ڕۆیشتنی نابێ. دەست دەکا بە لێدانی کەرەکەی. یەکێک دەڵێ: ئەرێ کاکە! ئەوە بۆ وا لەو کەرە بێزمانە دەکەی؟ بۆ بەزەیت پێدا نایە؟ کابرا بە سواری کەرەکەوە خێسەیەکی لێ دەکا و دەڵێ: ئەگەر بمزانیایە خزمی وەک تۆی لێرە زۆرن لێم نەدەدا.

*****

کابرایەکیان لەسەر دزی گرت و بردیان بۆلای قازی . لە دوای ئەوە کە دزییەکەی لەسەر ئیسپات بوو قازی گوتی: کەست لەگەڵ شەریک نەبوو لەو دزییەدا؟ کابرای

دز زۆر بە پەرۆشەوە گوتی: جەنابی قازی بەناشکوری نەبێ لەو زەمانەدا کەسی وا ئەمین دەست دەکەوێ کە پیاو بیکاتە شەریک؟

*****

کابرایێک لە لای قازی شکایەتی لە دراوسێکەی کرد و گوتی: کەرەکەی هیچ گەنم و زەڕاعەتەکەی نەهێشتووم. قازی خاوەن کەری بانگ کرد و داوای لە کابرای خاوەن مەزرا کرد شاهید بێنی. کابرا چوو شاهیدێکی هێنا و شاهیدی دا. خاوەن کەر گوتی، جەنابی قازی! ئەو شاهیدەم قبوڵ نیە، چونکە عەداوەتمان لەبەین دایە. قازی دوو پیاوی خۆی بانگ کرد و گوتی، بچن کەری ئەو پیاوە لە ماڵەکەیان بەستراوەتەوە بەرهەڵدای بکەن و بزانن، ئەگەر چووە ناو زەوی ئەو پیاوە، ئەوە دیارە ڕاست دەکا. کابرای خاوەن کەر گورج وەجواب هات و گوتی: جەنابی قازی! تکات لێ دەکەم مەیاننێرە، چۆن حوکم دەکەی و چ دەفەرمووی قەبووڵە، باخەڵک نەڵێ شاهیدی کەرەکەی پێ لە شاهیدی پیاوێک باشترە.

*****

کابرایەک کەرێکی هەبوو ناوی نابوو (ئەمیر). یەکێک لای قازی شکایەتی لێکرد و گوتی: جەنابی قازی، فلان کەس گاڵتە بە ئەمیر دەکا و ناوی کەرەکەی ناوە ئەمیر. قازی زۆر بە توڕەییەوە ناردی خاوەن کەریان هێنا و قازی گوتی، چۆن بێئەدەبی وادەکەی؟ کابرا زۆرزان بوو بەر لەوەی بێ بۆلای قازی کاری خۆی کردبوو. گوتی، جەنابی قازی، ئەوە چەند ساڵە ئەو کەرەم لە فلان کەس کڕیوە و قەباڵەی خۆی لە ملدایە، کە ئەمیری کوڕی ئەمیرە. ئەگەر باوەڕ ناکەی جەنابت بچۆ تەماشای کە. قازی چوو تەماشای کرد نوشتویەکی لە مل دابوو، کە کردیەوە پڕبوو لە پارە، هەڵیگرت و هاتەوە گوتی: بەڵێ وایە، ڕاست دەکەی، ئەگەر دواوەشی وەک ملی بوایە زۆر لە ئەمیریش گەورەتردە بوو.

*****

ژن و مێردێک ناخۆشی کەوتە بەینیانەوە. پیاوەکە گوتی: هەستە با بچین بۆلای قازی. لەوکاتەدا ژنەکە هەویری دەشێلا. هێندێک ئارد مابوو بیکا بە هەویر، دەپەڕۆیەکی بەست و وەبەر پشتێندی دا و چوون بۆ لای قازی. قازی کە چاوی بە بەرپشتێندی ژنەکە کەوت، وەیزانی پارەیە بۆ قازی هێناوە. هەر دەلیل و بەڵگەیەکی پیاوەکە دەی هێنایەوە قازی ڕەتی دەکردەوە، بەڵام بەڵگەی ژنەکەی زوو قەبووڵ دەکرد و قسەی ژنەکە سەرکەوت. کاتی ڕۆیشتن، ژنە هیچی نەدا بە قازی. قازی ژنەکەی بانگ کردەوە و ئیشارەی بۆ کرد کە ئەوی لەبەر پشتێندی دایە بیداتێ،

ژنەکە کیسەکەی هێنایە دەر و گوتی قوربان! ئاردە، بۆتی بکەم بە نان یان هەر بە ئاردی دەیخۆی؟ قازی تورە بوو گوتی، بەڕیشی ئەو قازیەی داکە کە لەپێش ئەوەدا کە شتەکە وەرگری قەزاوەتەکەی دەکا.

*****

کابرایەک زۆر هەژار و دەستکورت دەبێ. ڕۆژێک عەرز و حاڵێک دەنوسی و دەیبا بۆلای قازی. قازی کە دەیخوێنێتەوە تەماشا دەکا کابرا شکایەتی لە خوا کردووە و داوای حەق و عەدالەت و دادگەری لە قازی دەکا. کابرا نوسیبوی جەنابی قازی تۆ دەزانی خواوەندی گەورە منیشی وەک ئەو هەموو گیانلەبەرانە خەڵق کردووە و ماڵ و منداڵێکی زۆری بە سەردا داوم، بۆچی ڕزقم ناداتێ؟ بۆ وەک ئەو خەڵکەم تەماشا ناکا، چیم لەوان کەمترە؟ جا ئێستا پەنام بۆ تۆ هێناوە دادم بپرسە، چونکە مەحکەمە جێگای عەدل و دادە. قازی بەزەیی پێداهاتەوە و حاکم و کاربەدەستەکانی کۆکردەوە و بە هەموانیان پارەیەکی باشیاندا بە کابرا. قازی گوتی، ئەی باشە بۆ لەلای قازی پێشوو شکایەتت نەکرد؟ لە وەڵامدا گوتی: ئاخر قوربان جەنابی قازی! ئەو لە خوا دەترسا، نەدەوێرا وەڵامم بداتەوە.

*****

جارێک کابرایەکی سەرخۆش دەگرن و دەیبەن بۆلای قازی و دەڵێن: قوربان ئەو پیاوە ئارەقی خواردووەتەوە و زۆر قسەی بێشەرعی دەکا و ئێستاش ئارەق بەری نەداوە، قازی بۆ تاقیکردنەوە پرسیاری لێ دەکا و دەڵێ: (مَنْ رَبُّكَ) واتە خوات کێیە؟ کابرای سەرخۆش لە وەڵامدا پێدەکەنێ و دەڵێ، جەنابی قازی جا کەی ئەوە پرسیاری مەحکەمەیە. ئەوە پرسیاری (نەکیر) و (مونکیر)ە لە گۆڕدا. خۆ جەنابت نەکیرومونکیر نی پرسیاری وا دەکەی. قازی زۆر پێدەکەنی و دەڵێ: هەستە بڕۆ دەرەوە، بەڵام جارێکی دی ئارەق مەخۆوە.

*****

جارێک (مەئمون) لە پیاوێکی خەڵکی شاری (حمس) دەپرسێ: قازییەکەتان چۆنە؟ کابرا لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان زۆر نەزان و نەفامە. مەئموون دەڵێ، لەبەرچی؟ بۆ نەزان و نەفامە؟ کابرا دەڵێ، قوربان! پیاوێک قەرزدارێک دەباتە لای و دەڵێ جەنابی قازی! بیست و چوار درهەمم بە قەرز داوە بەو پیاوە و نامداتەوە. قازی ڕوو دەکاتە کابرای قەرزدار و دەڵێ: ئەو پیاوە ڕاست دەکا قەرزداری؟ کابرا دەڵێ، بەڵێ جەنابی قازی ڕاست دەکا. قازی دەڵێ، ئەی باشە بۆچی نایدەیەوە؟ کابرا دەڵێ، ئاخر جەنابی قازی ئەمن کەرێکم هەیە ڕۆژی چوار درهەمی پێ پەیدا

دەکەم. یەکیان بۆ ماڵەوە خەرج دەکەم و یەکیان بۆ کەرەکە دەدەم بە کا و جۆ و دوو درهەمیش هەڵدەگرم و کۆی دەکەمەوە بۆ ئەو خاوەن قەرزە، بەلام کاتێ دەبێتە بیست و چوار درهەم خۆم لێ ون دەکا و نای بینمەوە، ناچار دەبم کە خەرجیان کەم. جەنابی قازی ئەگەر دەفەرمووی قەرزەکەی بدەمەوە، ئەمر بکە دوازدە ڕۆژی بخەنە بەندیخانەوە تا پارەکەی بۆ کۆ دەکەمەوە و دەیدەمێ. قازی دەڵێ، بیبەن بۆ بەندیخانە. جا قوربان هەرلە جەنابت دەپرسم: ئەوە نەفامی نیە؟ مەئموون زۆر پێدەکەنی و قازی عەزڵ دەکا.

*****

پیاوێک زۆر هەژار و فەقیردەبێ. ڕۆژێک بە کوڕەکەی دەڵێ: ڕۆڵە هەستە ئەو شڕە و بڕانە لە کەرەکە نێ، با لەو ولاتە بڕۆین. کوڕەکە بەقسەی بابی هەرچی دەیان بێ لە کەرەکەی دەنێ و بەرەو ولاتێکی دی وەڕێ دەکەون. لە کێوێک تووشی بارێکە ڕێگایەکی زۆرناخۆش و بەردەلان دەبن. هەموو قاچیان بلۆق دەکا. ڕێگاکە ئەوەندە تەسک دەبێ، کە زۆر بە دژواری کەر و باری تێوە دەچێ. ئەوەی کە بترازایە دەچۆ ناو چۆماوێکەوە. لە ناکاو کەرەکەیان سەرسمی دا و لە شاخێک دا و ترازا. کوڕەکە هاوار دەکا و دەڵێ، یاالله. باوکەکەی لە وەلامدا دەڵێ، ترحێو، بەخوا لەدەست ئەویشدا نەما، تازە کەری چی، ئەویشمان چوو.

*****

کابرایەک زۆر پیسکە و سەقیل دەبێ ڕۆژێک لەگەڵ ژنەکەی لەسەر خەرج و مەسرەفی ماڵ لێیان دەبێ بەهەرا. ژنەکەی تووڕە دەبێ و دەڵێ: (واللەهی) ئەوەندە پیسکەی ئەگەر لەبەر خۆشەویستی (وەتەن) نەبوایە مشک لەو ماڵەدا نەدەما، بەلام چونکە ئەو ماڵە وەتەن و شوێنی لەدایک بوونیەتی، دەچێ لە ماڵی دراوسێکان تێر دەخوا و دەگەڕێتەوە.

*****

(جاحیز) دەڵێ : ڕۆژێک تووشی ئافرەتێکی زۆر جوان بووم گوتم: ناوت چیە؟ لە وەلامدا گوتی ناوم (مەککە)یە. دەڵێ، خۆم ئازا کرد و گوتم ئیجازەم دەدەی (حەجەرو لئەسوەدەکەت) ماچ کەم؟ گوتی: بۆ ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆزت نەبیستووە کە دەفەرمووێ: (لَمْ تَكُونُوا بالِغيهِ إلاّ بِشِقِّ الأَنْفُسِ) واتە نایگەنێ زۆر بەزەحمەت نەبێ. دەڵێ، بەڕاستی جیا لە شەرمەزاری چم پێنەما.

*****

ڕۆژێک پیاوێکی وەناوکەوتو بە سواری تووشی ئافرەتێکی عەبا بەسەری ئەندام

جوان دەبێ و بە ئافرەتەکە دەڵێ: ئەرێ شوت کردووە و مێردت هەیە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: مێردم نیە. کابرا دەڵێ، ئەی باشە، بۆ شو بەمن ناکەی؟ ئافرەتەکە دەڵێ: ئاخر عەیبێکم هەیە، لام وایە بەو عەیبەوە پێم ڕازی نابی. کابرا دەڵێ، ئەو عەیبە چیە؟ دەڵێ، سەرم سپی بووە. کابرا جڵەوی ئەسپەکەی وەردەگێڕێ و دەڕوا. ئافرەتەکە بانگی دەکا و دەڵێ، تکات لێ دەکەم تۆزێک ڕاوەستە. کابرا بەقسەی دەکا و ڕادەوەستێ. ژنە دەچێ بۆلای و سەری نیشان دەدا، وەک (عەبەنوس) ڕەش دەبێ و ئینجا دەڵێ، (واللەهی) تەمەنم نەگەیوەتە بیست و دوو ساڵ، بەلام بۆیە وامگوت، تا بزانی کە ئەوەی ئێوەی پیاو پێی ڕازی نەبن، ئێمەش پێی ڕازی نابین. کابرا دەڵێ، چونکە سەرم سپی بوو، لە شەرمەزاریان ئارەقم ڕشت و ڕۆیشتم.

*****

دەڵێن: ئەمیری ئەو شارەی کە (جوحا)ی لێبوو زۆر ژن خۆشەویست بوو، هەمیشە لەگەڵ ئافرەتی (جاریە) ڕای دەبوارد. جوحا زۆری بەسەردا دەهات و لۆمەی دەکرد، تا وازی پێ لەو هەوەس بازییە هێنا. ڕۆژێک جارییەک لێی دەپرسێ: ماوەیەکە زۆر بێ مەیلی. لە وەڵامدا ئەمیر دەڵێ: جوحا ئەوەندەم بەسەردا هات تا وازی پێ هێنام. جاریەکە گوتی: جەنابی ئەمیر تۆ بە جوحام ببەخشە و بزانە چۆنی تۆڵە لێ دەکەمەوە. ئەمیر ئەو جارییەی بەخەڵات دا بەجوحا. ڕۆژێک جاریەکە بە جوحای گوت، خۆت تەسلیم ناکەم، تا زین لە خۆت نەکەی و لەغاو وەسەر خۆت نەخەی و سواری پشتت نەبم. جوحا زۆری حەز لە جاریەکە بوو بەقسەی کرد جارییەکە بە دزییەوە ناردبووی بەدوا ئەمیردا. کە ئەمیر هات ئەو حاڵەتەی دی گوتی، جوحا ئەوە چیە؟ لە وەڵامدا گوتی، قوربان ئاخر لەترسی ئەوە بو ئامۆژگاریی جەبابتم دەکرد و دەمگوت، نەکات تووشی ئەو حاڵەتە ببی.

*****

پیاوێک چاوی بە ئافرەتێکی جوان دەکەوی زۆری تەماشا دەکا. ئافرەتەکە تێدەگ و دەڵێ: چیت دەوێ؟ بۆ ئەوەندەم تەماشا دەکەی؟ کابرا دەڵێ: زۆرم خۆش دەوێی ئافرەتەکە دەڵێ، ئاخر ئەمن ئاگرپەرستم، کابرا دەڵێ، ئەگەر وەڵامم وەدەی دێنم سەر دینی تۆ. ئافرەتەکە تفێکی لێ دەکا و دەڵێ، دیارە زۆر بێ نرخی، دینی خۆ دەفرۆشی بۆ ئارەزووی نەفس، لاچۆ لەبەر چاوانم.

*****

جارێک لە(مەلتونی) شاعیریان پرسی: ئەوە بۆ لە هێندێک وڵاتی دنیادا دروسن پیاو لە تەمەنی چوارده ساڵیدا ببێ بە مەلیک، کەچی دەڵێن، تا شازدە ساڵی ناب

ژن بێنی. لە وەڵامدا گوتی، چونکە ئیدارە و حوکمی وڵاتێک لە ئیدارەکردن لەگەڵ ژن ئاسان ترە.

*****

دەڵێن برادەری بێوەفا و ژنی بێوەفا لە دنیادا زۆرن. بۆ نمونە دەڵێن: دۆستایەتی دوو پیاو زۆر خۆشبوو، سوێندیان بەسەری یەکتر دەخوارد و بێ یەکتر نەدەژیان. یەکیان ژنەکەی زۆر لەگەڵی چاک بوو و زۆری خۆش دەویست. ژنەکەش وای نیشان دەدا کە ڕۆژێک بێ مێردەکەی ناژی. کابرای مێردی گوتی: دەبێ خۆشەویستی ئەو برادەر و ژنەکەم بەتاقی وەکەم و بزانم ڕاست دەکەن، ئەوەندەیان من خۆش دەوێ؟ بەم مەبەستە لە ناکاو خۆی بەعەرز دادا و خۆی مراند. لەوکاتەدا برادەرەکەی هات و هەرکە چاوی پێکەوت، دەستی کرد بە لەخۆ دان و کاکەڕۆ و گوتی: کاکە گیان بە وەسیەتەکەی ئەو ڕۆژەت زانیم کە تووشی بەلایەک دەبی، بۆیە فەرمووت وەسیەت بێ ئەگەر مردم مەهێڵە ژنەکەم شوو بە کەس بکاتەوە، بۆخۆت مارەی کەوە. ژنەکەشی دەستی کرد بە لەخۆدان و گوتی: وەی بەقوربانت بم بەخوا بەخۆشمی گوت. کابرا ڕاست بۆوە و گوتی وەی بە بابەوەو دە خەمی نیم، ئەگەر ڕاست بکەن. ئەوە بوو خۆشەویستیەکەتان؟

*****

(موغەیرەی) کوڕی (شەعبە) داوای ئافرەتێک دەکا لە خێڵی (بەنیحارس). کوڕێک دەڵێ جەنابی ئەمیرا ئەو ئافرەتە بۆ جەنابت نابێ، چونکە بەچاوی خۆم دیومە پیاوێک ماچی کرد و ئەویش دەنگی نەکرد. (موغەیرە) بەقسەی کوڕەکە وازی لێ هێنا. دوایی هەرئەو کوڕە ئافرەتەکەی خواست. کاتێ (موغەیرە) خەبەری زانی، ناردی بەدوای کوڕەکەدا و گوتی تۆ نەتگوت: بەکەڵک نایە، چاوم لێ بوو پیاوێک ماچی کرد؟ لە وەڵامدا گوتی بەڵێ قوربان، بەڵام پیاوەکە باوکی بوو.

*****

دەڵێن: جارێک لە شاری (ئیسفەهان) سوالکەرێک دەچێتە بەر دەرگای ماڵی پیاوێکی دەوڵەمەند و داوای شتێک دەکا. سوالکەرەکە گوێی لێ دەبێ، خاوەن ماڵەکە بە پیاوەکەی دەڵێ: (موبارەک)! بچۆ بە(قەمبەر) بڵێ، بچێ بە (جەوهەر) بڵێ، بچێ بە (یاقووت) بڵێ، بچی بە سوالکەرەکە بڵێ، خوا بت داتێ. سوالکەرەکە دەست بەرز دەکاتەوە و دەڵێ: ئەی خوای گەورە! بە(جوبرەئیل) بڵێ: بچێ بە (ئیسرافیل) بڵێ: بچێ بە (میکایل) بڵێ: بچێ بە (ئیزرائیل) بڵێ: زوو ڕۆحی ئەو دەوڵەمەندە بەخیلە بکێشی.

*****

(مەلایەک) دەچێ بۆ (مزگەوت) دوو ڕکات نوێژ دەکا. لە تەنیشتی گوێی لە کابرایەک دەبێ، لە باتی بڵێ: (سبحانَ اللّه) دەڵێ: (لاسبحان اللّه). مەلا زۆری بەلاوە سەیر دەبێ، بە کابرا دەڵێ، ئەوە دەڵێی چی، چۆن وادەبێ؟ کابرا دەڵێ ماموستا! ئاخر لە سەرخۆم نەزر کردبوو سیوسێ جار (سبحانَ اللّه) بڵێم، بەلام بە سەهو چووم. چل جارم گوت. ئێستا دەمەوێ زیادیەکەی وەرگرمەوە.

*****

لە کابرایەکی مەسیحی دەپرسن: حەزرەتی (عیسا) گەورەترە، یان حەزرەتی (مووسا)؟ لە وەلامدا دەڵێ: حەزرەتی عیسا مردووی زیندو دەکردەوە، بەلام حەزرەتی مووسا بە شەقەزلەیەک پیاوێکی کوشت. حەزرەتی (عیسا) لە سەرپشتی (لانک) قسەی دەکرد، بەلام حەزرەتی مووسا دوای هەشتا ساڵ لەبەر خوا دەپاڕێتەوە و دەڵێ: (وَاحْلُلْ عُقْدَةً مِنْ لِسانِي يَفْقَهُوا قَوْلِي)، واتە ئەی خوای گەورە زمانم وەگەڕ خە تا لە قسەکانم بگەن. گوتی، جا توخوا هەر لە ئێوە دەپرسم، کامەیان لە کامەیان گەورەترن؟

*****

(شەعبی) دەڵێ: ڕۆژێک چوومە لای جەنابی قازی (شوڕەیح). لەوکاتەدا ئافرەتێک هات، شکایەتی لە مێردەکەی کرد و دەستی کرد بەگریان. منیش زۆرم بەزەیی پێدا هات و گوتم جەنابی قازی! وادیارە زۆری زوڵم لێکراوە، بۆیە ئاوا بەکوڵ دەگری. قازی پێکەنی و گوتی، وا مەزانە. خۆ براکانی حەزرەتی (یوسف)یش کە گەڕانەوە بۆلای باوکیان لەوە خەرابتر دەگریان.

*****

(برایمی) کوڕی (سەبابە) پیاوێکی زۆر چاوچنۆک و بەخیل دەبێ. ڕۆژێک بە (بەشار)، کە بە بەشارە کوێر دەناسرا، دەڵێ: خوا هەرکەسێک کوێر بکا لە پاداشتی کوێرییەکەیدا یان بیر و زەکاوەتێکی زۆری دەداتێ یان دەنگی خۆش، بڵێ بزانم خوا لە جیاتی کوێرییەکەت چی داوە بەتۆ؟ (بەشار) دەڵێ: خوای گەورە ئەو نیعمەتەی داوە بەمن کە نەڕوانمە بەخیل و ڕژدێکی وەک تۆ.

*****

گێلە پیاوێک بەلای (گۆڕستان)ێکدا دەڕوا، تەماشا دەکا ئەوا ئافرەتێک لەسەر گۆڕێک دانیشتووە و دەگری. کابرا زۆری بەزەیی پێدا دێ و دەچێ بۆلای و دەڵێ: خوشکم ئەو مردووە کێ یە بۆی دەگری؟ دەڵێ، مێردەکەمە. کابرا دەڵێ، چکارە بوو؟

ئافرەتەکە دەڵێ، گۆڕهەڵکەن بوو. کابرا دەڵێ، دەک خوا غەزەبی لێگری بۆ نەیدەزانی، هەرکەسێک چاڵ بۆ خەڵک هەڵکەنی بۆخۆی تێدەکەوی دەبا بیخوا، ئەوە دەردی بێ.

*****

کابریەکی عەرەبی دەشتەکی لە بەغدا دەچێتە بارەگای (خەلیفە). کاتێ سفرە رادەخەن و نان دادەنێن، بەرخی بوریانی لەسەر دەبێ، کابرا زۆر بە ئارەزوو بە هەوەس خێراخێرا پارووی لێ دەگری. خەلیفە دەڵێ: کاکە زۆر بەخێرا دەخۆی، دەڵێی لەکاتی خۆیدا دایکی ئەو بەرخە تێی هەڵداوی؟ کابرای عەرەب لەسەرخۆ دەڵێ: جەنابی خەلیفە منیش تەماشای تۆ دەکەم زۆر بەپارێزەوە دەخۆی، دەڵێی لەکاتی خۆیدا دایکی ئەو بەرخە شیری داوێی.

*****

بە کابرایەکی عەرەبیان گوت: ئەگەر دوعای باش دەزانی دوعایەکی بەخێرمان بۆ بکە. گوتی زۆر باشە. دەستی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و گوتی، ئەی خوای گەورە خۆت دەزانی بێ ئەوەی کەس داوات لێ بکا، تۆ بۆخۆت ئیسلامەتیت بۆ هێناین و قەبووڵمان کرد. داوات لێ دەکەین کە لە بەهەشت بێبەشمان نەکەی و تۆش وەک ئێمە قەبووڵی بکە.

*****

کابرایەک تووشی کوڕێکی منداڵکار دەبێ و زۆری وەبەر دڵ دەکەوی و زۆری پێجوان دەبێ. بە کوڕە دەڵێ: خۆزگە کوڕێکی وەک تۆم هەبوایە؟ کوڕەکە وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: جا ئەوە زۆر ئاسانە، بە دەست خۆتە. کابرا دەڵێ چۆن؟ کوڕە دەڵێ، باوکم سواری ژنەکەت بکە کوڕێکی وەک منی دەبێ.

*****

جارێک یەکێک لە سەرلەشکرە گەورەکانی (ڕوسیا) لە لای (ناپیلیون) دەڵێ: زۆر سەیرە، سەربازانی ڕوسیا بۆ وەدەست هێنانی شەرەف و ناموس شەڕ دەکەن، بەلام بە پێچەوانە سەربازی (فەرەنسی) بۆ وەدەست هێنانی ماڵی دنیا شەڕ دەکەن. ناپلیون گوتی: بەڵێ وایە، چونکە هەمووکەس بۆ ئەو شتە هەوڵ دەدات کە نیەتی.

*****

(حەجاجی سەقەفی) بە یەکێک لەو ئافرەتە خارجیانە کە گرتبوونی، دەڵێ: دا سورەتێکم قورئان بۆ بخوێنە. ئافرەتەکە دەست دەکا بە (ئەعوذُباللّٰه و بِسْمِ اللّٰه) و

له پاشان دەڵێ: (إذاجاءَ نصرُاللّهِ والفتحُ و رأيتَ النّاس يخرجون مِنْ دينِ اللّهِ أفواجاً). حەجاج تووڕە دەبێ و دەڵێ وانیه، (يَدخلونَ فی دِينِ اللّهِ)یه. ئافرەتەکە دەڵێ: ڕاستە وابوو داخل بوون، بەڵام بە داخەوە جەنابت هاتی و گێڕاتنەوە.

*****

(ئەبوعەباسی توسی) زۆری ڕق لە ئیمامی (حەنەفی) دەبێ. ڕۆژێک ئیمام دەچێتە مەجلیسی (ئەبوجەعفەری مەنسور). لەوکاتەدا مەجلیسەکە پڕ دەبێ لە خەڵک. توسی بۆ شکاندنی ئیمام دەڵێ: (یا ئەبو حەنیفە)! جاری وایە خەلیفە یەکێک لە ئێمە بانگ دەکا و دەڵێ: دەبێ فلان کەس بکوژی، حوکمی چۆنە؟ ئیمام دەڵێ: ئایا ئەمیری موسوڵمانان ئەمر دەکا بەحەق، یان بەناحەق؟ ئەبوعەباس ناچار دەبێ بڵێ بەحەق. ئیمام دەڵێ: جا کەوایە حەق لە کوێ بوو، بەجێی بگەیەنن. لەپاشان ئیمام ڕوو دەکاتە ئەوکەسەی کە لەلای دانیشتووە و دەڵێ: توسی ویستی من وەبەستێ، بەڵام بەستمەوە.

*****

(ئەسمەعی) دەڵێ: یوسفی کوڕی عومەر، ئەمیری عێراق بوو. جارێک دەبینێ عەرەبێکی کاربەدەستی خیانەتی کردووە. یوسف لەسەر کاری لا دەبات. کاتێ عەرەبەکە دێتە لای، یوسف زۆری لێ تووڕە دەبێ و دەڵێ: دوژمنی خوا، ماڵی خوات بەناحەق خواردووە. کابرا لەسەرەخۆ وەڵام دەداتەوە و دەڵێ قوربان، جا ماڵی خوا نەخۆم ماڵی کێ بخۆم؟ من زۆرم دەورەی شەیتاندا (فلسی) نەدامێ. یوسف زۆر پێکەنی و عەفووی کرد.

*****

لە زەمانی یەکێک لە خەلیفەکانی (عەباسی)دا کابرایەک داوای پێغەمبەرایەتی دەکا. بانگی دەکەن و دەڵێن: تۆ پێغەمبەری؟ دەڵێ بەڵێ. دەڵێن باشە هەر پێغەمبەرێک کە تا ئێستا هاتووە موعجیزەیەکی نواندووە، تۆ چ موعجیزەیەکت هەیە تا ئیمانت پێ بێنین؟ کابرا ڕوو دەکاتە خەلیفە و دەڵێ: جەنابی خەلیفە، ئەمر دەتوانم سەرۆک وەزیر بمرێنم و زیندووی بکەمەوە. وەزیرەکە گورج دەڵێ، قوربان ئەوە من ئیمانم پێ هێنای، یەکێ لەو کەسانە بمرێنە، کە باوەڕیان نیە و ئیمانت پێ ناهێنن.

*****

کابرایەک لە مەجلیسێکدا گوتی: کوڕینە نازانم لەبەرچی من زیاد لەو هەموو خەڵکە ڕیشم لەپێش سەرمدا سپی بووە؟ یەکێکی زۆرزان گوتی: لەبەر ئەوەی ک

چەنەت زۆر لێداوە و عەقڵت کەم بەکار هێناوە، بۆیە ڕیشت لەپێش سەرتدا سپی کردووە.

*****

کابرایەک دەچێ بۆ وڵاتی میسر. لە وڵاتی خۆیاندا بیستبووی خەڵکی میسر زۆر حازرجوابن. کوڕێکی مێرمنداڵی بەلادا دێ. کابرا دەڵێ: با ئەوکوڕە بەتاقی بکەمەوە بزانم ڕاستە حازرجوابن؟ بانگی کوڕەکەدەکات و دەڵێ، کوڕی باش بەڕاستی ئەو شارە سەگی زۆرە. فەوری کوڕە وەڵام دەداتەوە و دەڵێ، بەڵێ ڕاست دەکەی، بەڵام هەموویان غەریبەن.

*****

دەڵێن: کوڕێکی حەوت ساڵە، زۆر زیرەک و زانا و عاقڵ بوو. ڕۆژێک لەناو کۆمەڵێکدا بوو. پیاوێکی پیریان لەناودا بوو، زۆریان باسی کوڕەکە کرد. کابرا پیرە گوتی: زۆرتان بەلاوە سەیر نەبێ. بەزۆری ئەو کەسانەی بەمنداڵی زیرەکن، کە پیر بوون ئەو زەکاوەتەیان نامێنی. فەوری کوڕەکە گوتی: مامە وا بزانم تۆش بەمنداڵی زۆر زیرەک بووی.

*****

جارێک (سوقرات) چەند کەسێک بانگهێشتن دەکا بۆ نان خواردن. یەکێک لە پیاوەکانی تەماشا دەکا خواردنەکە کەم و سادەیە. بە سوقرات دەڵێ: قوربان باشتر وابوو مویالات بە خواردنەکە بکرایە و خۆت بۆ میوانداری میوانەکان ئامادە بکردایە. سوقرات لە وەڵامدا دەڵێ: کوڕم ئەگەر میوانەکان ئاقڵ بن سفرەکە بەشی ئەوانی لەسەرە. ئەگەر ئاقڵیش نەبن زۆر لەوان زیاترە.

*****

ڕۆژێک کوڕێکی گەنج تووشی پیاوێکی قەڵەوی بێ دین دەبێ و دەڵێ: مامە (مزگەوت) لە کوێیە ؟ کابرا دەڵێ: مزگەوتت بۆچیە؟ کوڕە دەڵێ: دەچم نوێژ دەکەم. کابرا دەڵێ: بۆ وەختی خۆت بەفیڕۆ دەدەی؟ تەماشای من بکە، تا ئێستا نەچوومە مزگەوت و نوێژم نەکردووە و ئاواش ساغ و قەڵەوم. کوڕەکە دەڵێ: بەلامەوە سەیر نیە، چونکە ئێمە برخێکمان هەیە تا ئێستا مزگەوتی نەدیوە و لە جەنابیشت ساغتر و قەڵەوترە.

*****

کابرایەک دەچێ بۆلای دوکتۆر و دەڵێ: جەنابی دوکتۆر! (سگم) زۆر دێشی. دوکتۆر دەڵێ: چیت خواردووە؟ کابرا دەڵێ: قوربان کوللێرەیەکی سوتاوم خواردووە.

دوکتۆر (کل) دێنی چاوی کابرا بڕێژێ. کابرا دەڵێ: دوکتۆر، دەڵێم سگم دێشێ نەک چاوم . دوکتۆر دەڵێ، دەزانم ، بەڵام چاوانت دەڕێژم تا لەمڕۆ بەدوا شتی وا نەخۆی.

*****

(شێخ ئەبو فەرەجی جەوزی) ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد. یەکێک عەرزی کرد و لێی پرسی: لەو چوار خەلیفانەی (پێغەمبەر) کامیان گەورەیە؟ فەرمووی: (مَنْ كَانَ بِنْتُهُ فِي بَيْتِهِ) واتە ئەوەی کچەکەی لە ماڵی ئەو دایە، کە هەموانیان دگریتەوەوە. چونکە دوو کچی پێغەمبەر لە ماڵی دووانیان دا بووە و، کچی دووانیشیان حەرەمی پێغەمبەر بوون.

*****

دەڵێن: کابرایەک تووشی عەرەبێکی دەشتەکی بوو دەگریا. گوتی: کاکی عەرەب! ئەوە بۆ دەگری؟ لە وەڵامدا گوتی دەڵێن: (جالووت)یان بە ناحەق کوشتووە بۆیە دەگریم.

*****

کەری کابرایەکی عەرەب دەدزرێ. یەکێک پێی دەڵێ: ئەرێ ڕاستە دەڵێن کەرەکەت دزراوە؟ دەڵێ بەڵێ سوپاس بۆ خوا، کابرا دەڵێ، ئەو سوپاسەی خوای بۆچیە؟ عەرەبەکە دەڵێ، ئەو سوپاسە بۆ ئەوەیە کە بەس نیە لەوکاتەدا سواری نەبووم کە دزرا.

*****

یەکێک لە پیاوە گەورەکانی عەجەم لە نیوەشەوێکدا بانگی بەردەستەکەی خۆی دەکا. کابرا بە خەوالویی ڕاست دەبێتەوە و بە پەشۆکاوی دەچێ بۆلای ئاغاکەی و لە پلەکانان بەردەبێتەوە و زۆری ئەزیەت پێدەگا، بەڵام زوو هەڵدەستێتەوە و دەچێتە لای ئاغاکەی و دەڵێ: چ دەفەرمووی؟ ئاغا دەڵێ: ئەو زرمە چ بوو؟ دەڵێ: قوربان ئەوە بالتۆکەم بوو کەوتە خوارێ. ئاغا دەڵێ، کوڕە ئەوە دەنگی بالتۆ نەبوو. دەڵێ، ئاخر قوربان، بۆخۆشم لەناوی دابوم، بۆیە وای زرمە هات.

*****

دەڵێن: عەرەبێک دەچێ بۆ مزگەوت نوێژ بکا، تا لە نوێژەکە دەبێتەوە پێڵاوەکانی دەدزن. بانگی مجێوری مزگەوتەکە دەکات و دەست دەکا بە لێدانی. گوتیان بۆ لەو فەقیرە دەدەی؟ لە وەڵامدا گوتی. هەمووی خەتای ئەوە، بانگی خەڵکی کرد تا بێن پێڵاوەکانم بدزن.

*****

عەرەبێک (تەڵە)ی دانابوو. ڕێویەک پێوەبوو. کابرا چوو لێی بکاتەوە، ڕێوی گازی لێگرت و بریندار ی کرد. عەرەب پەنای بۆلای مامۆستا برد و گوتی: قوربان سەگ پەلاماری داوم و گرتوومی. دوعایەکم بۆ بەسەردا بخوێنە. پێی عەیب بوو بڵێ ڕێوی گازی لێگرتووە. مەلا دەست دەکات بە دوعا بەسەردا خوێندن و کابرا، دەڵێ مامۆستا دوعای ڕێویشی بەسەردا بخوێنە.

*****

کۆمەڵێک دانیشتبوون باسی هەستانەوەی شەویان دەکرد بۆ شەونوێژ. عەرەبێک لە لایان دانیشتبوو، گوتیان: تۆ بەشەو هەڵدەستیەوە؟ گوتی: (ای واللّه)، واتە بەڵێ بەخوا. گوتیان، چ دەکەی؟ گوتی (اَبولُ وَ اَرْجِعُ اَنامْ)، واتە میز دەکەم و دەنوومەوە.

*****

کابرایەک تەماشای منارەی مزگەوتێکی کرد زۆر بەرز بوو، گوتی: دەبێ کێ ئەوەندە بەرز بووبێ ئەو منارەی دروست کردبێ؟ هاوڕێکەی گوتی: چەند نەزان و نەفامی، لە دنیادا پیاوی وا بەرز کوا هەیە، لەسەر عەرز دروستیان کردووە و ئینجا بەرزیان کردووەتەوە.

*****

کابرایەک سواری کەرێک ببوو، هەرچەند دەیکرد نەدەڕۆیی. دەستی کرد بە لێدانی. یەکێک گوتی: کابرا بۆ وا لەو بێزمانە دەکەی؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەی ئەگەر ناتوانێ بڕوا بۆ خۆی کردووە بە کەر؟

*****

خەتیبی شاری (ئیسفەهان) ناوی (وەکیعی) کوڕی (سیوار) بوو. ڕۆژێک لە خوتبەی (جومعە)دا گوتی: (إِنَّ اللّهَ خَلَقَ السَّمواتِ وَالأَرْضَ فی سِتَّةِ أشْهُرٍ)، واتە خواوەندی گەورە عەرز و ئاسمانی لە ماوەی شەش مانگدا دروست کردووە. یەکێک دوای جومعە گوتی: جەنابی خەتیب، لە شەش مانگدا نەبوو، لە شەش ڕۆژدا بوو. گوتی: (وەڵڵاهی) شەش ڕۆژم زۆر پێکەم بوو، بۆیە کردم بە شەش مانگ.

*****

چەند کەسێک دانیشتبوون. (مونەجیمێک) لە یەکیانی پرسی: کاکە ئەستێرەکەت ناوی چیە؟ گوتی: (التّیس) واتە ناوی بەرانە. خەڵکەکە زۆر پێکەنین و گوتیان، جا خۆ ئەستێرە نیە ناوی بەران بێ. کابرا گوتی، بەڵێ هەیە، چونکە کاتی منالێم، دەیانگوت ئەستێرەکەت ناوی (الجَدّی)یە، واتە بەرخ. دیارە هەتا ئێستا بووەتە

بەران.

*****

کابرایەکی عەرەب دوعای دەکرد و دەپاڕایەوە و دەیگوت: ئەی خوای گەورە!
بەتەنیا لەخۆم خۆشبە. گوتیان: ئەوە بۆ دوعا هەر بۆخۆت دەکەی؟ لە وەڵامدا گوتی:
ئاخر نامەوێ داوای زۆر و تەکلیفی زۆر لەخوا بکەم.

*****

یەکێک لەحەرەمی(مەککە) دوعای هەر بۆ دایکی دەکرد. گوتیان: باشە ئەی بۆ
دوعا بۆ بابت ناکەی؟ گوتی: ئەو پیاوە و بۆخۆی فێڵێک دەبینێتەوە.

*****

کابرایەک لە ماڵی دنیادا کەرێکی هەبوو. کەرەکەی نەخۆش کەوت. کابرا زۆری
پەرۆش بوو، لە سەرشانی خۆی نەرز کرد و گوتی: خوایە ئەگەر ئەو جارە کەرەکە
چاک وەبێ، نەزر بێ لەسەر شانم دە ڕۆژوت بۆ بەڕۆژو بم. کەرەکەی چاک بۆوە و
کابرا وەفای بە نەزرەکەی کرد و دە ڕۆژان بەڕۆژو بوو، کە دە ڕۆژەی تەواو کرد
کەرەکەی تۆپی. کابرا زۆر لە خودا تورە بوو و گوتی: خوایە ئەوەشت پێکردم
گاڵتەت بەمن کرد، بەلام ئەوا رەمەزان لەپێشە. (واللەهی) تۆڵەی ئەو دە ڕۆژەت لێ
دەکەمەوە و دە ڕۆژ لە رەمەزاندا بەڕۆژو نابم لەباتی ئەو دە ڕۆژە.

*****

دەڵێن: کابرایەک بەناوی (ئەبوسالمی) حیکایەت خوان بوو. ڕۆژێک دەچێتەوە
ماڵێ تەماشا دەکا دەرگاکەیان دزراوە. گورج دێ دەست دەکات بە دەرهێنان
دەرگای مزگەوت. خەڵک پێدەزانن و دێن دەڵێن، ئەوە چ دەکەی؟ دەڵێ، ئەو دەرگا
هەڵدەکەنم، چونکە دەرگای ماڵەوەمان دزراوە و خاوەنی ئەو مزگەوتە سوور دەزان
کێ دەرگاکەی منی دزیوە کەچی، دەنگ ناکا.

*****

کابرایەک دوعای دەکردن، دەیگوت: ئەی خوای گەورە! لەوەی دەیزانی لێم خۆ
بە و لە دایکم و ژنەکەشم خۆش بە، گوتیان: ئەی بۆ ناوی باوکیشت ناهێنی؟ گوت
ئاخر من منداڵ بووم کە باوکم مردووە، باوکی خۆم نەدیوە.

*****

پیاوێک نەخۆش دەکەوێ و بە کوڕەکەی دەڵێ: کوڕم هەستە بچۆ هەرچی تا
دمبەگ و عودو کەمانچە و زوڕنا هەیە، کۆیان وەکە و بیان هێنە بۆ ئێرە. گوتی
ئاخر ئەو شتانە حەرامن و تۆ نەخۆشی دەبێ خۆت زۆر لە حەرام بپارێزی. گو

دەزانم کە ئەوانە حەرامن، بەلام بیستوومە (مەلائیکە) ناچنە مالێکەوە کە ئەوانەی تێدابن. جا ئەگەر (ئیزرائیل) مەلائیکە بێ ئەوە ڕوو لە مالی ئێمە ناکا و بەو فێلە لەکۆل خۆمی دەکەمەوە.

*****

دەلێن: گێل ترین پیاو کە بەبێ عەقل و دل ڕەق و نەزان ناوبانگی دەرکردبوو، (بەهائەدین قەرەقووش)، یەکێک لە قائیدە گەورەکانی (سولتان سەلاحەالدینی ئەییوبی) و حاکمی ولاتی(میسر) بووە. جا ئەوەیە کە بۆتە (زەربولمەسەل) و دەلێن: حوکمی قەرەقووشیە. ئەو پیاوە زۆرکاری سەیری کردووە. بۆ نموونە، دەلێن، ئاسنگەر و نالبەندی ولاغ و ئەسپەکانی لەشکرچیەکانی (سولتان سەلاحەالدین)پیاوێکی لە دەست کوژرا. قەرەقووش ئەمری کرد نالبەندەکە بکوژنەوە. یەکێک لە دۆستەکانی چوو بۆ لای قەرە قووش تا شەفاعەتی بۆ بکا، گوتی: قوربان، ئەو پیاوە ئاسنگەر و نالبەندی خۆتانە، ئەگەر بیکوژن کێ هەیە ئەوکارەتان بۆ بکا؟ دەلێن: قەرەقووش تەماشای لای ددرگای کرد، کابرایەک لەوێ سەوەتەی دروست دەکردن، گوتی: ڕاست دەکەی کارمان بەو کابرایە نیە، ئەوە بەرن لە جیاتی ئاسنگەرەکە بیکوژن، کابرایان برد کوشتیان.

*****

جارێکی دیکە جەماعەتێک دەست و لاقی کابرایەک دەبەستن و لە تابووتی دەنێن و دەیانەوێ زیندەبەچالی بکەن. کابرا لەنێو تابووتەکەوە هاوار دەکا و چاوی بە قەرەقووش دەکەوێ و دەلێ: بۆخاتری خوا فریام کەوە، تاوانبار نیم بە ناحەق دەمکوژن. قەرەقووش دەلێ: قسەی قۆڕ، باوەڕت پێ بکەم و ئەو سەت کەسەی کە بەدواتەوەن وە درۆیان بخەمەوە؟

*****

دوبارە دەلێن: جارێک سەربازێک لە سواری وەلاغ دەپەڕێ و بەسەر ئافرەتێکی لادێی دا دەکەوێ. ژنەکە مندالی حەوت مانگەی لەبەر دەچێ. دەچن بۆلای شکایەت لە سەربازەکە دەکەن قەرەقووش بە سەربازەکە دەلێ: ئەو ئافرەتە لەگەل خۆت بەرەوە و زۆرباشی خزمەت بکە تا حەملی نەبێتەوە بە حەوت مانگ مەینێرەوە لای مێردەکەی. بە حالێک تا ژنەکە لە سەربازەکە وەردەگرنەوە.

*****

هەروەها سالێک جوتیارەکانی (میسر) دەچن بۆلای و دەلێن: قوربان! ئەو سال (پەمۆ)مان چاند بوو، بەلام سەرمای ناوەخت هات و هەموو.(سەرما) بردی و لەناو

چوو. داوات لێ دەکەین ئەم ساڵ مالیاتمان لێ نەستێنی. لە وەڵامدا دەڵێ: شتی وا نیە، دەبێ بیدەن، چونکە خەتای خۆتان بووە، ئەگەر خوریتان لەگەڵ چاندایە سەرمای نەدەبوو.

*****

(مەداینی) دەڵێ: پێشنوێژکەرێک سورەی (فاتیحا)ی دەخوێند. کاتێ گەیشتە ئاخری و گوتی: (وَلاالظالّین) بە حەرفی ظاد لەباتی (وَلاالضالّین) بەحەرفی ضاد. یەکێک لە نوێژکەرەکان لە پاشەوەڕا تێی کوتا، ئیمام هاواری کرد و گوتی: (آەضَـهْری)، واتە وای پشتم. یەکی دیکە لە نوێژکەرەکان وەدەنگ هات و گوتی: دەماڵ نەوێران، ضادی (ضَهْری) بەرە بۆ جێگای ظای (ولاالظالّین) و ظێکەی بێنە سەر(ظَهْرتْ)، واتە پشتت چاک دەبێتەوە.

*****

(جاحیز) دەڵێ: کابرایەکی ڕیش درێژی زۆر ئەحمەق مزگەوتی گەڕەکەکەمانی (تەعمیر) کردەوە و خۆی بووە بە بانگدەر و ئیمامی، بەڵام بە زۆری عادەتی وابوو سورەتە درێژەکان بخوێنێتەوە. خەڵکەکە زۆریان پێ ناخۆش بوو، گوتیان: تۆ زۆر درێژە بە نوێژ دەدەی و نازانی نوێژکەرەکان نیوەیان پیر و پەککەوتەن؟ گوتی، زۆرباشە لەمڕۆ بە دواوە سورەتی کورت دەخوێنم ڕۆژی دوایی بانگیداو نوێژی دابەست و سورەی (فاتیحا)ی خوێند و ڕاوەستا. دوایی گوتی، دەڵێن چی سورەی (عەبەسە) بخوێنم ؟ کەس دەنگی نەکرد، پیاوێکی ڕیشدرێژی کەم عەقڵ گوتی: بیخوێنە و ڕزگارمان بکە.

*****

(مەلایەک) دەرسی قورئانی بە کچێک دەگوت: گەیشتە سەر ئەو ئایەتەی کە دەڵێ: (إِنْهُمْ فِي ضَـلالٍ مُبِينٌ). کچەکە حەرفی (ضا)دی بۆ نەدەهات (ضا)دی بە (دال) دەخوێندەوە و لەباتی (ضـلال) دەیگوت (دلال). مەلا چەندجار دووپاتی دەکردەوە و دەیگوت: (فی ضـلالٍ مُبینْ). کچەکە دەیگوت، (دلالٍ مُبین). کابرایەک بەوێدا تێپەڕی گوێی لەو دووانە بوو و گوتی: مامۆستا بۆ ئەوەندە خۆت ئەزیەت دەدەی، لێی گەڕێ با ئەو هەر لەسەر دەلا لی خۆیدا بێ و تۆش لەسەر (ضەلالی) خۆت وەمێنە.

*****

دەڵێن: چەندکەسێک چاویان لە بانگدەری مزگەوتی قازی بوو. بانگی لە پارچە کاغەزێک نوسی بووە و لە ڕووی ئەو دەیخوێندەوە. گوتیان: ئەوە بانگت لە بەرنیە؟

له وەڵامدا گوتی: بچن له قازی بپرسن. هاتن بۆلای قازی و گوتیان: جەنابی قازی، (السلام علیک) قازی دەفتەرێکی له باخەڵی هێنایه دەر و چەند لاپەڕەیەکی هەڵدانەوە و تەماشای لاپەڕێکی کرد و گوتی: (وعلیکم السلام). گوتیان: تازە گلەیی له بانگدەرەکه ناکەین: که قازی ئەوە حاڵی بێ.

*****

کوڕی (ئەبو لەیلا) دەڵێ: به دوای پیاوێکی گەورەی شامەوە بووم، تووشی کاسیێک بوو، سەبەتێکی هەنار لەسەر سەری بوو، پیاوەکه هەنارێکی لێ دزی و دەباخەڵی نا، لەپاشان تووشی فەقیرێک بوو هەنارەکەی دا به فەقیرەکە. لێی دەپرسی: ئەوە بۆ ئەو هەنارەت دزی و دات بەو فەقیرە؟ گوتی: زۆرت بەلاوە سەیرە؟ وادیاره عیلمی حیساب نازانی، به دزییەکه گوناحێکم لەسەر نوسراوە، بەلام بەخێرەکه (دە)م بۆ دەنوسرێ، وەک له قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (مَنْ جاءَ بِالسَّيِّئَةِ لايُجْزىٰ إِلّامِثْلَها وَمَنْ جاءَبِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُأَمْثالِها). دەڵێ گوتم: ئەی ئەوە نازانی که ڕاسته به دزیەکه گوناحێکت لەسەر نوسراوە، بەلام خۆ قەت خێرەکەت لێ قبوڵ ناکرێ؟

*****

به(جالینوس)یان گوت : ئەوە بۆچی ئینسانی خوێن تاڵ و ڕوو گرژ و بەخیل ئەوەندە لەبەر دڵان گرانه؟ له وەڵامدا گوتی: چونکه هەر بارێکی گران بەهەموو ئەندامەکانی لەش هەڵدەگیرێ، بەلام گرانی ئینسانی خوێن تاڵ و سەقیل تەنیا دەبێته بار بەسەر دڵەوە و دڵ هەڵی دەگرێ.

*****

دەڵێن: عەرەبێک لەسەر سفرەی حەجاج حازر بوو، نان خورا و لەپاشان شیرینی یان هێنا. کابرای عەرەب لوقمێکی هەڵگرت خواردی، زۆری پێخۆش بوو. حەجاج دەیزانی کابرای عەرەب ئەو جۆره شیرینیانەی نەخواردوە. گوتی: هەرکەسێک لەپێش مندا لەو شیرینیانه بخوا دەیکوژم. خەڵکەکه دەستیان ڕاگرت. کابرای عەرەب هەر چاوەڕوانی ئەوە بوو حەجاج دەست بۆ شیرینیەکه بەری، دەستی بۆ نەبرد. جارێک له حەجاجی دەڕوانی و جارێک خێسەیەکی له شیرینیەکه دەکرد. لەپاشان گوتی: جەنابی ئەمیر، تکات لێ دەکەم ئاگات له منداڵەکانم بێ و دەستی کرد به خواردن. حەجاج ئەوەنده پێکەنی، بەرەو پشت کەوت و لەپاشان کابرای خەلات کرد.

*****

دەڵێن: یەکێک لە شاعیران قەسیدێکی جوانی لەمەدحی (مودیری) پۆلیس دانا و بۆی خوێندەوە، جەنابی مودیر زۆری پێ خۆشبوو، بەڵام لەباتی ئەوەی خەڵاتی بکا گوتی: مامۆستا، خۆت دەزانی ناکرێ لە ماڵی خۆم شتێکت بدەمێ، چونکە ئێمە تا ئێستا هەر وەرمانگرتووە و نەمانداوە، بەڵام ئەگەر هات و تاوانێکت کرد و هێنایانی بۆ بەندیخانە مایەت بۆ دادەنێم.

*****

کابرایەک بێوەژنێکی هێنا. لەپێش ویدا چوار مێردی دیکەی کردبوو. لەپاش ماوەیەک کابرا نەخۆش کەوت و زۆر هیلاک بوو، ژنەکە چوو لەبن سەری دانیشت و دەستی کرد بە گریان و گوتی: پیاوەکە، خوای نەکردە نەکات بمری، وەسیەتم بۆ بکە لەپاش تۆ چ بکەم؟ مێردەکەی گوتی: پیاوێکی خەراپ پەیدا بکە و شوی پێ بکەو لە کۆ ل خەلکی بکەوە.

*****

بە پیاوێکیان گوت: پێتخۆشە لە چ کاتێکدا بمری؟ لە وەڵامدا گوتی: بۆ دەبێ هەر بمرم؟ گوتیان بەڵێ: هەموو گیان لەبەرێک دەمرێ. گوتی، مادام وایە، پێمخۆشە لە یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزاندا بمرم.

*****

بە کابرایەکیان گوت: ئەرێ پێتخۆشە ژنەکەت بمری؟ لە وەڵامدا گوتی: (ناواللە) گوتیان: بۆ ئەوەندەت خۆش دەوێ؟ گوتی: لەبەر خۆشەویستیانی نیە؟ گوتیان: ئەی لەبەر چییە؟ گوتی: دەترسم لە خۆشیان بمرم.

*****

(عوریانی)، کوڕی (هەیسەم) ئەمیری شاری (کوفە) بوو. ڕۆژێک کابرایەکی (موخەننەس) واتە بیاوێکی شەیتان سیفەتی سەر ژنانیان گرت و بردیان بۆلای. ئەمیر تورە بوو گوتی: ئەی نا پیاو، دەڵێن بەو تەمەنەوە خۆت دەگۆڕی و دەچیە ناو ئافرەتانەوە؟ لە وەڵامدا گوتی: قوربان، ئەو خەڵکە درۆ دەکەن، هەر وەک درۆش بەدەم جەنابیشتەوە هەڵدەبەستن. ئەمیر گوتی: چ درۆیەک دەرحەق بەمن دەکەن؟ گوتی: ئەی قوربان، ئەوە نیە پێت دەڵێن: عوریان، واتە روت. کەچی چل عەبات هەیە. عوریان زۆر پێکەنی و گوتی: برۆ جارێکی دیکە کاری وانەکەی.

*****

دەڵێن: جارێک خەڵکی شاری (کوفە) چوونە لای (مەئمون)ی خەلیفەی عەباسی لە شاری بەغدا، شکایەتیان لە ئەمیری (کوفە) کرد. مەئمون گوتی: پیاو نیە لەو

ئەمیرە عادڵتر بێ. پیاوێکی (کوفی) هەڵیدایە و گوتی: قوربان، ئەوە لە سەرت واجب بێ کە بینێری بۆ شارێکی دی، تا ئەوانیش لە عەدالەتی ئەو پیاوە چاکەت بێبەش نەبن و تۆش شەموو رەعیەتەکانت وەک یەک تەماشا بکەی. مەئمون زۆر پێکەنی و ئەمیری نەقلی کرد.

*****

رۆژێک شێخ (شەقیقی بەلخی) کالەکێکی بۆ ژنەکەی کڕی و بردییەوە. کاتێ ژنەکەی لەتی کرد تاڵ بوو، نەیخوارد و تورە بوو. شێخ گوتی: ئافرەت، لە کێ تورە دەبی؟ لە فرۆشیار تورەی؟ ئەو قەت پێی خۆش نیە شتەکەی خەراپ بێ. ئەگەر لە مەیشتەری و کڕیار تورەی، ئەویش ئەگەر بزانی خەراپە نایکڕی، خۆ خاوەن بێستانیش پێی خۆشە شەتەکەی باش بێ. کە واتە هەر خوا مایەوە کە خالقیەتی. لام وایە لەویش تورە بوون هیچ سوودی نیە.

*****

دەڵێن: جارێک لە شەوێکی زۆر ناخۆش و سەرما و تاریک و تۆفاندا، باڵندە کۆ بوونەوە و چوون بۆلای (کەڵەشێر) و گوتیان: تۆ بانگدەری و دەزانی کەی رۆژ دەبێتەوە، زۆری ماوە دنیا رووناک وەبێ؟ لە وەڵامدا گوتی: کاری من هەر ئەوەیە کە بانگ بدەم، رۆژ بوونەوە بەدەست خوایە.

*****

ژنێکی حامیلە رۆژێک لەگەڵ مێردەکەی باسی منداڵ بوونەکەیان دەکرد. ژنەکە بە مێردەکەی گوت: ئەگەر منداڵەکەم وەک تۆ بچێ خوا دەزانی چیت پێدەکەم. مێردەکەی زۆرناشیرین بوو. مێردەکەشی گوتی: منیش ئەگەر وەک خۆم نەچێ خوا دەزانی چیت لێ دەکەم، دیارە مانای قسەی پیاوەکە زۆر قووڵە.

*****

(عومەری) کوڕی (عەبید) بەلای کۆمەڵێک خەڵکدا رۆیی، تەماشای ـ تێکیان دەکرد، سڵاوی لێکردن و گوتی: ئەوە تەماشای چ دەکەن؟ لە وەڵامدا گوتیان: سوڵتان دەستی کابرایەکی دز دەبڕێ. گوتی: (لاإلَهَإلاّ للّه) دزی ئاشکرا دەستی دزێ بە دزی دەبڕێ.

*****

یەکێک تازە دوکانی سەرتاشخانەی دانابوو، سەروریشی خەڵکی دەتاشی، پیاوێک چوو ریشی بۆ بتاشێ، سەرتاشەکە هەرجارەی کە گوێزانی لێ دەدا دەیبڕی و پارچەیەکی (لۆکە) پێوە دەنا تا خوێنی راگرێ. تا لایەکی ریشی کابرای تاشی،

نیوەی بڕی، خاوەن ڕیش دەستی گرت و گوتی: کاکە بەسە حەقی ئەولایە چەندە بد
دەمێ؟ سەرتاشەکە گوتی: بۆ ڕاناوەستی هەمووت بۆ بتاشم؟ کابرا گوتی: ت
لایەکت بە (لۆکە) چاند، منیش لایەکەی دیکەی بە کەتان دادەچێنم. هەستاو خۆ
ڕزگار کرد.

*****

ئافرەتێک لە شاری بەغدا تەماشای کرد خەڵکێکی زۆر لەسەر شەقامێک ا
شەقامەکانی بەغدا کۆبوونەوە و چاوەڕوانی شتێک دەکەن. چوو لە پیاوێکی پرسی
ئەوە بۆچی کۆبوونەوە؟ کابراگوتی: ئێستا زانای بەناوبانگ عەللامە. (جارولّلە
زومەخشەری) تەشریف دێنێ و هاتووین بۆ پێشوازی کردنی. ئافرەتەکە دەڵێ: ئ
ئەو پیاوە چکارەیە کە شایانی ئەو ڕێز و حورمەتە بێ؟ کابرا گوتی: بۆ ناوبانگ
ئەو زانایەت نەبیستووە؟ ئەو کەسەیە کە تەنیا لەسەر بوونی خوا (هەزار) بەڵگە
هێناوەتەوە. ئافرەتەکە گوتی: ئەی سەلا لە عەقڵتان، ئەگەر عەقڵتان بوایە دەبو
بیکوژن، چونکە ئەگەر هە زار شکی لە بوونی خوادا نەبوایە هەزار بەڵگەی لەسە
وجود و بوونی خوادا نەدەهێنایەوە.

*****

جارێک (ئەبو جەعفەری مەنسور) نامەیەک دەنێری بۆ (زیادی) کوڕی (عەبدوڵلا
حارسی) و تێیدا دەنوسی، (قَسّمْ مالاَبینَ القَواعِدِ وَ العُمْیانِ وَ الاَیْتامِ) وا
هێندێک پارە بەسەر بێوەژنان و نابینایان و هەتیواندا دابەش بکە. (ئەبو زیاد
تەمیمی) کە زۆر بەعەقڵ سووک دەناسرا، ئەو خەبەرە دەبیسێ و دێ بۆلای ئەمی
زیاد و دەڵێ قوربان، هاتووم کە لە (قواعید)انم حیساب بکەی. ئەمیر زیاد دەڵێ
ماڵ نەوێران خەلیفە مەبەستی لە قواعیدان بێوە ژنن. دەڵێ دە لەگەڵ کوێرا
حیساب بکە، ئەمیر زیاد بە کاتبەکەی دەڵێ: لە لستەی نابینایاندا بینوسە. چون
خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: (فَاِنها لاتَعْمَی الاَبْصارُوَلکِنْ تَعْمَ
القُلُوبُ التّی فی الصّدُورِ) واتە زۆر کەس چاویان کوێر نیە، بەلام ئەو دڵەی لە
سینگیاندایە کوێرە. ئێنجا دەڵێ: قوربان، دەبێ کوڕەکەشم لەگەڵ هەتیوان
بنوسی. ئەمیر زیاد بە کاتبەکەی دەڵێ: بینوسە، چونکە کوڕێک باوکی وای هە
هەر هەتیوە.

*****

لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا مامۆستایەک لە شاروێرانێ زۆری خەڵک هاند
بۆ غەزای دژ بە ڕوسان و خۆشی سواری ئەسپێک ببوو لە پێشیانەوە دەڕۆی

کاتێ شەڕ و تەقە دەستی پێکرد و ویزەویزی گوللان پەیدابوو، مامۆستا جڵەوی ئەسپەکەی وەرگێڕایەوە و پێی پێوەنا و دەستی کرد بە دوعا و پاڕانە و دەیگوت: خوایە، ئەوجارەش شەهیدم نەکەی.

*****

ئەوە مەسەلێکی زۆرمەشهورە دەڵێن: لە(ئیبنو هەبەننەق) ئەحمەقترە. چونکە دەڵێ: جارێک کابرایەکی نەزان هێندێکی پارە هەبوو، لەترسی دزان بردی بەردێکی لە دیوار دەرهێنا و ناو دیوارەکەی کۆڵی و پارەکەی تێناو بەردەکەی لەسەر قایم کردەوە و لەسەری نوسی: ئەو دیوارە پارەی تێدانیە. ئیبنو هەبەننەق چاوی بە نوسینەکە کەوت خوێندیەوە و بەردەکەی لابرد و پارەکەی دەرهێنا و بەردەکەی لە شوێنی خۆی قایم کردەوە و لەسەری نوسی ئیبنو هەبەننەق ئەو پارەی دەرنەهێناوە. بەو کارەی دەریخست کە ئەو پارەکەی دەرهێناوە.

*****

(ئەسمەعی) دەڵێ: لە کێوی (عەرەفات) گوێم لە پیاوێکی عەرەب بوو، دوعای دەکرد و لەبەر خوا دەپاڕایەوە و دەیگوت:

أَمَاتَسْتَحِي يا خَالِقَ الْخَلْقِ كُلِّهِم أُناجيكَ وَ أَنْتَ كَرِيمُ
أَتَرْزُقُ أَوْلَادَ اللِّئَامِ كَمَاتَرَىٰ وَ تَتْرُكُ شَيْخاً مِنْ سَراةِ تَمِيم

واتە ئەی خالقی هەموو مەخلوقات! ئەوە هیچ حەیاناکەی ئەمن لەبەرت دەپاڕێمەوە؟ خۆ ئەتۆ سەخاوەت و کەرەمت هەیە. ئەو هەموو ڕزق و ڕۆزیە دەدەی بە ئەولادی کەسانی بەخیل و ڕژد و پیرێکی وەک منیش وەپشت گوێ دەخەی و لێی ناپرسیەوە. ئەسمەعی دەڵێ پێمگوت: ئەوە چ پاڕانەوەیەکە؟ گوتی، لێم گەڕێ، ئەمن دەزانم لەبەر کێ دەپاڕێمەوە، گوتی، پیاوی سەخی کاتێ هەستی دەبزوێ و وەخەبەر دێ کەتۆ جولاندت.

*****

سالان خەڵکی ئالان و باسکی کۆڵەسە و سوێسنیان بارە میوەیان دەبردن بۆ نێو گەورک و مەنگوڕ و موکوریان و بە گەنم دەیانگۆڕیەوە. جارێک کابرایەک سێ بارە ترێ دەبا بۆ ناو مەنگوڕان. کە دەگاتە ناو دێیەک، دەبینێ ئاغای ئەو دێیە لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵک لەسەر بانێک ڕاوەستاون، کابرا سڵاویان لێ دەکا و وەڵامی دەدەنەوە. ئاغایەکیان دەڵێ: کاکی ئالانی، ئەوە چیە پێتە؟ کابرا دەڵێ: قوربان ترێ یە. ئاغا دەڵێ: دەڵێم وەرە ئەو ئاغایەم بۆ بگێ، بارێکت بەگەنم بۆ دەگۆڕمەوە. ئاغایەکەی دی دەڵێ: ناوەڵڵا کاکی ئالانی، تۆ وەرە ئەوەم بۆ بگێ ئەمن دوو بارت بۆ

دەگێڕمەوە. کابرا تۆزێک ڕادەوەستێ و ئینجا دەڵێ: ئیش لەوە باشتر نابێ. بەڵام بێ دڵی هیچکامتان ناکەم. هەر دووکتان دەگێم و سێ بارەکەم بۆ وەگێڕن.

*****

دەڵێن: پیاوێک چووە لای مەلایەک و گوتی: مامۆستا سێ پرسیارم هەیە وەڵامم بدەوە. مامۆستا گوتی: فەرموو بڵێ. کابرا گوتی: پرسیاری یەکەم ئەوەیە دەڵێن خوا لە هەموو جێگایەک حازرە، ئەی بۆ نایبینم؟ پرسیاری دووهەم، ئەگەر ئینسان کارێکی خەراپی کرد بۆ سزای دەدەن؟ خۆ ئینسان بێ ئیرادەی خوا ناتوانی هیچکارێک بکا. کە واتە ئەوەی دەکرێ هەر خوا دەیکا. پرسیاری سێیەم خوا چۆن دەتوانی شەیتان بە ئاگری دۆزەخ بسوتێنی؟ چونکە شەیتان لە ئاگر دروست کراوە و ئاگر چۆن ئاگر دەسوتێنی؟ مەلا نەیکردە نامەردی و (کەرسەک)ە گڵێکی دەست دایە و لەسەری کابرای ڕاکێشا. کابرا زۆری ئەزیەت پێگەیشت و چوو لە دادگا شکایەتی لە مەلا کرد. قازی مەلای بانگ کرد و گوتی: بۆ لەباتی ئەوەی وەڵامی پرسیارەکانی بدەیەوە، لێت داوە؟ مەلا گوتی: جەنابی قازی، ئاخر ئەو کەرسەک لە سەردانە وەڵامی پرسیارەکانی بوو. وەڵامی پرسیاری یەکەمی ئەوەیە، دەڵێ: سەرم ئازاری هەیە، ئازارەکەم نیشان بدا تا منیش خوای نیشان بدەم. وەڵامی پرسیاری دووهەمی بۆ هاتوە بۆ لای جەنابت شکایەت لەمن دەکا؟ خۆ ئەمن بێ ئیرادەی خوا پێمدانەداوە و ئەمن تاوانم نیە. وەڵامی پرسیاری سێیەم. ئەوەیە، خۆ ئەوەی من پێمدادا خاک بوو، خۆ ئەویش لە خاک دروست کراوە، چۆن خاک ئەزیەت بەخاک دەگەیێنی؟ فەرقی ئەو و شەیتان چیە کە لە ئاگر دروست کراوە؟ قازی وەڵامەکانی زۆر پێ جوان بوون و گوتی: بابە هیچتان لە هیچ و بڕۆن بەلای کاری خۆتانەوە.

*****

دەڵێن: شەوێک (مەئمون) خەوی نەدەهات، بانگی وەزیرە زاناکەی کرد و گوتی: خەوم نایە قسەیەکی خۆشم بۆ بکە. وەزیرەکەی گوتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان، دەڵێن جارێک (کوندێکی) (موسڵی) دەچێ بۆ خوازبێنی کچی (کوند)ێکی (بەسرا)یی بۆ کوڕەکەی. کاتێ خوازبێنی لێ دەکا، باوکی کچەکە دەڵێ: ئەوە دامێ، بەڵام دەبێ حەقە مارەیی سەت باغە کۆن و کەلاوەی ڕوخاو بێ. کوندە موسڵی یەکە لە وەڵامدا دەڵێ: بەخوای ئێستا توانای ئەو حەقە مارەییەمان نیە، بەڵام سەبرمان لێ بگرە، ئەگەر خوا تا ساڵێکی دی تەمەنی گەورەی وڵاتەکەمان درێژ بکا، ئەوە ئامادەین سەت و پەنجاش بدەین. مەئمون بەو چیرۆکە زۆر وریا بۆوە و وەزیری خەڵات کرد و ڕووی کردە دائیەرەوەری.

*****

پیاوێک دەڵێ: جارێک لە سەفەرێک ڕێگام کەوتەماڵێک. کە چووم سڵاوم کرد، ئافرەتێک هات بەخێرهاتنی کردم و نانی بۆ دانام و دەستم کرد بە نان خواردن. لەوکاتەدا مێردەکەی هاتەوە و گوتی: ئەوە کێ یە؟ ژنەکەی گوتی: میوانە، کابرا تورە بوو و گوتی: یاخوا بەخێر نەیە من میوانان ڕاناگرم. کابرا دەڵێ، هەستام ڕۆیشتم. ڕۆژی دوایی لە گوندێکی دی چوومە ماڵێک سڵاوم کرد، ئافرەتێک هات گوتی: چ کارەی، گوتم میوانم، گوتی، برۆ میوانان ڕاناگرین. کابرا دەڵێ: زۆرم برسی بوو. لەوکاتەدا مێردەکەی هاتەوە کە چاوی پێکەوتم. زۆری بەخێرهاتن کردم. کە بیرم لەو دوو ماڵە کردەوە، پێکەنینم هاتێ. کابرا گوتی: بەچی پێدەکەنی؟ باسی ژن و مێردەکەی ڕۆژی پێشوو و ئەمڕۆم بۆ گێڕایەوە. گوتی، ئاخر ژنی کابرای دوێنێ خوشکی من بوو، مێردەکەشی برای ژنەکەی منە.

*****

دەڵێن: شەوێک قازییەک کتێبی دەخوێندەوە، گەیشتە جێگایەک نوسرابوو، هەرکەسێک سەری چووک بێ و ڕیشی درێژ، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە زۆر ئەحمەقە. بە ڕێکەوت قازی بۆخۆی، سەری بچووک و ڕیشی درێژ بوو. لەبەرخۆیەوە گوتی: دیارە ناتوانم سەرم چوک وەکەم، بەڵام خۆ دەتوانم ڕیشم کورت وەکەم و وەبەر ئەو تاقمە نەکەوم. زۆری هەوڵدا مەقاستی دەست نەکەوت، ناچار نیوەی ڕیشی دەدەستی گرت و نیوەکەی تری وەبەر گڕی چرا دا، کە بی پڕوزێنی. کە ڕیشی ئاگری گرت، تینی بۆ دەستی هێنا و ڕیشی لە ترسان بەردا و هەمووی سووتا. قازی زۆر نارەحەت و خەجاڵەت بۆوە، چونکە ئەوەی کە لە کتێبەکەدا نوسرابوو لەسەرخۆی ئیسپات بوو.

*****

دەڵێن: کابرایەک پارەیەکی لێ دەدزرێ و شکی لە چەند کەسێک دەبێ و دەیان با بۆلای حاکم. حاکمەکە زۆر وریا دەبێ. کاتێ بانگیان دەکا هەموویان حاشا دەکەن. حاکم بە پیاوێکی بەردەستی دەڵێ: بچۆ چەند داری ڕاستی یەک میتریم بۆ بێنە. کە دارەکانی بۆ دێنی. هەر دارەی دەدا بە یەکێک لەو کەسانەی کە خاوەن پارەکە شکی لێ بوون و شکایەتی لای حاکمی لێکرد بوون. حاکمەکە گوتی: ئەو دارانە بەرنەوە ماڵی خۆتان و بەو نیشانەوە کە نیشانەم کردوون بەیانی بۆم بێننەوە، ئەوەی پارەکەی دزی بێ دارەکەی بستێک درێژ دەبێ. ئەوەی دزییەکەی کردبوو لەترسان بستێکی لێ بڕیەوە. بەیانی زوو هێنایاننەوە، لەوەڕا ئاشکرابوو کە ئەو

دزیویەتی.

*****

پیاوێک هەموو ڕۆژێک شەش نانی دەکڕی. یەکێک لێی پرسی: ئەوە بۆ ڕۆژێ شەش نان دەکڕی، چیان لێ دەکەی؟ لە وەڵامدا گوتی: یەکیان جیا دەکەمەوە و یەکیان فڕێدەدەم و دووانیان بۆ پاشەڕۆژ دێڵمەوە و دووەکانی دیکەش بە قەرز دەدەم. کابرا گوتی: حاڵی نەبووم بۆم ڕوون کەوە. گوتی، ئەوەی جیای دەکەمەوە بۆخۆم دەیخۆم. ئەوەی دەڵێم فڕێی دەدەم ئەومیە کە دەیدەم بە خزمان. ئەو دووانەی کە دەڵێم بۆ دواڕۆژیان دێڵمەوە، دەیاندەم بە دایک و بابم. ئەو دووانەی کە دەڵێم بەقەرزیان دەدەم دەیاندەم بە دوو کوڕەکانم.

*****

شاعیرێک شیعرێکی زۆرجوانی بۆ پیاوێکی دەوڵەمەندی بەخیل و ڕژد دانا و بردی بۆی خوێندەوە تا شتێکی بداتێ. کابرا شیعرەکەی زۆر پێخۆش بوو، بەڵام هەرچەند کردی دڵی نەهات هیچی بداتێ. گوتی: ئێستا هیچ پارەم بەدەستەوە نیە، بەیانی وەرە گەنمی چاکم هەیە، باراشێکت بۆ تێدەکەم. کاکی شاعیر بەیانی چوو سڵاوی کرد و کابرا گوتی: بۆچی هاتووی؟ شاعیرەکە گوتی، لەسەر وەعدەکەی دوێنێ هاتووم. کابرا گوتی، مامۆستا دیارە زۆر بێعەقڵی. تۆ دوێنێ بەو دوو شیعرە دڵی منت خۆشکرد و منیش لە پاداشتیدا دڵی تۆم خۆشکردەوە، دەنا گەنمم لەکوێ بوو؟

*****

زانایەک دەڵێ: بەلامەوە شتێکی زۆر غەریبە کە فەقیری ئەوەندە ناخۆشە. کەچی هێندێک لە زانایان مەدحی فەقیریان کردووە و لە دەوڵەمەندیان بە باشتر داناوە. دەڵێ: لام وایە هەر لەبەر دڵی داماوان ئەوەندەیان پێ هەڵگوتووە، یان وەک ڕێوییەکەیان بەسەر هاتوو کە دەمی نەدەگەیشتە ترێ و دەیگوت ترشە. ئەوانیش نەیانتوانیوە خۆیان دەوڵەمەند بکەن، ناچار مەدحی فەقیریان کردووە. بۆ نموونە، (ئەبوبەکری خوارەزمی) لە مەدحی فەقیریدا دەڵێ: فەقیری خەسڵەتی چاکی زۆرن. یەکەم فەقیر لە دنیا و قیامەتدا باری سووکە، دووەم جیران و دراوسێ بەخیلی پێوە نابەن و تەماعی تێناکەن. سێیەم لە ئاخری مانگی ڕەمەزاندا کەس چاوی لە زەکات و سەرفترەی نیە.

چوارەم لە جەژنی قوربانداا، قوربانی لەسەر نیە. پێنجەم لە بەهاراندا کەس چاوی لە فرۆ و ماست و دۆی ئەو نیە. شەشەم لەکاتی سەرخەرمانان کەس ناچێتە

سەر جۆخینی و بە نابەدڵی بگەڕێتەوە. حەوتەم پایزان چاوەڕوانی مێوژ و گوێزی لێ ناکەن. دەڵێ، فەقیر وەک مزگەوەت وایە دەبێ هەر بۆی بەری و هیچت ناداتێ. جا ئەو زانایە دەڵێ: ئەمن نازانم بۆچی دەڵێی فەقیری لەگەڵ زوربەی زانایان و شاعیران لە دایک دەبێ. لە سەتی (نەوەت و نۆ)یان فەقیرن و قەت پارەیان نیە.

*****

دوو پیاو لەسەر تایەک خورما لێیان بوو بە شەڕ و چوون بۆلای قازی شکایەتیان کرد. قازی داوای شاهیدی لێکردن. یەکیان چوو شاهیدی هێنان و شاهیدیاندا. قازی رووی کردە شاهیدێکیا ن و گوتی: دەزانی ئەو تایە خورمایە چەندی خورما تێدا؟ کابرای شاهید زۆر وریا بوو گوتی: بۆ جەنابی قازی، ئەوە سی ساڵە جەنابت لەو مزگەوتەدا قەزاوەت دەکەی، دەزانی چەند داری تێدان؟ قازی هەرچەند خەجاڵەت بۆوە، بەڵام زۆر پێکەنی و شاهیدیەکەی قەبووڵ کرد.

*****

یەکێک پارەی بە ئەمانەتی لەلای پیاوێک دانا. کاتێ چوو داوای کردەوە، کابرا حاشای لێکرد و گوتی پارەی چی؟ چوو بۆلای (هەیاسی) کوڕی (موعاویە) کە زۆر زیرەک بوو، شکایەتی لێکرد. هەیاس بانگی کردن و کابرا حاشای لێکرد. هەیاس گوتی: لەچ جێگایەک پارەکەت دایە؟ گوتی لە فلان جێگا. گوتی لەو جێگایە هیچی لێ بوو؟ کابرا گوتی بەڵێ دارێکی لێبوو. هەیاس گوتی: هەستە بچۆوە بۆلای دارەکە، بەڵکو لەبیرت چوبێتەوە، لەوێت شارد بێتەوە. کابرای خاوەن پارە هەستا چوو بۆلای دارەکە. هەیاس رووی کردە کابرا و گوتی: بەعەقڵی تۆ گەیوەتە لای دارەکە؟ گوتی، نەخەیر. هەیاس گوتی: ناپیاوی خاین، ئەگەر لەگەڵی لە لای دارەکە نەبووی، چون دەزانی. خاوەن پارەکە هاتەوە، هەیاس گوتی: وەرە ئیقراری بە پارەکەت کرد. پارەکەی بۆ کابرا هەستاندەوە.

*****

هەیاس رۆژێکی لەناو خەڵکێکی زۆر دانیشتبوو. پیاوێک بەلایاندا تێپەڕی، هەیاس گوتی کوڕینە! ئەو پیاوە غەریبە و خەڵکی شاری (واسیتە) و غولامێکی رەشی لێ ون بووە، بەدوای دادەگەڕێ. کاتێ کابرایان بانگ کرد و لێیان پرسی: وابوو. بە(هەیاس) یان گوت : ئەوە چۆنت زانی؟ لە وەڵامدا گوتی: بەوەی کە بەملاو ئەولایدا دەڕوانی زانیم غەریبەیە. تەماشام کرد تۆزی شاری (واسیتی) پێوەبوو، زانیم خەڵکی وێیە. کە دەگەیشتە لای رەش پێستەکان، زۆری تەماشا دەکردن. بەوەش را زانیم کە غولامی رەشی ون بووە.

دزیویەتی.

*****

پیاوێک هەموو ڕۆژێک شەش نانی دەکڕی. یەکێک لێی پرسی: ئەوە بۆ ڕۆژێ شەش نان دەکڕی، چیان لێ دەکەی؟ لە وەڵامدا گوتی: یەکیان جیا دەکەمەوە و یەکیان فرێدەدەم و دووانیان بۆ پاشەڕۆژ دێڵمەوە و دووەکانی دیکەش بە قەرز دەدەم. کابرا گوتی: حاڵی نەبووم بۆم ڕوون کەوە. گوتی، ئەوەی جیای دەکەمەوە بۆخۆم دەیخۆم. ئەوەی دەڵێم فڕێی دەدەم ئەوەیە کە دەیدەم بە خزمان. ئەو دووانەی کە دەڵێم بۆ دواڕۆژیان دێڵمەوە، دەیاندەم بە دایک و بابم. ئەو دووانەی کە دەڵێم بەقەرزیان دەدەم دەیاندەم بە دوو کوڕەکانم.

*****

شاعیرێک شیعرێکی زۆرجوانی بۆ پیاوێکی دەوڵەمەندی بەخیل و ڕژد دانا و بردی بۆی خوێندەوە تا شتێکی بداتێ. کابرا شیعرەکەی زۆر پێخۆش بوو، بەڵام هەرچەند کردی دڵی نەهات هیچی بداتێ. گوتی: ئێستا هیچ پارەم بەدەستەوە نیە، بەیانی وەرە گەنمی چاکم هەیە، باراشێکت بۆ تێدەکەم. کاکی شاعیر بەیانی چوو سڵاوی کرد و کابرا گوتی: بۆچی هاتووی؟ شاعیرەکە گوتی، لەسەر وەعدەکەی دوێنێ هاتووم. کابرا گوتی، مامۆستا دیارە زۆر بێعەقڵی. تۆ دوێنێ بەو دوو شیعرە دڵی منت خۆشکرد و منیش لە پاداشتیدا دڵی تۆم خۆشکردەوە، دەنا گەنمم لەکوێ بوو؟

*****

زانایەک دەڵێ: بەلامەوە شتێکی زۆر غەریبە کە فەقیری ئەوەندە ناخۆشە. کەچی هێندێک لە زانایان مەدحی فەقیریان کردووە و لە دەوڵەمەندیان بە باشتر داناوە. دەڵێ: لام وایە هەر لەبەر دڵی داماااوان ئەوەندەیان پێ هەڵگوتووە، یان وەک ڕێوییەکەیان بەسەر هاتوو کە دەمی نەدەگەیشتە ترێ و دەیگوت ترشە. ئەوانیش نەیانتوانیوە خۆیان دەوڵەمەند بکەن، ناچار مەدحی فەقیریان کردووە. بۆ نموونە، (ئەبوبەکری خوارەزمی) لە مەدحی فەقیریدا دەڵێ: فەقیری خەسڵەتی چاکی زۆرن. یەکەم فەقیر لە دنیا و قیامەتدا باری سووکە، دووەم جیران و دراوسێ بەخیلی پێوە نابەن و تەماعی تێناکەن. سێیەم لە ئاخری مانگی ڕەمەزاندا کەس چاوی لە زەکات و سەرفترەی نیە.

چوارەم لە چەژنی قوربانداا، قوربانی لەسەر نیە. پێنجەم لە بەهاراندا کەس چاوی لە فرۆ و ماست و دۆی ئەو نیە. شەشەم لەکاتی سەرخەرمانان کەس ناچێتە

سەر جۆخینی و بە نابەدڵی بگەڕێتەوە. حەوتەم پایزان چاوەڕوانی مێوژ و گوێزی لێ ناکەن. دەڵێ، فەقیر وەک مزگەوەت وایە دەبێ هەر بۆی بەری و هیچت ناداتێ. جا ئەو زانایە دەڵێ: ئەمن نازانم بۆچی دەڵێی فەقیری لەگەڵ زوربەی زانایان و شاعیران لە دایک دەبێ. لە سەتی (نەوەت و نۆ)یان فەقیرن و قەت پارەیان نیە.

*****

دوو پیاو لەسەر تایەک خورما لێیان بوو بە شەڕ و چوون بۆلای قازی شکایەتیان کرد. قازی داوای شاهیدی لێکردن. یەکیان چوو شاهیدی هێنان و شاهیدیاندا. قازی ڕووی کردە شاهیدێکیا ن و گوتی: دەزانی ئەو تایە خورمایە چەندی خورما تێدا؟ کابرای شاهید زۆر وریا بوو گوتی: بۆ جەنابی قازی، ئەوە سی ساڵە جەنابت لەو مزگەوتەدا قەزاوەت دەکەی، دەزانی چەند داری تێدان؟ قازی هەرچەند خەجاڵەت بۆوە، بەڵام زۆر پێکەنی و شاهیدیەکەی قەبووڵ کرد.

*****

یەکێک پارەی بە ئەمانەتی لەلای پیاوێک دانا. کاتێ چوو داوای کردەوە، کابرا حاشای لێکرد و گوتی پارەی چی؟ چوو بۆلای (هەیاسی) کوڕی (موعاویە) کە زۆر زیرەک بوو، شکایەتی لێکرد. هەیاس بانگی کردن و کابرا حاشای لێکرد. هەیاس گوتی: لەچ جێگایەک پارەکەت دایە؟ گوتی لە فلان جێگا. گوتی لەو جێگایە هیچی لێ بوو؟ کابرا گوتی بەڵێ دارێکی لێبوو. هەیاس گوتی: هەستە بچۆوە بۆلای دارەکە، بەڵکو لەبیرت چوبێتەوە، لەوێت شارد بێتەوە. کابرای خاوەن پارە هەستا چوو بۆلای دارەکە. هەیاس ڕووی کردە کابرا و گوتی: بەعەقڵی تۆ گەیوەتە لای دارەکە؟ گوتی، نەخەیر. هەیاس گوتی: ناپیاوی خاین، ئەگەر لەگەڵی لە لای دارەکە نەبووی، چون دەزانی. خاوەن پارەکە هاتەوە، هەیاس گوتی: وەرە ئیقراری بە پارەکەت کرد. پارەکەی بۆ کابرا هەستاندەوە.

*****

هەیاس ڕۆژێکی لەناو خەڵکێکی زۆر دانیشتبوو. پیاوێک بەلایاندا تێپەڕی، هەیاس گوتی کوڕینە! ئەو پیاوە غەریبە و خەڵکی شاری (واسیتە) و غولامێکی ڕەشی لێ ون بووە، بەدوای دادەگەڕێ. کاتێ کابرایان بانگ کرد و لێیان پرسی: وابوو. بە(هەیاس) یان گوت : ئەوە چۆنت زانی؟ لە وەڵامدا گوتی: بەوەی کە بەملاو ئەولایدا دەڕوانی زانیم غەریبەیە. تەماشام کرد تۆزی شاری (واسیتی) پێوەبوو، زانیم خەڵکی وێیە. کە دەگەیشتە لای ڕەش پێستەکان، زۆری تەماشا دەکردن. بەوەش ڕا زانیم کە غولامی ڕەشی ون بووە.

*****

پیاوی عاقڵ شت ئاشکرا دەکا. جارێک پیاوێک پارەی لێ دزرا. شکی لە چەند کەسێک بوو. چووە لای (والی) شکایەتی لێکردن. ئەوان حاشایان کرد. والی گوتی: زۆرباشە حاشا بکەن، بەڵام دەبێ بە ڕیز بەدوای یەکتردا بچن دەو ژوورە تاریکەوە. گوریسێکی تێدایە دەستی پێدابێنن و وەرنەوە دەرەوە. گوتی: ئەگەر دز دەستی لێ بدا بەدەستیەوە دەنوسێ و بەری نادا. چوون هەموانیان دەستیان پێداهێنا، یەکیان نەبێ. کە هاتنەدەرەوە، ئەو نەبێ دەستی هەموان سوور ببوو، بەڵام ئەو لەترسان دەستی لێ نەدا بوو، بەوەرا زاندرا، کە ئەو دزیوەتی.

*****

جارێک لە سەحرای عەرەبستان ئیمامی (حەنەفی) زۆری تینی دەبێ. لەوکاتەدا تووشی عەرەبێک دەبێ و دەبینێ دۆدانەیەکی ئاو پێیە، داوای ئاوی لێ دەکا، کابرای عەرەب دەڵێ: بە پێنج درهەم. ئیمامی حەنەفی ئاوەکەی لێ دەکڕێ و تێری لێ دەخواتەوە. دوای ماوەیەک بە کابرا دەڵێ: حەزت لە (قاوتوو) نیە؟ کابرا دەڵێ: بەڵێ زۆرم حەز لێ یە. ئیمام زۆری پێدەبێ، تا کابرا تێر دەخوا دەیداتێ. لەپاشان کابرا لە تینوان تینی بۆ دێ و داوای ئاو دەکا. ئیمام ئاوەکەی پێ دەفرۆشێتەوە بە پێنج درهەمەکەی خۆی.

*****

دوبارە دەڵێن: کوڕێک حەزی لە کچێک دەکرد، هەستا چوو بۆلای ئیمامی حەنەفی و عەرزی کرد، دەچمە داخوازی کچی فلان کەس، بەڵام لەبەر ئەوە پارەم کەمە دەزانم نامدەنێ چارەم چیە؟ ئیمام لەسەرەخۆ دەڵێ: کوڕم، ئالەتەکەت بە دوازدە هەزار دەفرۆشی؟ کوڕەکە زۆر شەرمەندە دەبێ و دەڵێ: نەخێر قوربان، نایفرۆشم. ئیمام دەڵێ: دەبچۆ بۆ داخوازی و ئەگەر گوتیان کێ دەناسی؟ بڵێ: ئیمام. کوڕە ناردی بۆ خوازبێنی و گوتیان، ئەتۆ کێ دەناسی؟ داخوا دەوڵەمەندی؛ فەقیری؟ گوتی، ئیمامی حەنەفی دەمناسێ؟ چوون پرسیاریان کرد، ئیمام فەرمووی: بەڵێ شتێکی هەبوو بە دوازدە هەزاری نەیدا. وەیان زانی زۆر دەوڵەمەند و کچەکەیان دایێ.

*****

ژنێکی جوان بە مێردە ناشیرینەکەی گوت: مژدە بێ لێت، هەر دووکمان دەچینە بەهەشتێ. مێردەکەی گوتی: چۆن دەزانی؟ گوتی: بەوەرا کە خوای گەورە جوانێکی وەک منی بە نسیب تۆ کردووە شوکرانەی خوای لەسەر دەکەی و ناشیرینێکی وەک

تۆشی تووشی من کردووه پێت ڕازیم و خۆم ڕاگرتووە.

*****

جوولەکەیەک تەماشای کرد لە ڕۆژی مانگی ڕەمەزاندا موسوڵمانێک ئەوە گۆشت دەبرژێنی. چووە بۆلای و داوای یەک دوو کوتی لێکرد. کابرای بەناو موسوڵمان گوتی: ئاخر گۆشتی سەربڕاوی ئێمە بۆ ئێوە حەڵاڵ نیە. کابرای جوولەکە گوتی: ئاخر منیش لەناو جوولەکاندا وەک تۆ لە ناو موسوڵمانانداد و قەیدی نیە بێنە بمدەیێ.

*****

دەڵێن: شاعیرێک زۆر فەقیر دەبێ و هیچی لە ماڵەکەیدا نەبووە، کەچی هەرکە دەچووە دەرەوە دەرگای ماڵەکەی دادەخست. گوتیان: ئەوە بۆ کە دەچێیە دەرەوە دەرگاکەت دادەخەی؟ لە وەڵامدا گوتی: ئاخر تا خەڵک نەزانی کە فەقیرم.

*****

لە (عەباسی) مامی (پێغەمبەر)یان پرسی: تۆ گەورەتری یان پێغەمبەر؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەو لەمن گەورەترە، بەڵام ئەمن لەپێش ئەودا لە دایک بووم. چەند بە ئەدەبی وەڵام داوەتەوە؟

*****

(ئەبولعەینا) کورێکی زۆر زانا و شاعیر و حازر وەڵام بووە و زۆری شت لێ ڕیوایەت دەکەن، بۆ نمونە دەڵێن: جارێک گوێی لە پیاوێک بوو دەیگوت: (مَذْهَبی اَلجَمْعُ بَيْنَ الصَّلاتَيْنِ). واتە مەزهەبی من ئەوەیە، دوو وێژ پێکەوە کۆ دەکەمەوە. (ئەبو لعەینا) فەوری گوتی: (سَدَقْتَ تَجْمعُ بَيْنَهُما بِتَرْكِيما) واتە ڕاست دەکەی، پێکەوە یان تەرک دەکەی. جارێک کابرایەک گوتی: (یا ئەبو لعەینا) ماتَقوُلُ فی فلا ن و فلا ن؟ واتە ئەی ئەبولعەینا، سەبارەت بەفلا ن کەس و فیسار کەس دەڵێی چی؟ لە وەڵامدا گوتی: (هُما كَالْخَمْرِ وَ الْمَيْسِرِ اِثْمُهُما اَكْبرُ مِنْ نَفْعِهِما) واتە ئەوان وەک شەڕاب و قوومارن، گوناحیان لە قازانجیان پترە.

*****

جارێک (ابن الجهم) پێی دەڵێ: (یافاجر) واتە ئەی فاسق. لە وەڵامدا دەڵێ: (وضرَبَ لَنا مَثَلاً و نَسِیَ خَلْقَه) واتە وێنەی بە من هێنایەوە و خۆی لەبیر چوو.

*****

جارێکی دی خەلیفەی بەغدا(المتوکل ) دەڵێ: ( ئەبولعەینا)! دەزانی کە سەعدی کوڕی (عەبدولمەلیک) زۆر بە تۆ پێدەکەنی. لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان! خوای گەورە لە

قورانی پیرۆز دا باسی کردوه. ئەوە نیە دەفەرمووێ: (إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ)، واتە موجریمەکان بە ئیماندارەکان پێدەکەنن.

*****

(حەجاجی سەقەفی) مێرد و کوڕ و برای ژنێکی گرتبوون. ژنەکە چوو بۆلای داوای لێکرد، لێیان ببوورێ. حەجاج گوتی: لەبەر خاتری تۆ یەکیان عەفوو دەکەم، خۆت سەرپشک بە کامیان دەڵێی تا بۆت ئازاد بکەم. ئافرەتەکە گوتی: قوربان، مادام وایە، براکەم ئازاد کە، چونکە مێرد و کوڕ دەبنەوە، بەڵام برا نابێتەوە. حەجاج قسەکەی زۆر پێ جوان بوو، گوتی لەبەر ئەو قسە جوانەت، ئەوە هەرسێکم عەفوو کردن.

*****

دەسەلاتدارێک بە سواری و بە فیزەوە، رۆژێک چووە ناو مەزرایەک تەماشای کرد جوتیارێک کاسە سەرێکی بە دەستەوەیە تەماشای دەکا. بە گاڵتە دەڵێ: ئەی بێعەقڵ، ئەوە بۆ هێندە لەو کاسە سەرە دەڕوانی و فکری لێ دەکەیەوە؟ پێم بڵێ چ نیازێکت هەیە. کابرا زۆر لەسەرەخۆ دەڵێ: تێدەفکرم تا بزانم داخوا ئەوە کاسەی سەری ئەمیرێکی وەک تۆیە یان هی جوتیارێکی وەک من، بەڵام تا ئێستا بۆم روون نەبۆتەوە. ئەمیرەکە بە وەلامی کابرا زۆر خەجاڵەت دەبێتەوە. ئاوساری ئەسپەکەی دەگری و گورج دەڕوا.

*****

کۆمەڵێک دانیشتبوون باسی گەرانی زەویان دەکرد بە دەورەی رۆژدا. کابرایەک گوتی: نازانم لەوەتی من لە دایک بووم، قەت نەمدیوە زەوی بگەڕێ. یەکێک گوتی: تەمەنت چەندە؟ گوتی شێست ساڵ. کابرا گوتی: کورەی زەوی لەپێش لە دایکبوونی تۆدا دەگەڕا، بەڵام لەبەر گرانی و ناوچاوانی تاڵی تۆ، لەوەتی تۆ لە دایکبووی جووڵە ناکاو رەق راوەستاوە.

*****

(ئەبو ئیسحاق) دەڵێ: ئەگەر گوتیان: دەولەمەند فەقیر بوو، باوەڕ بکە. ئەگەر گوتیان: زیندووێک مردووە، باوەڕ بکە، بەڵام ئەگەر گوتیان ئەحمەقێک عاقڵ بووە، باوەڕ مەکە، چونکە ئەحمەقی خووی بە دەوقەت تەرک ناکرێ.

*****

پیرێژنێک دەچێ بۆلای قەسابێک و دەڵێ: وەستا گیان بایی درهەمێکم گۆشتی باش و ناسک بۆ بکێشە و ناوی خۆشتم پێ بڵێ، بۆ ئەوەی کە چوومەوە ماڵێ،

دوعای بەخێرت بۆ بکەم. کابرای قەساب گۆشتەکەی بۆ دەکێشی و دەیداتێ و دەڵێ، دایە گیان ناوم (ڕایکێشە)یە. پیرێژن دەچێتەوە گۆشتەکەی لێ دەنێ. کاتێ دایدەگری و دەست دەکا بەخواردنی، تەماشا دەکات زۆر چیرە. لەبەر چیری و پیری و لە جەری گۆشتەکە، هەر بە ددانان ڕادەکێشی و دەڵێ: لەعنەت لە ڕاکێشی. نەیدەزانی وەبەر خۆی دەکەویتەوە.

*****

(مەئمون) جارێک لەناو شاری، پیاوێکی نەزانی ئەحمەقی لەگەڵ دەبێ. چاوی بە جارییەکی جوان دەکەوی دەیفرۆشن. جاریەکەی کڕی و بە کابرای گوت: ناوێکی خۆش هەڵبژێرە تا ئەو جارییە بەو ناوەوە بانگ بکەم. کابرا گوتی: قوربان ناوی بنێ (جامیعی دیمشق) و ناوی لەوە خۆشتر نیە.

*****

جارێک کابرایەک دایکی دەمری و دەچێ بۆلای دوکاندارێک و دەڵێ کاکە دە میترم خامی سپی بۆ لێوەکە، بۆ کفنی دایکم. دوکاندارەکە خەریک دەبێ بۆی لێ وەکا، کابرا دەڵێ: کاکە خامەکە کۆنیش بێ قەیدێ ناکا، چونکە دایکم بە ڕەحمەت بێ تا مابوو هەر کۆنەی لەبەر دەکرد.

*****

دەڵێن: پیاوێک لە کانی زێڕدا کاری دەکرد. ماوەیەک بوو هیچی نەدەدیتەوە. ڕۆژێک دەستی کرد بە دوعا و پاڕانەوە و گوتی: خوایە زەردەکم بۆ بنێری تا نارەحەتی و ماندووبوونەکەم لاچێ. لەپاشان دەستی کردەوە بە کارکردن و لەناکاو دووپشکێکی زەرد پێوەیدا. ئەو شەوە تا بەیانی خەوی لێ نەکەوت. فەقیرە هەرهاواری دەکرد و دەیگوت: قەیدێ ناکا با وام بەسەر بێ، خەتای خۆم بوو، ناوی زەردەکەم نەهێنا.

*****

جارێک مامۆستا مەلا سەید قادری نەمەشیری بەڕەحمەت بێ، لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی هەمیشە دار سیغارەکەی بە دەمەوە بوو، کەچی لێی دەگەڕا و دەیگوت: ئەوە کوا دارسیغارەکەم؟

*****

دەڵێن: کابرایەک دەچێتەماڵێک و پێی دەڵێن خۆ تۆ دەعوەت نەکراوی. حەقت نیە لەو خواردنە بخۆی. کابرا دەڵێ: سوبحان اللّه، ئەو قسەی ئێوە موخالیفی ئایەتی قورئانە کە دەفەرمووێ، (أَوْبُيُوتِ إِخْوانِكُمْ ) واتە یان ماڵی براکانتان. گوتی ئەی

خوا ئالّێ: (إِنّما المؤمنونَ إخوَة)؟ گوتیان، دەفەرموو. لەپاشان پرسیاریان لێکرد و گوتیان تۆ کام سورەتەی قورئانت بەلاوە عەجایبە؟ گوتی سورەی (مائیدە). گوتیان لە دوای ئەو چ ئایەتێک؟ گوتی ئایەتی (ذَرهُم یأکُلُوا وَ یتمَتَعُوا) گوتیان ئەی لە دوای ئەو. گوتی ئایەتی (آتِنا غداءَنا) گوتیان: ئەی دوا ئەو؟ گوتی ئایەتی (ادخُلوها بِسلامٍ آمنین) گوتیان، دوای ئەو؟ گوتی (ماهُم بِمُخرَجین).

*****

سۆفییەکی ڕیش درێژ زۆر واسواس و حەمبەلی دەبێ. دەچێ بۆلای شێخەکەی و دەلّێ: قوربان نازانم چۆن بە تەواوی لە دەستنوێژدا ڕیشم تەڕ دەبێ؟ شێخ فەرمووی: کە ئاوت بە دەم و چاواندا کرد دەست لە ڕیشت بخە. سۆفی دەلّێ ئاخر قوربان لەوانەیە بەتەواوی تەڕ نەبێ. شێخ دەلّێ: کە وایە هەر لە ئێوارەوە بیخە ناو تەشتێک ئاوەوە تا دەخوسێ.

*****

سالّێک عەرەبێک دەچێ بۆ حەج و لەپێش خەلّکدا خۆی دەگەیێنێتە مالّی (کابە) و توند پەردەی (کاعبە) دەگرێ و دەلّێ: ئەی خوای گەورە تا خەلّک نەهاتوون دەورەت بگرن و سەرقالّت کەن عەفووم بکە.

*****

کابرایەک لە ناو عەرەباندا زۆر بە (شومی) بەناوبانگ بوو. ڕۆژێک پێیان گوت: ئەوە هۆی چیە وا شووم و بەد قودومی؟ لە وەلامدا گوتی: چونکە لە ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەردا لە دایک بووم و لە ڕۆژی وەفاتی حەزرەتی ئەبوبەکردا لە مەمک کراومەوە و لە ڕۆژی وەفاتی حەزرەتی عومەردا خەتەنە کراوم و لە ڕۆژی وەفاتی حەزرەتی عوسماندا ڕاست و چەپی خۆم ناسیوە و لە ڕۆژی وەفاتی حەزرەتی عەلی دا ژنم هێناوە و لە ڕۆژی شەهید بوونی حەزرەتی حوسێن دا کوڕم بووە. ئەوانە بوونەتە هۆی شوومی من.

*****

ژن و پیاوێک زۆرجار شەڕیان دەکرد و ئاشت دەبوونەوە. جارێک زۆر لە یەکتر عاجز بوون و یەک دوو ڕۆژ یەکتریان نەدەدواند. ئاخری شەوێک پیاوەکە داوای کاری شەرعی لە ژنەکە کرد. ژنەکە لە وەلامدا گوتی: بەلەعنەت بی، ئەوەندە زۆرزانی، هەتا ئەمن و تۆ لێمان بوو بەشەڕ و هەرا، داوای کارێکی وام لێ دەکەی بۆ ئاشت بوونەوە، کە نەتوانم لە قسەت دەرچم.

*****

حەزرەتی عومەر زۆر دادگەر بووە. شەوێک بەناو شاری مەدینەدا دەگەڕێ. تەماشا دەکا ڕەشماڵێک هەڵدراوە کە ڕۆژی پێشو لەوێ نەبوو. دەچێتە نزیکی و گوێی لە ناڵەی ئافرەتێک دەبێ. کە زیاتر دەچێتە پێشەوە پیاوێک لەبەر زارکی ڕەشماڵەکە دانیشتووە. دەچێ بۆلای و دەڵێ: ئەتۆ چکارەی؟ کابرا دەڵێ: (بەدویم) واتە عەرەبی دەشتەکیم هاتووم بچمە لای خەلیفەی ئیسلام شتێکم داتێ، حەزرەتی عومەر دەفەرمووێ ئەی ئەو ناڵینە چییە؟ کابرا دەڵێ ئەوە ژنەکەمە بە منداڵ بوونەوەیە. حەزرەتی عومەر دەڵێ: کەسی لە لایە؟ کابرا دەڵێ: کەسی لا نییە. حەزرەتی عومەر بە بێدەنگی دەگەڕێتەوە ماڵ و بە خێزانەکەی کە ناوی (أُمِّ كُلْسُومْ) و کچی حەزرەتی عەلی بوو، دەڵێ: خوا خێرێکی بۆ ناردووی، دەیکەی؟ خێزانەکەی دەڵێ: چ خێرێکە؟ حەزرەتی عومەر دەڵێ: ئافرەتێک بەمنداڵ بوونەوەیە و کەسی لا نیە. خێزانەکەی دەڵێ: ئەگەر پێت باشە با بچین. حەزرەتی عومەر دەڵێ: چی پێویستی ژنە زاوانە هەڵیگرە و مەنجەڵ و ڕۆن و ساواریش بێنە با من هەڵیگرم. بە جووتە دەچن بۆ لای ژن و پیاوەکە. حەزرەتی عومەر بەخێزانەکەی دەڵێ: تۆ بچۆ ژوورەوە بۆلای ژنەکە و بە کابراش دەڵێ: ئاگرێک بکەوە. کابرا ئاگر دەکاتەوە و حەزرەتی عومەر مەنجەڵ وەسەر دەنێ و دەست دەکا بە فوو لێکردنی ئاگرەکە و هەموو ڕیشی دووکەڵاوی دەبێ. تاچێشت پێدەگا، ژنە منداڵی دەبێ.

خێزانی حەزرەتی عومەر دێتەدەرەوە و دەڵێ: ئەی ئەمیری موسوڵمانان مژدە بدە بەو پیاوە کوڕیان بوو. کابرا کە دەزانی ئەوە حەزرەتی عومەرە زۆر خەجالەت دەبێ. حەزرەتی عومەر دەڵێ: ئەی برای عەرەب، ئەگەر کەسێک بوو بە کاربەدەستی خەڵک، دەبێ ئاگای لە وەزعیان بێ، چونکە لە دواڕۆژدا ئەو بەرپرسیارە. لەپاشان حەزرەتی عومەر هەڵدەستی مەنجەڵەکە هەڵدەگری و دەیباتە بەردەمی زارکی ڕەشماڵەکە و دەیدا بە خێزانی، ئەویش دەیبا ژنی کابرای لێ تێر دەکا و دێتە دەرەوە. حەزرەتی عومەر بە کابرا دەڵێ: بچووە ژوورەوە نان بخۆ و بەیانی وەرە بۆ لام. بەیانی دەچێ، ئەوەی پێویست بێ دەیداتێ و بەڕێی دەکاتەوە. جا ئەوەیە عەدالەتی عومەر.

*****

دوبارە شەوێکی دیکە بە شاردا دەگەڕێ. تەماشا دەکا لە ماڵێکدا چرا دایسێ. کاتێ دەچێ لە کەلێنی دەرگاکەیانەوە دەڕوانی، عەرەبێکی ڕەش لە ناو کۆمەڵێکدا ئارەق دەخواتەوە. بە دەرگادا ڕێگای نابێ بۆی بچێ، لە سەربانەوە دەچێتە خوارێ. کە چاویان پێدەکەوێ زۆر دەترسن و قولەڕەشە دەڵێ: ئەی ئەمیری موسوڵمانان

تاوانم کردووه و تۆبه دەکەم، تۆبەم لێ قبوڵ کە. حەزرەتی عومەر دەڵێ: لەسەر ئەو ئارەق خواردنەوەت دارکاریت دەکەم. قولەڕەش دەڵێ: ئەی ئەمیری موسڵمانان بۆ دارکاریم دەکەی؟ خۆ من هەر گوناحێکم کردووە، ئارەقم خواردۆتەوە و تۆبەی لەسەر دەکەم، بەڵام جەنابت هەرئێستا سێ گوناحت کرد. دەڵێ: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: (ولاتَجَسَّسُوا) واتە جاسوسی مەکەن تۆ ئەم شەو کردت. فەرموویەتی: (وَأتوا البُيُوتَ مِنْ أبْوابِها) واتە لە دەرگاوە وەرنە ژوورەوە، تۆ بەسەر بانیدا هاتی. فەرموویەتی: (وَلا تَدْخلوا بُيُوُ تاُغَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتّىٰ تَسْتَأْنِسوُا وَتُسَلِّموُا عَلىٰ أهْلِها) واتە مەچنە ماڵی خەڵک تا نەتانناسن و سڵاویان لێ نەکەن. جەنابت بێ ئەوەی بتناسین و ئیجازەت بدەین و سڵاو بکەی، هاتیە ژوورەوە. لە تۆ دەپرسم ئەوە گوناح نیە؟ دەی ئەو تاقە گوناحەی من بەو گوناحانەت ببەخشە و تۆبەش دەکەم، کە جارێکی دی ئارەق نەخۆمەوە. حەزرەتی عومەر دەستی کرد بەگریان و هاتەدەروە.

*****

کابرایەک بە ناوی (ئەبوڕافیع) دەمری و پاش ماوەیەک دێتە خەوی ژنەکەیەوە، دەڵێ: فلان سەڕراف دەناسی؟ ژنەکەی دەڵێ بەڵێ. کابرای مێردی دەڵێ دوو سەد درهەمی منی لایە، بەیانی بچۆ وەریگرەوە. ژنە بەیانی زوو دەچێ و دەڵێ: ئەم شەو لە خەومدا مێردەکەم گوتی دوو سەد درهەمی لای تۆیە و گوتی بێمە لات و لێت وەرگرمەوە. کابرا گوتی، دایکم ئەمن قەت موعامەلەم لەگەڵ نەکردووە و هیچم لە لا نیە. ئافرەتەکە چوو بۆ مزگەوت. لەوکاتەدا هەموو خزمەکانی ئەبو ڕافیع لەوێ بوون و زۆر لەلای خەڵک بەڕێز بوون. ئافرەتەکە ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە. گوتیان: ئەبو ڕافیع قەت درۆی نەکردووە بە زیندوویی، بە مردوویش درۆ ناکا. بچووە لە دادگا شکایەتی لێ بکە، ئێمە شاهیدیت بۆ دەدەین. کابرای سەڕراف ئەو قسەی بیستەوە، زانی کە هەمووی لێ دەستێننەوە. هەستا چووە لایان و گوتی: بابە سوڵحمان لە بەیندا بکەن. گوتیان زۆر باشە سەدی بدەوە و لە سەدەکەی دی گەردنت ئازاد دەکا. سەڕراف گوتی باشە، بەڵام دەبێ قەبالەیەکمان لە بەیندا بنوسن. گوتیا ن: چ بنوسین؟ گوتی: بنوسن ژنی ئەبو ڕافیع لەسەر سەد درهەم سوڵحی لەگەڵ فلان کەس کرد، کە جارێکی دی خەونی وا نەبینی و بێتەوە سەرم و شاهیدی بۆ بدەن. خزمەکانی حاڵی بوون و گوتیان خوا خەجاڵەتت کا بۆ ئەو شەرت و بەڵگەیەی هێناتەوە.

*****

(ئەبو ئەسوەد) سەکۆیەکی بچوکی دروست کردبوو. هەرجێگای دانیشتنی خۆی دەبوو. سفرەیەکی لەسەر ڕاخست و وەختی نان خواردنی هەرچی بەوێدا دەهات فەرموویی دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی تەنیا جێگای خۆی دەبۆوە، کەس لەگەڵی دانەدەنیشت. ڕۆژێک کوڕێکی منداڵکارەی ئەنساری بەوێدا دەچێ و ئەبو ئەسوەد دەڵێ فەرموو. کوڕە تەماشا دەکا سەکۆیەکە هەر جێگای خۆی دەبێتەوە. بە ئاسپای سفرەکە هەڵدەگری و لەسەر ئەرزی دادەنێ و بە ئەبو ئەسودد دەڵێ: ئەگەر جەنابیشت دەخوی فەرموو و دەست دەکا بەخواردن. ئەبو ئەسودد هەر تەماشای دەکا. کوڕەکە هەرچی لەسەر سفرەکە دەبێ دەیخوا و ئاخر پارووی لە دەست دەکەویتە خوارێ. کوڕە هەڵی دەگریتەوە، فووی لێ دەکا و دەڵێ: (وَەللّـهِ)هی بۆ شەیتانت بەجێ ناهێڵم ئەبو ئەسوەد دەڵێ: (واللّـهِ)هی بۆ (مەلائیکە)ی موقەڕڕەبیشی بەجێ ناهێڵی نەک بۆ شەیتان. دەک مردووت مرێ بۆ زیرەکیت.

*****

کابرایەک داوای پێغەمبەری دەکا. دیگرن و دەیبەن بۆلای حاکم. حاکم دەڵێ: بیکوژن. کابرا دەڵێ بۆ دەمکوژن؟ خۆ نەمگوتووە ئەمن پێغەمبەرم. گوتومە (ئەبوبەکرم) دوبارە حاکم دەڵێ: مەیدان حەسیری بکەن. خەریک دەبن ڕایکێشن دەڵێ، بۆ وام لێدەکەن؟ دەڵێن، گوتوتە حەزرەتی ئەبوبەکری. دەڵێ، نا گوتوومە (تابیعینم)، دوبارە حاکم دەڵێ، دارکاری بکەن. کابرا دەڵێ، بۆ لێم دەدەن؟ دەڵێن، ئاخر تۆ شتێک دەڵێی کە هەونی. کابرا دەڵێ، ئەی خانەخەراپینە، کە هاتم بۆلاتان پێغەمبەر بووم. دەتانەوێ بە سەعاتێک لە پێغەمبەریەوە بمکەن بە عەوام؟ سەبرم لێ بگرن تا بەیانی ئەوکاتە چ دەڵێن، دەبمە ئەو.

*****

(موعاوییەی) برای (عەبدولەلیکی) کوڕی (مەڕوان) زۆر بێعەقڵ بوو. ڕۆژێک لەبەر دەروازەی شاری (دیمشق) ڕاوەستا بوو. چاوەڕوانی عەبدولەلیکی دەکرد. ئاشێکی لە تەنیشت بوو بە هەڵسوڕانی (کەرێک) دەگەڕا. کە تەماشای کرد کەرێک هەر بە دەوری خۆیدا هەڵدەسوڕێ و زەنگوڵێکی لە ملدایە ترینگە ترینگی یەتی. چوو بە ئاشەوانەکەی گوت: ئەو زەنگوڵەت بۆ لە مل کردووە؟ کابرا گوتی، لەبەر ئەوەی جاری وایە خەو دەمباتەوە، ئەگەر گوێم لە دەنگی زەنگوڵەکە نەبوو، دەزانم کەرەکە ڕاوەستاوە و ئاشەکە ناگەڕێ. هەچەی لێ دەکەم و دەست دەکاتەوە بە هەڵسوڕان. موعاویە گوتی: بۆ ئەگەر کەرەکە ڕاوەستێ و سەرڕاوەشێنی تۆ نازنی کە ڕاوەستاوە؟ کابرای ئاشەوان گوتی، جا کەرەکەی من ئەو عاقڵەی جەنابتی لە کوێ

بوو.

*****

دەڵێن: جارێک (ئیبنو هەبەننەق) وشترێکی لێ ون ببوو. هاواری دەکرد و دەیگوت: ڕەحمەتی خواتان لێ بێ وشترەکەم ون بووە، هەرکەسێک وەیبینی گەردنی ئازاد بێ وشترەکە بۆ ئەو. گوتیان جا باشە ئەتۆ لە دۆزینەوەیدا چیت پێدەبڕێ؟ لە وەڵامدا گوتی: وا دیارە ئێوە نازانن کە شت دۆزینەوە چەند خۆشە.

*****

(عەمری) کوڕی (هەدداب) پیاوێکی ناوداری بە ساڵداچوو بوو. لە ئاخری تەمەنیدا چاوی کوێر دەبێ. خەڵک بۆ ئەحوالپرسین و دڵدانەوەی دەچوونە لای و دڵخۆشییان دەدایەوە. پیاێک بە ناوی (ئەبوعەتاب) زۆر بێعەقڵ و ئەحمەق بوو، چوو بۆ لای و دەستیپێکرد بە دڵخۆشی دانەوەی و گوتی: قوربان بەی کوێر بوونەت ناڕەحەت مەبە. ئەگەر دەتزانی لە ڕۆژی قیامەتدا چەندیان سەواب و پاداشت هەیە، دوعات دەکرد دەست و قاچیشت بشکێ.

*****

کوڕێکی قوماریاز لە حەمامێ تووشی پیاوێکی ورگ زل دەبێ. دەچێ بۆلای و دەڵێ: مامە زۆرم هەوەس لەوەیە، ئەوە دەتاوکت ڕاکەم . کابرا پیرە زۆر بە ئارامی و لە سەرەخۆ دەڵێ: جا کەسی مامی دەزانی قونت دەچێتە سەر کوێ؟ ئەگەر دەیکەی فەرموو حازرم بۆ ئەو سەودایە. کوڕەکە دەڵێ مامە ئاخر بەردوپشت دادەنیشم. کابرا پیرە تووڕە دەبێ و دەڵێ: هەستە برۆ ئەی زۆڵی حەرامزادە.

*****

دەڵێن: عەرەبێک لەسەر دزێ دەگیرێ و دەیبەن بۆلای حەجاجی سەقەفی. حەجاج ئەمر دەکا و دەڵێ حەوت سەد داری لێدەن. کابرای دز لەگەڵ هەر دارێکدا کە لێی دەدەن جارێک دەڵێ خوایە زۆر شوکر. کوڕە مامێکی لەوێ دەبێ و دەڵێ (واللە)هی ئەوە بۆیە ئەوەندەت لێ دەدەن چونکە شوکرانەی خوا دەکەی، لەبەر ئەوەی خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: (لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ). کابرای دز گوتی، بۆ ئەوە لە قورئاندا هەیە؟ کوڕە مامەکەی گوتی بەڵێ ئایەتی قورئانە. کابرای دز گوتی:

(يارَبِ لأشْكَرَ فلاتَزِدْنـى+أسْرَفتُ فِى شُكرِكَ فاعْفُ عَنِيهاعِنشوابَ الشا كرينَ عَنِّى).

واتە ئەی خوای گەورە چیدی شوکر ناکەم بۆم زیاد مەکە، ئیسرافم لە شوکری تۆدا کرد، عەفووم بکە و لە ئەجر و پاداشی شوکرانەبژێران بە دوورم کە. حەجا

بەو قسە زۆر پێکەنی و دزەی ئازاد کرد.

*****

ئاغایەک دوو شێتان بانگ دەکا قسەی خۆشی بۆ بکەن و پێیان پێ بکەنی. شێتەکان ئەوەندەیان قسەی قۆڕ و بێتام کرد، ئاغا خۆی بۆ ڕانەگیرا و تورە بوو گوتی، دا ئەو دەماچەم بۆ بێنن با بیانکوژم. یەکێک لە شێتەکان لە قاقای پێکەنینی دا و بە ئەوی دیکەی گوت: غەم مەخۆ تا ئێستا دوو بووین، ئەوە بە ئاغاوە بووین بە سێ. ئاغا دەستی ساربۆوە و دەنگی نەکرد.

*****

کابرایەک ناوی (داودی موساب) بوو. بەیانیەک لەخەو هەستا و گوتی: کوڕینە ئەم شەو خەونێکم دی، نیوەی ڕاست بوو و نیوەی درۆ. لە خەومدا کیسە دراوێکم لەسەر شانان بوو ئەوەندە گران بوو، لەبەر قورسیی لەخۆم ڕی، کە وەخەبەر هاتم پیساییەکەم دی بەڵام کیسە دراو نەبوو.

*****

دەڵێن: عەرەبێکی دەشتەکی کوڕێکی بچووکی دەمری، دەچن بۆلای دڵخۆشی وەدەن، دەڵێن بۆ خۆت سەلامەت بی، ئومێدەوارین لە ڕۆژی قیامەتدا شیفاعەتت بۆ بکا. لە وەڵامدا گوتی یاخوا خوا قەت موحتاجی شەفاعەتی ئەوم نەکا، فەقیرە هەر دەتوانی بە دەردی خۆی ڕابگا.

*****

لە سەردەشتێ پیاوێکی پیری قسەخۆش، دوکانی شیرگەری هەبوو ساچمەزەن و خەنجەر و چەقۆ و دەسکە چەقۆی دروست دەکرد و ناوی مام سەلیم بوو. سەودا و مامەڵەی لەگەڵ کەس نەدەکرد، هەرچی دروستێ بکردایە، دەیگوت بابەڵێ دوو قرانان بدە، ئەگەر بایی چەند تمەنیش بوایە هەر دەیگوت دەکاتە دوو قران. زۆری دەچوومە لای و گوێم لە قسەخۆشەکانی دەگرت. لەناو تۆزو خۆڵی شاخە بزنەکاندا لەلای دادەنیشتم. ڕۆژێک گوتی: مامۆستا کارێکم پێی زۆر پێخۆشحاڵ دەبم کە بەقسەم بکەی. گوتم فەرموو مام سەلیم. گوتی، بچۆ بە مەلای مزگەوتەکەمان بڵێ، مام سەلیم دەڵێی، ئەگەر سوڕەتی (إنـا أعْطَيْنا)ی پێ کورتە با سوڕەتێکی دیکە بخوێنی، دەنا هیچ مانای نیە ئەوەندەی درێژ دەکاتەوە و دەڵێ: (إنا أعْطَيْناكَ الْكَوْثَرْ) بە درێژی. گوتی، دووەم ئەوە دوو مانگە موراقەبەی دەکەم سیواکێکی لەو تاقە چکۆلەی میحرابی مزگەوت داناوە، لە پێشنوێژ دابەستن دا جارێک بەملاوئەولای دەمیدا دێنی و لە تاقەکەی داوێتەوە، دەبا جارێک بیشوا ئەو ماڵ

خەراپە.

جارێک گوتی: لەگەڵ ڕەسوڵێ مامە خاڵەی چووین بۆ مازو کڕین، چووینە ماڵێک لە دێیەک خاوەن ماڵەکە پیرەژنێک بوو، مازویان زۆر بوون، لێمان کڕین و دەستمان کرد بەکێشانیان، هەمووجارێ پیرێژن چنگێکی لە تەرازووەکە دەردێنانەوە و دەیگوت ڕۆڵە ئێوە شارستانین نازانن چەندیان پێوە ماندوو بووین. لە ئاخردا جارێک چنگێکی هەڵگرت و بایەکی لێ بۆوە، خوا وەت حەسێنێ، ئەوجار هەموو جارێک چنگێکی تێدەکردەوە و دیگوت: ئێوەش کاسبن، با زەرەر نەکەن. ڕەسوڵی مامە خاڵەی زۆر قسەخۆ ش بوو، هەر دەیگوت: سەلیم خوا بتکا بە قوربانی تڕی پیرێژن دەنا پێیەوە دەهات.

*****

لە ئالان و دەوربەری سەردەشتێ سالان داب بوو ئەگەر پیاوێک بەلای کۆمەڵێک ئافرەت دا بڕۆیشتایە و سلاوی بکردایە، دەبوو ئافرەتەکان لەبەری هەستن. جارێک ماماغای دولکان دەچێ بۆ بێـژوێ و بە بەردەمی ماڵێکدا دەڕوا، چەند ئافرەتێک لەبەر دەرگا دادەنیشن، سلاویان لێ دەکا، وەلامی دەدەنەوە. بەلام کەس لەبەری هەڵناستی. ماماغا ئاوڕ دەداتەوە و دەڵێ: خوشکم ئەگەر جارێکی دی پیاوێک سلاوی لێکردن، ئەوەندە هەڵستن کە کێرو دەبەرقوونێوە بچێ.

*****

دەڵێن : ئاغایەک لە ئاخری تەمەنیدا زۆری نوێژ دەکردن و زۆر لەبەر خوا دەپاڕایەوە و دەیگو ت: خوایە، لەو چوار گوناحانم خۆش بە. ڕۆژێک دۆستێکی گوتی: ئاغا ئەو چوار گوناحە گەورە چن کە ئەوەندەیان بۆ لەبەر خوا دەپاڕێیەوە؟ ئاغا گوتی چوار تورکم بە ناحەق کوشتن زۆرم پێ گوناح بوون. کابرا گوتی: جابۆ کەسی دیکەت نەکوشتووە؟ ئاغا گوتی بەڵێ زۆرم کوشتوون، بەلام حیساب بۆ کوشتنی ڕەعیەتان ناکەم.

*****

(ئەنەسی کوڕی مالیک) دەڵێ: ڕۆژێک پیاوێکی میسری هاتە خزمەت حەزرەتی (عومەر) و گوتی: ئەی ئەمیری موسولمانان پەنام بۆتۆ هێناوە، دادم بپرسە. حەزرەتی عومەر فەرمووی. بڵێ بزانم. کابرا گوتی قوربان لەگەڵ کوڕی عەمری کوڕی عاس کە باوکی لەلایەن تۆوە کراوە بە والی میسر گرەوی ئەسپ سواریمان کرد و وەپێشی کەوتم و لێم بردوە، کەچی بە توڵەی زۆری لێدام و باوکیشی لەترسی ئەوەی کە مەبادا بێم لەلای جەنابت شکایەتی لێ بکەم زیندانی کردم.

ئێستاش خۆم دزیودتەوە و هاتووم بۆلای جەنابت. حەزردتی عومەر فەرمووی لێرە ودمێنە تا دێن بۆ ئێرە. حەزرەتی عومەر نامەی نارد بۆ عەمری کوڕی عاس و نووسی هەرکە ئەو نامەت گەیشتە دەست، لەگەڵ کوڕەکەت ودرە بۆ حەج. عەمری کوڕی عاس فەوری لەگەڵ کوڕەکەی بەرەو شاری مەدینە وەڕێ کەوتن. لەپاش حەج کردن، رۆژێک حەزرەتی عومەر خەڵکێکی زۆری لە دەورە بوو، دار حەیزەرانەکەی دەستی دا بە کابرای میسری و گوتی، هەستە تۆڵەی خۆت لە کوڕی والی میسر وەکە، کابرای میسری دەستی کرد بە لێدانی. ئەنەسی کوڕی مالیک دەفەرمووێ، زۆرمان پێخۆش بوو کە لێی دەدا و حەزرەتی عومەر هەر دەیفەرموو، دەی لە کوڕی پیاوی گەورە بدە. کابرای میسری گوتی، قوربان دڵم ئاسودە بوو. حەزرەتی عومەر فەرمووی، دەی لەسەر سەری عەمری باوکی دانێ. کابرا گوتی، قوربان ئەو لێی نەداوم. لەپاشان حەزرەتی عومەر فەرمووی ئەی عەمری کوڕی عاس ئەوە لە کەیەوە خەڵکتان کردووە بە عەبد و بەندەی خۆتان؟ خۆ ئەو خەڵکە بە بەندەیی لە دایک نەبوون.

*****

جارێک لە مەجلیسی (کیسرا)دا لە شاری (مەداین) کە ئێستا ناوی (سەلمان پاکە) بەهۆی مەرقەدی (سەلمانی فارسەوە) کە (تاقی) کیسراش لەوێیە، باسی بێعەقڵی عەرەبە دەشتەکیان دەکرد. بۆ تاقیکردنەوە عەرەبێکیان هێنا بۆ لای کیسرا و لێی پرسی: گۆشتی چ حەیوانێک زۆر خۆشە؟ لە وەڵامدا گوتی، هی وشتر. کیسرا گوتی، چۆن گۆشتی وشتر لە گۆشتی مەڕ و قاز و کەو و مراوی و مریشک خۆشترە؟ کابرا گوتی: تۆ بێنە گۆشتی وشتر بە ئاو و خوێوە بکوڵێنە و گۆشتی ئەوانەش بکوڵێنە بزانە کامەیان خۆشترە؟ کیسرا گوتی ئەی دەنگی چ گیانلەبەرێک تیژترە؟ گوتی، دەنگی وشتر. کیسرا گوتی کوا دەنگی وشتر بەقەد دەنگی قاز و قولینگ لە دوورەوە دەبیسترێ؟ کابرا گوتی دە تۆ وشتر بەرە جێگای ئەوان و بزانە دەنگی باشتر نایە؟ کیسرا پرسی: چ گیانلەبەرێک پتر لەوانی تر دەتوانێ باری قورس هەڵگرێ؟ گوتی وشتر. کیسرا گوتی: کوا وشتر ددتوانی باری فیل هەڵگری؟ کابراگوتی، دەتۆ هەردووکیان ئیخ بدە و باریا ن بکە بزانە کامەیان بە بارەکەوە زوتر هەڵدەستنەوە؟

*****

مەلا محەممەدی کەلانی مەلای مزگەوتی گومرگە سووتاو بوو لە شاری سلێمانی. رۆژێک باسی شارستانی و لادێی مان دەکرد، مەلا محەممەد بۆخۆی جاف بوو،

گوتیان: مامۆستا ڕاسته دەڵێن: جاف پیاوی بنیعەقڵیان زۆره؟ له وەڵامدا گوتی: وادەڵێن، بەڵام هەیانه له شارستانیش ئاقڵتره. بۆ نموونه، ئەمن خزمێکی جافم له شاری (سەنگاو) چەند ساڵ لەمەوبەر دێته ئەو شارەی سلێمانی و حاجییەکی ئێره پارەی دەداتێ پەنجا سەر مەڕ بکڕێ و بە نیوەیی بەخێویان بکات. خزمەکەم دەچێتەوه سەنگاو و مەڕەکان دەکڕێ. بەهاری حاجی سلێمانی دەچێ بۆ سەنگاو چاوی بە مەڕەکان بکەوی کاتێ دەچێ، دەبیەن مەڕەکانی نیشان دەدەن، دەبینێ هەموویان مۆڵیون و کاوێژ دەکەن، حاجی دەڵێ ئەوه بۆ وا چەنه لێک دەدەن؟ خزمەکەم دەڵێ ئەوه بایی پەنجا دینارم بنێشت بۆ کڕیون، بنێشت دەجوون. دەبێ پارەکەم بدەیەوه، حاجی پەنجا دیناری دەداتێ. مەلا محەممەد گوتی جا هەر بەئێوه دەڵێم کامەیان کەرتر بوون؟

*****

زانای بەناوبانگ قازی (ئەبوبەکری باقلانی) بەنوێنەری له بەغداوه دەینێرن بۆلای مەلیکی ڕۆم. مەلیکی ڕۆم مەسیحی دەبێ. جا بۆ ئەوەی قازی ئەبوبەکر سەری تەعزیمی بۆ دانەوێنێ به دەرگایەکی زۆر نزمدا بانگی دەکاته ژوورەوه. قازی که دەگاته بەر دەرگاکه به فەراسەت دەزانی که بۆچی دەبێ بەو دەرگا نزمەدا بچێته لای مەلیک، بۆ ئەوەی سەردانەنەوێنێ پاشه و پاش دەچێته ژوورەوه. لەکاتی بەخێرهاتن و ئەحوالپرسی، قازی ڕوو دەکاته قەشەی مەلیک و دەڵێ: جەنابی قەشه ماڵ و خێزانت چۆنه؟ مەلیک پێدەکەنی و دەڵێ: بۆ قازی موسوڵمانان تا ئێستا نەتزانیوه قەشه نابێ ماڵ و خێزانی هەبێ؟ قازی به گاڵتەوه وەڵامی دەداتەوه و دەڵێ: (سوبحانەالله) لەبیرو باوەڕتان، ئێوه دەڵێن، قەشه نابێ ژن و منداڵی هەبێ، بەڵام دەڵێن، خوا ژن و منداڵی هەیە. مەلیک زۆری پێ ناخۆشبوو بۆ ئەوەی، تۆڵەی ئەو قسه بکاتەوه گوتی ئەرێ جەنابی قازی، بەسەرهاتی عایشەی ژنی پێغەمبەرەکەتان چۆن بوو؟ قازی فەوری گوتی: جەنابی مەلیک وەک بەسەرهاتی حەزرەتی مریەم وابوو، خواوەندی گەوره پاکی هەر دووکیانی ئاشکرا کرد، بەڵام جیاوازیان ئەوەنده بوو که حەزرەتی عایشه منداڵی نەبوو. مەلیک زۆر تێکچوو و چیتر پرسیاری لێ نەکرد.

*****

دوو برادەر له ساڵێکدا ژنیان هێنا، بەڵام وا ڕێکەوت لێک دوور کەوتنەوه. لەپاش بەینێک چاویان به یەکتر کەوتەوه، دوای چاک و چۆنی یەکیان بەوی دیکەی گوت: ئەرێ ژنەکەت چۆنه؟ له وەڵامدا گوتی: زۆر باشه، کاتێ دەچمەوه هەرئەوەنده

سوجدەم بۆ نابا. ئەی هی تۆ چۆنە؟ کابرا گوتی: بەراستی تۆ شانست هەیە و زۆر خۆشبەختی. ژنەکەی من زۆر خەراپە، کاتێ دەچمەوە ماڵێ و چاوی پێ دەکەوم هەر ئەوەندە سواری سەرم نابێ و ئیم نادا. برادەرەکەی گوتی: دەی تۆش وەک من بکە. ئەمن ئەو شەوەی هێنام و دانیشتین بۆ نان خواردن پشیلەکەمان دەستی کرد بە میاوە میاو، دەماچەم هەڵکێشا و لەبەر چاوی ژنەکەم یەکم پێوەنا و کوشتم. ژنەکەم بەوە زۆر ترسا و وەک مێو بۆم نەرم بووە. کابرا هەستا چووە ماڵێ و ئێوارە کاتی نان خواردن کە پشیلەکەیان هات کەوتە میاوە میاو، دەماچەکەی هەڵکێشا و خەریک بوو پشیلەکە بکوژی، ژنەکەی گوتی: ئەوە چ دەکەی؟ گوتی: پشیلەکە دەکوژم ژنەکەی گوتی: ترحێو، دەمێکە ئەو خەبەرەم بیستووە، دەبوو ساڵێک لەمەوبەر ئەوەت بکردایە، تازە ئەوەی دیوتە هەروا دەبێ.

*****

کابرایەک ژنەکەی زۆر خۆشدەویست و ژنەکەی تووشی نەخۆشی بوو مرد. کابرا لە تاوانی دەگریا و لەخۆی دەدا. کاتێ بردیان بۆ سەر قەبران، خۆی خستە ناو قەبرەکەوە و دەگریا و دەیگوت: چا تازە لە پاش ئەو من بۆ بژیم. منیش لەگەڵ ئەو بنێژن. هەرچەند کردیان لە قەبرەکە نەدەهات دەر، مامۆستاکە چوو دەستی گرت و گوتی: بەسە مەگری هەستە وەرە دەر ئافرەتێکی زۆر جوانتر هەیە شووت پێدەکا. وەک ئاوێکی بە ئاگرداکەی کابرا دەردی لێ نەما و گوتی: مامۆستا گیان ئەو ئافرەتە کێ یە؟

*****

جارێک لە مەجلیسی عەوامی بەریتانیادا چەرچیل لەگەڵ ئافرەتێکی ئەندامی مەجلیس کەوتە موناقەشەوە. ئاخری ژنەکە تورە بوو و گوتی: ئەگەر تۆ مێردی من بویتایە ژەهرم بۆ دە چا دەکردی. چەرچیل فەوری و لە سەرەخۆ گوتی: بەڵێ ئەگەر تۆ ژنی من بویتایە زۆر بەخۆشیەوە ژەهرەکەم دەخواردەوە.

*****

دەڵێن: ڕۆژێک قازییەکی بەغدا هیچ پارەی نەبوو، ئەو ڕۆژە بۆ ماڵەوە خەرجی بکا، بە بەردەستەکەی گوت: تەماشای ئەوراق و پەروەندەکان بکە و بزانە پەروەندەیەک نیە ئەورۆ شتێکی پێ وەرگرم؟ کابرا زۆر گەڕا هیچی وای نەدیەوە. قازی گوتی: بچۆ دەرەوە هەرکەسێکت دی بڵێ، وەرە قازی بانگت دەکا، ئەگەر نەهات بەتۆبزی بیهێنە. کابرا چوو تووشی پیاوێک بوو گوتی: کاکە وەرە با بچین بۆلای قازی کاری پێتە. کابرا گوتی: ئەمن چکارم بە قازی نیە و نایەم. پیاوی قازی

کابرای بەزۆری برد بۆلای قازی. دوای سڵاو و بەخێرهاتن قازی ڕووی کردە کابرا و گوتی: قەرزت لەسەر کەس نیە؟ کابرا گوتی: نەخەیر. قازی گوتی: ئەی قەرزداری کەس نی؟ گوتی: نەخێر. قازی گوتی: ئەی نەکراوی بەسەر وەسیەتی کەس. گوتی: نەخێر، قازی گوتی: ئەی بەشە میراتت بۆ نەهاتوتەوە تا بەشەکەت بۆ دیاری بکەم؟ گوتی: نەخێر. قازی ڕووی کردە باش کاتبەکەی و گوتی: دە ئیعلامیەیەکی شەرعی بۆ بنوسە کە نە قەرزی لەسەر کەسە و نە قەرزداری کەسە. ئیعلامیەیان بۆ نوسی و قازی ڕووی کردە بەردەستەکەی و گوتی دە پارەی ئیعلامیەکەی لێ وەرگرە و بچووە خەرجی شتیماڵەوەی بکە. بەمجۆرە قازی خەرجی ئەو ڕۆژەی پەیدا کرد.

*****

دەستی کابرایەکیان لەسەر دزی بڕیبوو و دەستی مەسنوعیان بۆ دروست کردبۆوە. کابرا جارێکی دی دزی کرد و گرتیان بردیانە لای قازی. قازی ئاگای لەوە نەبوو کە جارێک دزی کردوە و دەستیان بڕیوە. ڕووی کردە کابرا و گوتی: کوڕم بۆ دزی دەکەی؟ دزەکە وەکیلی گرتبوو، وەکیلەکەی گوتی: جەنابی قازی ئەو پیاوە دەرگای نەشکاندوە بچی دزی بکا. پەنجەرەی ئەو ماڵە کراوەتەوە و ئەویش دەستی بردووە چەند شتێکی هێناوەتە دەرێ، ئێستاش خوا هەڵناگری ئەو پیاوە لەسەر تاوانی دەستی، هەموو گیانی بچێتە بەندیخانەوە. قازی تۆزێک ڕاما و لەپاشان گوتی: قسەکەت زۆر جوانە، ئەوە بڕیارمدا کە دەستی بۆ ماوەی ساڵێک زیندانی بکرێ، خۆی سەربشک بێ لەگەڵی دەچێ بۆ بەندیخانە یان دەستەکەی لێ بکەینەوە. گوتی: قوربان دەستەکەم لێوەکەن، قازی بڕیاری دا و نامەی نوسی و ئیمزای کرد و کابرا گورج دەستە مەسنوعیەکەی لێکردەوە و لەپێش قازی دانا و بە ئاسانی ڕزگاری بوو، ئاوا کڵاویان لەسەری قازی نا.

*****

جارێکی دی کابرایەک دەبەن بۆلای قازی و قازی دەڵێ: کوڕم بۆ دزیت کردووە؟ کابرا دەڵێ: جەنابی قازی دزیم نەکردووە. قازی دەڵێ: درۆ دەکەی، ئەوە نیە دە کەس شاهیدی دەدەن کە چاویان لێ بووە دەستت دەگیرفانی ئەو پیاوە ناوە و کیسە باخەڵەکەت دەرهێناوە. کابرای دز دەڵێ: جا قوربان ئەگەر تۆ بە شاهیدی خەڵکی ئەو زەمانە باوەڕ دەکەی ئەمن سەد شاهیدت بۆ دێنم کە چاویان لێ نەبووە.

*****

جارێکی دی کوڕێکی مێرمنداڵی تەمەن نۆ ساڵە لەسەر دزی دەگرن و دەیبەن بۆلای قازی. قازی دەڵێ: ڕۆڵە بۆ دزیت کرد؟ کوڕەکە لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان ئاخر

ئەوڕۆ باوکم نەخۆش بوو ئەمن لەجیاتی ئەو چووم.

*****

لەوکاتەدا کە پێشنوێژ و خوتبە خوێنی خانەقای (مەولا ناخالید) بووم لە شاری سلێمانی، ڕۆژێک پیاوێکی کەواو سەڵتە لە بەری شارەزووری هات و بەگریانەوە دەستی ماچ کردم و لە دوای بەخێر هێنان گوتی: مامۆستا گیان چم لێ دەکەی فریام کەوە. خەراپم لێ قەوماوە. گوتم فەرموو بزانم: گوتی: ئاخر بە دەمم دا نایە، گوتم: لە شەرعدا هیچ عەیب نیە. گوتی: بم وەسسەدەقە ت ئەوە چل ڕۆژە لەگەڵ ژنەکەم بووە بە هەرامان و ئەو لەفزی بە دەمدا هات و تەلاقی دام. گوتم: خاڵە گیان تەلاق بەدەست پیاوە، غەم مەخۆ، ئەوە بۆم چاک کردیەوە و بڕۆ سواربەوە، گوتی: وەی بم وەقوربانی ئەو دەمتە.

*****

مەلا عەبدوڵڵای وەڕازی گوتی: زستان بوو لە مزگەوتی وەڕاز لە شارباژێڕ حەدیسم بۆ خەڵکەکە دەخوێندەوە. هاتمە سەرباسی ئەوەی کە پیاو دەبێ لەگەڵ ماڵ و منداڵی زۆر باش بێ، بەتایبەتی لەگەڵ ژن، چونکە لە قیامەتیشدا ئەو ژنانەمان دەدەنەوە. کابرایەک لەناو خەڵکەکە بە دەنگی بەرز گوتی: مامۆستا ئەوە بەڕاستیتە؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: یانی لەو دنیاشدا دەبێ لەگەڵ ئەو ژنەی ئێستام بم؟ گوتم بەڵێ. گوتی: دەی بەش بەحاڵی خۆم لە قوزی دایکی وەی بەم بیەوێتەوە.

*****

مامۆستا شێخ مستەفای قەرەداغی یەکێک بوو لە مەلا باشەکانی کوردستان و زۆر خاوەن زانیاری و سەخی تەبع بوو. قەرەداغ چۆڵ کرابوو تەشریفی هاتبوو بۆ سلێمانی و لە مزگەوتی هەللاجەکان بوو. ڕۆژێک لە بەینی قسەی خۆشدا فەرمووی: دەور و زەمانە زۆر گۆڕاوە و ئێستا خەڵک زۆر وریاترە، بەڵام بێئەدەبتر و بێدین ترن. فەقێ بووم، چوومەوە قەرەداغ، باوکم کە شێخ نەجیبی قەرەداغ و زۆر زانا و گەورەی قەرەداغ بوو، لەگەڵ عەشیرەتێکی دراوسێ لەسەر کێشەی ملک لەشکرکەشیان لەیەکتر کردبوو، منیش بە پەلە فیشەکدانم لەخۆم قایم کرد و سواری ئەسپ بووم و پێم پێوەنا بۆ جبهەی شەڕ. کە دەست بە تەقە کرا دەستم برد بۆ فیشەکدانەکەم فیشەک دەرهێنم، تەماشام کرد یەک فیشەکم پێنەماوە، تۆمەز فیشەکدانەکەم سەرەوبن لەخۆم دابوو، هەموویان کەوتبوونە خوارێ و بەخۆم نەزانی بوو.

*****

سالێک مورشیدی دینی بووم لەگەڵ قافڵەی حاجیەکانی سلێمانی، کاتێ گەیشتینە شاری (مەکە) و چووین بۆ تەواف و دەستمان کرد بە گەڕان بە دەورەی ماڵی خوادا، چونکە یەکێک لە ڕوکنەکانی حەج ئەوەیە کە حەوت جار بە دەورەی (کابە) کە لە ناوەڕاستی حەوشی مزگەوتی مَسْجِدُ الْحَرامْ دایە بگەڕێی. لەوکاتەدا (مەناسیکم) بەدەستەوە گرت و وەپێشیان کەوتم و دەستم کرد بە تەواف. چەندجار بە دەورەی کەعبەدا گەڕاین، زۆر گەرم و قەڵەبالغ بوو، تەواف کردن زۆر بەزەحمەت بوو. یەکێک لە حاجیەکان کە خەڵکی شارەزور بوو بانگی کردم و گوتی: ئەرێ ماموستا ئەو گێرەیە هەر تەواو نەبوو؟

*****

ئافرەتێک بۆ شکایەت چوو بۆلای قازی (ئەبوضەم ضەم) و گوتی: جەنابی قازی فلان کەس ماچی کردم. قازی لە وەڵامدا گوتی: بچۆ ماچی بکەوە، چونکە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: ( وَالْجُرُوحِ قِصاصْ).

*****

ڕۆژێک دوکتۆرێک بە کۆڵانێکدا دەڕۆی، تووشی کوڕێکی گەنجی تازە پێگەیشتوو دەبێ. کوڕەکە زۆر بە گەرمی سلاوی لێ دەکات و دەڵێ: جەنابی دوکتور نازانم بەچ زمانێک سوپاست بکەم بۆ ئەو عەمەلیاتە باشەی کە کردت. دوکتۆرەکە لە وەڵامدا دەڵی: لە یادم نیە کە تۆم عەمەلیات کردبێ. کوڕەکە وەڵام دەداتەوە و دەڵی: جەنابی دوکتور منت عەمەلیات نەکردووە، مامی منت عەمەلیات کرد و کوشتت. من لە سایەی ئەو عەمەلیاتە کەوتمە ژیانێکی زۆرخۆشەوە، چونکە مامم کەسی نەبوو هەموو میراتەکەی بۆ من مایەوە.

*****

دەڵێن: کوێرێک ژنێکی ڕەشی هێنا، ژنەکە بە مێردەکەی گوت: ئەگەر چاوت دەیان بینی و حوسن و جەماڵ و جوانی و پێستی سپی منت دەبینی ئەوەندەی دیکەت خۆش دەویستم. کوێرەکە لەسەرەخۆ پێکەنی و گوتی: جا ئەگەر وەک خۆت دەڵێی وا بویتایە، چاو ساغان وەبەرمنیان نەدەخستی.

*****

کابرایەک چوار ژنی دەبێ. هەمیشە لەگەڵی بەشەڕ دێن. ڕۆژێک بە هەر چواریان زۆری لێ دەدەن و هەر یەکەی دەست و قاچێکی دەگرن و بە چواردەست دەیهاوێنە بەر دەرگا. لەوکاتەدا برادەرێکی بەوێدا دێ و چاوی پێدەکەوێ زۆری بەزەیی پێدا دێتەوە. لەپاش چەند ڕۆژان برادەرەکەی تەماشا دەکات ئەوە کابرای چوار ژنە

خەریکە چارییەک دەکری، زۆری بەلاوە سەیر دەبێ. دەچێ بۆ لای و دەڵێ: ئەوە چ دەکەی؟ دەڵێ: ئەو چارییە دەکرم. کابرا دەڵێ لەسەر ئەو چوار ژنەتەوە تەنێ نەبووی یەکی دیش دەکری و دەیان کەیتە پێنج؟ خاوەن ژنەکە دەڵێ: ئاخر ئەو ڕۆژە چاوت لێ نەبوو کە هەریەکە دەست و قاچێکیان گرتبووم و سەرم لە عەرز دەخشا؟ ئەگەر جارێکی دی بە چوار دەست هەڵیانگرتم ئەودیان دەتوانی سەرم بگری تا لە عەرز نەخشێ.

*****

(ئەبو جەعفەری مەنسور) نامەیەکی نوسی و ناردی بۆ ئیمام (جەعفەری سادق). نوسی بووی، ئەوە بۆ ئەتۆش وەک خەڵک نایەی بۆلام؟ لە وەڵامدا بۆی نوسیەوە، چونکە دنیا پەرست نیم تا بە هۆی ماڵی دنیاوە لێت بترسم و بێم بۆلات. تۆش لەو کەسانە نی کە نزیک بوونەوە لە تۆ سوودی بۆ دوارۆژ هەبێ و بەو ئومێدە بێم بۆلات. هەروەها لە ناز و نیعمەت دانی، بێم پیرۆزباییت لێ بکەم و تووشی موسیبەتیش نەبووی تا بۆ تازیەت بێم بۆلات. مەنسور بۆی نوسیەوە وەرە ئامۆژگاریم بکە. ئیمام بۆی نوسیەوە ئەوەی دنیای بوێ ئامۆژگاری تۆ ناکا و ئەوەی دوارۆژیشی بوێ ڕفاقەتی تۆ ناکا.

*****

دەڵێن: کوڕێکی لادێیی چوو بۆ (جامیع و ئەزهەر) بۆ خوێندن. لەپاش ماوەیەک نامەیەکی نوسی بۆ ماڵەوە، گوتی سوپاس بۆ خوا لە موسیبەتێک ڕزگارم بوو. چونکە لەو ڕۆژانەدا لیباسەکانم شت و بردم لە سەربانی هەڵمهاوەسین تا وشک وەبن، کەچی لە ناکاو بایەکی توندی هات و کراسەکەمی هەڵدایە حەوشی ماڵێکەوە، سوپاس بۆ خوا کە لەبەرمدا نەبوو دەنا ملم دەشکا.

*****

ڕۆژێک عەرزی حەزرەتی عیسایان کرد و گوتیان: قوربان ڕاستە تۆ مردوو زیندوو دەکەیەوە؟ فەرمووی بەڵێ بە ئەمری خوا. گوتیان: ئەی قوربان کەڕ و لاڵیش چاک دەکەیەوە؟ فەرمووی بەڵێ. بە ئیزنی خوا. گوتیان: ئەی قوربان دەرمانی ئەحمەقی چیە و چۆن چارەی دەکرێ؟ فەرمووی: ئاخر ئەوەیە کە منیشی نارەحەت کردووە و چارەی نیە.

*****

کابرایەک دەچوو کەرێک بکڕی، ژنەکەی گوتی: ئەوە چ دەکەی؟ گوتی: دەچم کەرێک دەکڕم ژنەکەی گوتی: بڵێ ئینشاالله. گوتی ئافرەت جێگای ئینشاالله نیە،

پارەم پێیە و کەر لە مەزاتخانە زۆرە. چۆ مەزاتخانە خەریکی سەودای کەرێک بوو، پارەکەیان لێ دزی و بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە. لە دەرگای دا ژنەکەی گوتی: کێ یە؟ کابرا گوتی منم ئینشاالله. ژنەکە هات دەرگای کردەوە و گوتی: چیت کرد؟ گوتی پارەکەیان لێ دزیم ئینشاالله. ژنەکەی گوتی: ئەوە جێگای ئینشاالله نیە. کابرا گوتی: ئافرەت وادیارە هەموو شوێنێک جێگایەتی.

*****

ئافرەتێک مێردەکەی مرد بوو نەدەوێرا بچێتەوە ژوورەوە. گوتیان: بچۆ ژوورەوە و خواحافیزی یەکجارەکی لێ بکە، لە وەلامدا گوتی: بەخوا ناوێرم، لەوە دەترسم بچمە ژوورەوە و ئیزرائیل بزانی کە ژنی ئەوم.

*****

کاروانێک شێست کەس بوون، دوو نەفەر ڕوتیان کردنەوە و هیچیان پێ نەهێشتن. یەکێک لە کاروانچی یەکیانی پرسی، ئەوە چۆن بوو دوو نەفەر توانیان شێست کەس ڕوت وەکەن؟ کابرا گوتی: ئاخر یەکیان دەورەی گرتین و ئەوی تریشیان ڕوتی کردیننەوە و چمان پێ نەکرا.

*****

ئاغایەک بە نۆکەرەکەی گوت: بچۆ دەرەوە بزانە هەورە یا ن ساوە. کابرا چۆ دەرە و هاتەوە ژور و گوتی: وەللاهی ئاغا باران لێ نەگەڕا تەماشا ئاسمان بکەم و بزانم داخوا هەورە یان ساو.

*****

پیاوێکی عەقڵ سووک چۆ بازاڕ و مریشکێکی هێندی سەودا کرد بیکڕی گوتیان: بە دوو دینار. کابرا گوتی: وەللاهی ئەگەر وەک حەزرەتی یوسف جوان بێ و وەک بەرانی حەزرەتی ئیسماعیل گەورە بێ و هەموو ڕۆژێک وەلی عەهدێکی موسولمانانی ببێ، ئێستا ئەوەندەی پێ نادەم.

*****

ئیمام محەممەدی کوڕی حەزرەتی عەلی لە تەواف دا چاوی بە عەرەبێکی لیباس شڕ کەوت، کە چاوی دە کەعبە بڕیبوو و بێدەنگ ڕاوەستا بوو. لە پەردەی کەعبە نزیک بۆوە و خۆی پێیەلاوەسی و سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و گوتی: ئەرێ ئەوە تۆ شەرم لەمن ناکەی بەو حاڵەوە چاوم بڕیوەتە تۆ و ئاگاداری کە لەبەر دەرگات ڕاوەستاوم و لێت دەپاڕێمەوە و دەنگ ناکەی. گوتی: ئەگەر عەبا و پێڵاوێکم دەدەیەی ئەوە نوێژانت بۆ دەکەم و بەڕۆژوش دەبم، بەلام ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتەم

وەهێڵی، کێ لەسەر نوێژ نەکردن لۆمەم دەکا؟ بۆ نازانم کە تۆ ڕزقی بەچکە کەرە کێویان دەدەی، بە سساڵ داکەوتویکی وەک منیش کە دایک و باوکم لە خێڵی (تەمیمن) ئاوا بەخێو دەکەی؟ ئیمام محەممەد بانگی کرد و سەرتاپا لیباسی بۆ کرد و سەد درهەمیشی دایە. ساڵی دوایی هاتەوە بۆ حەج حاڵی زۆر باش بوو. عەرەبێک تووشی بوو ناسیەوە، گوتی پار حاڵت زۆر خەراپ بوو، وا دیارە ئەم ساڵ حاڵت باشە. لە وەڵامدا گوتی: ئاخر پار لە دەرگای کەریم و سەخیم دا و زۆرم لۆمە کرد بۆیە دەوڵەمەند بووم.

*****

دەڵێن: لە شاری (کوفە) یەکێک چوو بۆلای دەڵا ڵێک و گوتی: هاتووم کەرێکم بۆ بکڕێ کە نە زۆر چووک بێ و نە زۆر گەورە. ئەگەر کاوجۆم کەم دایە سابیر بێ و ئەگەر زۆریشم دایە شوکرانەی لەسەر بکا، نەچێتە کەلاوە کۆنانەوە و موزاحیم نەبێ و ئەگەر بە تەنیا بە ڕێگادا ڕۆیی لە سەرمخۆبێ و کاتێ کەیشتە ناو قەڵەباڵغەوە بە هێمنی بڕوا، کابرای دەڵاڵ تۆزێک تێی فکری و لە پاشان گوتی: کاکە سەبرم لێ بگرە تا خوا قازیت بۆ نەسخ دەکاتەوە بە کەر و ئەوسا بە هەر قیمەتێک بوو، بۆت دەکڕم، دەنا کەری ئاوا ئێستا پەیدا نابێ.

*****

کۆمەڵێک دانیشتبوون باسی مردن و ناخۆشی مردنیان دەکرد. کابرایەک لە ناکاو هەڵی دایە و گوتی: کوڕە وەڵلاهی مردن ئەوەی لە هەموو شتێک ناخۆشترە کە ئینسان ناتوانی هەناسە بدا.

*****

کابرایەک عادەتی وابوو لە هەر جێگایەک دەعۆوەتێک بوایە ئەو بەبێ پێگوتن دەچوو. ڕۆژێک ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد و دەیگوت: ئەگەر چووی لەسەر سفرە دانیشتی و دەستکرا بە خواردن قسە مەکە لەکاتی خواردندا. ئەگەر پرسیاریشیان لێکردی لە وەڵامدا هەر بڵێ: نەعەم، یانی بەڵێ. چونکە نەعەم هەر جوونە و شەویلە بزاوتنی دەوێ. ڕۆژێک گوتیان ماڵ نەوێران تۆ ئەوەی لە دەعوەتانی دەخۆیی حەرامە، چونکە دەعوەت ناکرێی لە خۆڕا دەچێ. لە وەڵامدا گوتی: وانیە حەڵاڵە، چونکە کاتێ دەچم ڕوو دەکەمە ژووری ژنان، ئەوان دەڵێن: فەرموو کاکە بچۆ هۆو ژورە، پیاو لەوێ دانیشتوون. گوتی: ئەوە دەبێتە دەعوەت.

*****

پیاوێکی تەمبەڵ لە سەفەرێکدا بوو بە هاوڕێی کابرایەک. ڕۆژێک بە تەنبەڵەکە

دەڵێ. بچۆ هێندێک گۆشت بکڕە، کابرا گوتی: وەڵلاهی ناتوانم. کابرا خۆی چوو گۆشتەکەی کڕی و هاتەوە گوتی. دەهەستە وەسەرئاگری نێ با بکوڵی، گوتی قەتم چێشت لێ نەناوە. کابرا بۆخۆی هەستا وەسەری نا، کاتێ گۆ شتەکە کوڵی گوتی: دەهەستە تێیکە، کابرای تەمبەڵ گوتی: دەترسم بەسەر لیباسەکانمدا بڕژێ بۆ خۆت تێیکە. هەستا تێی کرد و گوتی: دەوەرە تێیگوشە، گوتی: قەتم تێنەگوشیوە. کابرا نانی هێنا و تێیگوشی و گوتی: دەوەرە لەگەڵم بخۆ. کابرای تەمبەڵ ڕاست بۆوە و گوتی: وەڵلاهی ئەوەندەم بێ قسەیی کردی شەرم دەکەم ئەمجارە لە قسەت دەرناچم و بەقسەت دەکەم، هات دەستی کرد بەخواردن.

*****

ئاغاوەتی پشدەری ئەگەر میوانێکی نەناسراویان بچوویایە و لە ماڵ نەبوونایە، کە دەهاتنەوە و بەخێرهاتنیان دەکرد دەیانگوت: بەخێر بێی کاکیلە. جارێک (قانیع)ی شاعیر دەچێتە ماڵی یەکێک لە ئاغاکانی پشدەر و کاتێ دەچێ ئاغا لە ماڵ نابێ. وەختێ ئاغا دێتەوە دەڵێ بەخێربێی کاکیلە. قانیع لە وەڵامدا دەڵێ: سەلامەت بی شەویلە.

*****

جارێک (قانیع ) دەچێتە خزمەت شێخ (عەلائەدین) و لەکاتی خواحافیزیدا شێخ بە میرزا ئەحمەد دەڵێ: دوو تەنەکە گەنمی بۆ تێکە. ڕوو دەکاتە قانیع دەڵێ دوعای بەخێریشت بۆ دەکەم. قانیع لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان بیانکە بە چوار تەنەکە و دوعا بەخێرەکە بۆخۆت بێ.

*****

قانیع جارێک شیعرێکی زەم بۆ کاکە (حەمەی) ناری شاعیر دادەنێ. کاکە حەمەش لە وەڵامدا ئەو شیعرەی بۆ دەنێری کە دەڵێ:

ئەتۆ زەمم دەکەی مدحت دەکەم من

جەزای قەولی درۆ با هەر درۆ بێ

*****

کوێخا حەسەنی هەڵوێ لە شەڕی (مەلا خەلیل) دژی ڕەزا شا بەشداریی کردبوو، مەلا خەلیل زۆری خۆشدەویست و کوێخا هەموو ساڵێک دەچوو ماوەیەک لە میراوێ لە خزمەت مەلا خەلیل دەمایەوە. جارێک دەچێ ماوەیەک لەوێ دەبێ و بەیانیەک عەرزی مەلا خەلیل دەکا و دەڵێ: قوربان لە خزمەت مەرەخەس دەبم، مەلا خەلیل دەڵێ: جا حەسەن بۆچی دەچیەوە خۆ مەجلیس لەوە خۆشتر نابێ و کا دەرۆیشیش

لەوە زۆرتر نابن قسەی خۆشت بۆ بکەن، لە وەلامدا دەلێ: بەلێ قوربان وایە، بەلام بێ چەقە چەقی نێو سوێسنیان گوزەران ناکەم دەنا لێرە پلاو و گۆشت دەخۆم، بەلام لە مالی خۆمان هەر خەپلەی هەرزنە.

*****

کابرایەک لەوەختی نان خواردندا دەچێ بۆ مالێک سلاو دەکات و دەلێ: ئەوە چ دەخۆن؟ ئەوانیش ئەوەندەیان پێناخۆش دەبێ، کە لەوکاتەدا چووە، لە داخان دەلێن: ژەهری مار دەخۆین. کابرا لەسەرەخۆ دادەنیشی و دەست دەکا بەخواردن و دەلێ: جا ئەمن لەپاش ئێوە ژیانم بۆ چیە.

*****

ڕۆژێکی دی بەلای کۆمەلێکدا دەڕوا نانی نیوەڕۆ دەخۆن، دەلێ سلاوتان لێ بێ ئەی بەخیلەکان. زۆریان پێناخۆش دەبێ و تورە دەبن کابرا دەلێ: دە ئەگەر وانیە بە درۆم وەخەن، دەلێن دەفەرموو. دادەنیشی و بەو فێلە دەست دەکا بە خواردن لەگەلیان.

*****

مەلایەک دەبێتە مەلای گوندێک. وەختی نوێژ بانگدەدا و نوێژی جەماعەت دادەبەستن. لە دوا سوڕەی (فاتیحا) دەست دەکا بەخوێندنی سوڕەتی (یوسف). خەلکەکە دەزانن کە ئەو سوڕەتە زۆر درێژە، یەک یەک و دوو دوو دەکشێنەوە دواوە و نوێژەکە دەبڕن. مەلا پێدەزانی، لە نوێژەکەیدا دەلێ (سوبحان للە)، (قل هواللەاحد)، خەلکەکە دەگەڕێنەوە و نوێژ دادەبەستنەوە.

*****

دەلێن: مجێوری مزگەوتێک بانگی گوت و لەپاشان دەستیکرد بە ڕاکردن. یەکێک چاوی لێبەو گوتی: کاکە ئەوە بۆ بانگت گوت و دەستت کرد بەڕاکردن ؟ لە وەلامدا گوتی: بۆ ئەوەی بزانم دەنگم تا کوێ دەڕوا.

*****

دەلێن: زانای بەناوبانگ (حەریری) خاوەنی مەقاماتی حەریری هەمیشە وەک ماموستا شێخ (عزالدین) دەستی دەڕیشی وەردەدا و زۆریش دەچووە مەجلیسی ئەمیری (بەسرە). ڕۆژێک ئەمیر گوتی: بۆتۆ جوان نیە ئەوەندە دەست بە ڕیشت دابێنی. حەریری دوای ئەوە دەتگوت دەستی بەستراونەوە، نەیدەزانی چ بکا. ڕۆژێک لە مەجلیسی ئەمیر قسەیەکی زۆرخۆش دەکا، ئەمیر زۆری پێخۆش دەبێ دەلێ. ماموستا چت دەوێ بۆت وەبرم لە پاداشتی ئەو قسە خۆشەدا؟ حەریری زوو

دەڵێ: ریشم وەبڕە. ئەمیر ئەو وەڵامەشی زۆر پێخۆش دەبێ و دەڵێ: لە دەست بەریش داهێنان ئازاد بە و خەڵاتیشی دەکا.

*****

دەڵێن: جولەکەیەک لە ماڵی عەرەبێک دەبێ بەمیوان و شەوێ نەخۆش دەکەوێ و دەمرێ. کابرای عەرەب دەیشوا و کفنی دەکا و نوێژی مردووی لەسەر دەکا. لەپاشان دەست بەرز دەکاتەوە و دەڵێ: ئەی خوای گەورە ئەو بوو بە میوانی ئێمە و خۆشت دەزانی قەدری میوان واجبە. مۆڵەتمان بدە تا تەسلیم بە خاکی دەکەین. جا لەپاشان خۆت و ئەو سەگە کەیفی خۆتە.

*****

رۆژێک پرسیارێک لە (ئەبوزە کەریای واعیظ) دەکەن و دەڵێ: نایزانم. دەڵێن: ئەی کە نازانی بۆ دەچی یە سەر دوانگە و دەست دەکەی بە ئامۆژگاری خەڵک، خۆ مینبەر جێگای ئینسانی نەزان نیە. لە وەڵامدا دەڵێ: ئەمن بەقەدەر زانینەکەم بەرز بوومەوە و گەیشتوومە سەر مینبەر، دەنا ئەگەر بە ئەندازەی نەزانینەکەم بەرز وەبم دەبێ بگەمە ئاسمان.

*****

(جاحیظ) دەڵێ: جارێک چوومە مزگەوتی گەورەکێکی شاری بەسرە و لەلای پیاوێکی ریشدرێژ دوو رکاتم نوێژ کرد و لەوێ دانیشتم. گوێم لێبوو بە نوێژکەرێکی دەگوت سوننەتی پێغەمبەر تەرک مەکە دەچیە بەهەشتێ. کابرا گوتی: کام سوننەت؟ لە وەڵامدا گوتی: خۆشەویستی (ئەبوبەکری عەفان) و ( عوسمانی فاروق) و (عومەری صدیق) و (عەلی) کوری ( ئەبو سفیان) و (موعاویەی) کوری (ئەبوشەیبان). کابرا گوتی: ئەو چوارانە دەناسم بەڵام نازانم موعاویەی کوری ئەبو شەیبان کێ یە. گوتی: چۆن نازانی پیاوێکی باشە و کاتبی وەحی (قورئان) بووە و هەڵگری عەرشی خوایە.

*****

پیاوێکی رەزاگران چوو بۆلای نەخۆشێک، نەخۆشەکە زۆری پێ نارەحەت بوو، کاتی رۆیشتن گوتی: ئەگەر نارەحەت نەبوویتایە رۆژی دووجار دەهاتم بۆلات، نەخۆشەکە گوتی. ئەگەر لە ماڵی خۆشت بی بەلامەوە هەر رەزاگران و خوێن تاڵی، جاخۆ ئەگەر رۆژی دوو جاریش بێی بۆلام، دەمرم. چونکە دوکتۆر (بەختیشوع ) بە(مەئموونی)گوت: قەت لەگەڵ پیاوی رەزاگران دامەنیشە، چونکە زانایان گوتویانە دانیشتن لەگەڵ ئینسانی رەزاگران روح نەخۆش دەکا. (ئەبوبەکری خوارەزمی)

دەڵێ: چاو پێکەوتنی ئینسانی ڕەزاگران لە خنکان و لە نامەی تەلاق نوسین و لە لەدەست چوونی خۆشەویست و لە چاوپیکەوتنی ڕەقیب و لە مالیاتدان و لە دەرمان خواردن و لە مردنی کافر ناخۆشترە، چونکە دەبێتە هۆی ئازاری دڵ و نەخۆشی لەشی ئینسان.

*****

جارێک شاعیری بە ناوبانگ (کلسومی) کوڕی عەتابی دەچێتە مەجلیسی (مەئمون). شێخ (ئیسحاقی) موسڵی کە ئەویش زانا و شاعیرێکی مەشهور بوو، لەوێ دەبێ، بەڵام کلسوم نایناسی کە ئەوە ئیسحاقی موسڵیە، بەڵام دەزانی خەڵکی شاری موسڵە. لە دوای بەخێرهاتن و دانیشتن، کلسوم ڕوو دەکاتە مەئمون و دەڵێ: ئیجازە هەیە پرسیارێک لەو شێخە بکەم؟ دەڵێ فەرموو. کلسوم ڕوو دەکاتە ئیسحاق و دەڵێ: یا شێخ جەنابت کێی و ناوت چیە؟ شێخ دەڵێ: ئینسانێکم ناوم (کل بصل)ە واتە بخۆ پیواز. کلسوم دەڵێ: ئیسحاقی موسڵی پیاوێکی ناسراوە، بەڵام (کل بصل)کەی ناو بووە. شێخ دەڵێ: دیارە زۆر بێ ئینسافی، دەنا چۆن کلسوم ناوە و (کل بصل)ناو نیە؟ خۆ هیچ نەبێ پیواز لە سیر بۆنی خۆشترە، چونکە (کل سوم) یانی بخۆ سیر. کل بە مانای خواردنە و سوم بە سیر دەڵێن (کل بصل)یش، کل واتە بخۆ و (بصل) پیوازە کلسوم بێدەنگ دەبێ، بەڵام مەئمون زۆری پێخۆش بوو.

*****

(حەجاجی سەقەفی) دوو بەندە دەکڕێ، یەکیان پێستی ڕەش بوو، ئەوی دیکەیان سپی بوو. ڕۆژێک حەجاج گوتی: دەبێ هەر یەکەتان ڕباعیەک بڵێن: کە مەدحی خۆی و زەمی ئەویدی بێ. ڕەشەکەیان هەڵی دایە و گوتی:

أَلَم تَرَأَنَّ الْمِسْكَ لاشَيْءَ مِثْلَهُ     وَأَنَّ بَيَاضَ اللِّفْتِ حِمْلٌ بِدِرهَمِ
وَأَنَّ سَوادَ الْعينِ لاشكَّ نوُرُها     وَأَنَّ بَيَاضَ الْعينِ لاَ شَيْءَ فَاعْلَمِ

یانی ، ئەتۆ نابینی کەمیسکی ڕەش بۆنی چەند خۆشە و هیچ شتێک بۆنی وەک ئەو خۆش نیە، بەڵام شێلمی سپی تایەکی بە درەمێکە، یان تەماشا بکە ڕووناکایی چاوان لە گلێنە ڕەشەکەی دایە و سپێنەکەی هیچ نیە ئینجا پێست سپی هەڵی دایە و گوتی:

أَلَمْ تَرَأَنَّ الْبَدْرَ لاَ شَيْءَ مِثْلَهُ
وَأَنَّ سَوا دَ الْفَحْمِ حِمْلٌ بِدِرْهَمِ
وَأَنَّ رِجالَ اللّٰهِ بيضُ وُجوُهُهُمْ

وَلاَ شَكَّ أَنَّ السُّودَ أَهْلُ جَهَنَّمِ

واتە، ئەتۆ نابینی کە مانگە شەو چەند خۆشە، چونکە رووناک و سپی یە و هیچ شتێک وەک ئەو خۆش نیە، بەلام خەلووز چونکی رەشە تایەکی بە درهەمێکە. یان نازانی کە پیاوی خوا دەم و چاو و ناوچاوانیان سپی یە، بەلام بێ شک، رووڕەش دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

*****

ئافرەتێکی ژیرو وریا خۆی ئامادە کردبوو بروا بۆ سەفەرێک. پیاوێکی بێشەرم گوتی: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ ئافرەتەکە گوتی دەچم بۆ فلان جێگا. کابرا بەدەستی ئیشارەی بۆ ئالەتی کرد و گوتی زۆر سوپاست دەکەم ئەو نامەیەم بێ لەگەل خۆت بەرە. ئافرەتەکە زۆر لەسەرخۆ وەلامی دایەوە و گوتی زۆرباشە، ئەگەر تووشی دایکت نەبووم دەیدەم بەخوشکەکەت.

*****

دەلێن: پاشایەک خەیالی سەفەری کرد. (ئەستێرە) ناسێک گوتی: قوربان سەبر بگرە چونکە ئێستا مانگ لە بورجی (عەقرەب) دایە و سەفەر کردن لەوکاتەدا زۆر شوومە، با مانگ بچێتە بوورجی (قەوسەوە). پاشا خەریک بوو لە رۆین پەشیمان وەبێ. لەوکاتەدا غولامێکی زۆرجوانی تیروکەوانی لەخۆدا بوون وەژورکەوت یەکێک لە پیاوە قسەخۆشەکانی پاشا گوتی: قوربان ئەوەتا مانگ چۆتە ناو قەوسەوە فەرموو با برۆین بۆ سەفەرەکە، دەلێن پاشا قسەکەی زۆر پێ خۆشبوو، چوون بۆ سەفەرەکە و زۆر سەرکەوتوو بوون و زۆر خۆشیان رابوارد.

*****

(ئیبنو خەلەکان) دەلێ: ئیمامی (شافیعی) فەرموویەتی: ئیمام محەممەدی کوڕی حەزرەتی حەسەن نەبێ کەسم نەدیوە کە بە قەلەوی عاقل و ئاسودە بێ. دەفەرمووێ: چونکە پیاوی عاقل، یان خەمی دواڕۆژ دەخوا، یان خەمی دنیا. ئەوەی غەمباریش بێ قەت قەلەو نابێ.

جا ئیبنو خەلەکان دەلێ: حەسەنی کوڕی ئیدریسی حەلوانی لەسەر ئەو قسەی ئیمامی شافیعی گوتویەتی: پاشایەک زۆر قەلەو بوو، زۆری پێ نارەحەت بوو. زانا و دوکتۆری کۆکردنەوە بۆ ئەوەی چارەی قەلەویەکەی بکەن. نەیانتوانی. تا پیاوێکی عاقل و زانا هات بۆلای پاشا. پاشا گوتی: ئەگەر تۆ بتوانی چارەی ئەو قەلەویەم بکەی دەولەمەندت دەکەم. کابرا گوتی: جەنابی پاشا ئەمن دوکتۆر و ئەستێرە ناسم، ئەم شەو مۆلەتم بدە بەیانی عەرزت دەکەم داخوا ئەستێرەی بەخت و تالیعت

چۆنە. بەیانی کابرا هاتەوە گوتی: پاشا تا ئەمانم نەددی هیچ قسە ناکەم. پاشا گوتی: ئەمین بە. ئەوە ئەمانم دایەی. کابراگوتی قوربان ئەم شەو تەماشای ئەستێرەی بەخت و تالعی تۆم کرد، بەڵام زۆر بەداخەوە مانگێکت تەمەن ماوە. ئەگەر دەفەرمووی تا خەریکی موعالەجەت بم و ئەگەر دەشتەوێ بزانی داخوا قسەکەم ڕاستە یان نا، ئەوە زیندانیم بکە. جا ئەگەر ڕاست بوو ئەوە ئازادم کە و ئەگەر خواش کردی کردی درۆم کرد، گەردنت ئازاد بمکوژە. پاشا زۆر ناڕەحەت بوو گوتی: حەبسی بکەن. پاشا دەستی لە دنیا شوشت و بە غەمباری ڕووی کردە گۆشەنشینی و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ناڕەحەت تر دەبوو. لەپاش بیست و هەشت ڕۆژان کە زۆر لاواز ببوو، ناردی کابرایان لە بەندیخانەوە هێنا. پاشا ڕووی تێکرد و گوتی: لە وەعدەکەت دوو ڕۆژ ماون ئێستا دەڵێی چی؟ کابرا گوتی: پاشا سەلامەت بێ، بەخوا ئەمن هیچ عیلمی غەیبی نازانم، خۆ ئەمن نازانم خۆم کەی دەمرم، جا چۆن هی تۆ دەزانم، بەڵام ئەوشەوە زۆرم فکر کردەوە لە غەم و خەفەت بەولاوە چارەی قەڵەویم نەدۆزیەوە و بەو فێڵەش نەبوایە، ئەوەندە غەمبار نەدەبووی. ئەوەتا ئێستا قەڵەویەکەی جارانت نەماوە. پاشا هاتەوە سەرخۆ و کابرای خەڵات کرد.

*****

(ئەبو جەعفەری مەنسور) لە زەمانی بەنی ئومەویەکاندا کە دەچووە شاری بەسرە و بە زۆری دەچوو لەلای (ئەزهەری سەممان) کە زانایەکی حەدیس زان بوو دادەنیشت، چونکە زۆر قسەخۆش بوو. کاتێ بوو بە خەلیفە، زاناکە لە بەسرەوە هات بۆ بەغدا بۆلای. ئەبو جەعفەر زۆری ڕێز لێگرت و گوتی: چ ئەمرێکت هەیە؟ گوتی: قوربان خانوەکەم ڕوخاوە و چوارهەزار درهەم قەرزدارم و ژنیش بۆ محەممەدی کورم دێنم. ئەمری کرد دوازدە هەزار درهەمیان دایە و گوتی: ئەوەی پێویستت بوو بۆمان کردی، جارێکی دی مەیەوە. دوای ساڵێک ئەزهەری هاتەوە. پاش بەخێرهاتن، ئەبو جەعفەر گوتی: بۆچی هاتیەوە؟ گوتی: قوربان بۆ ئەحواڵپرسیت. ئەمری کرد دوازدە هەزار درهەمیان دایە و گوتی: جارێکی دی مەیەوە بۆ ئەحواڵپرسیم. دوای ساڵێک دوبارە هاتەوە. ئەبو جەعفەر گوتی: بۆچی هاتیەوە؟ گوتی: قوربان بۆ ئەوەی کە سوپاست بکەم. ئەبو جەعفەر ئەمری کرد دوازدە هەزار درهەمی دیکەیان دایە و گوتی جارێکی دی نەبۆ عەیادەت و نەبۆ سوپاس مەیەوە. دوای ساڵێک دوبارە هاتەوە. ئەبو جەعفەر گوتی: نەمگوت مەیەوە بۆچی هاتیەوە؟ گوتی: قوربان جاری پێشو گوێم لێبو کە دوعایەکت دەخوێند هاتووم وەینوسم. ئەبو جەعفەر زۆر پێکەنی و گوتی: ئەو دوعایە قەبووڵ نابێ

مەینووسەوە، چونکە هەتا ئیستا چەند جارە دەیخوێنم بۆ ئەوەی تۆ نەبینمەوە، کەچی ئەودتا هەر دێیتەوە. ئەو هەزارد بگرە و هەرکاتێ پێتخۆ ش بوو وەرەود.

*****

رۆژێک جولەکەیەک وەک رەخنە لە موسوڵمانان بە ئیمامی عەلی دەڵێ: ئیستا پێغەمبەرەکەتان بە تەواوی نەمرد بوو کە لەسەر جێنشینی لێتان بوو بە هەرا و ئەنسارییەکان گوتیان با ئەمیرێک لە ئێمە بێ و یەکێک لە ئێوە بێ، جا تەماشا ئیمامی عەلی چۆن ژیرانە دەمکوتی کرد و فەرمووی: ئەی ئێوە ئیستا قاچوو وشک نەببونەوە کە لە بەحرەکە پەڕینەوە، خواتان لەبیرچووە و گوتتان: (يامُوسىٰ اجْعَلْ لَنَا إِلَٰهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ)، واتە ئەی موسا، خوا یەکی وەک خواکانی ئەو بت پەرستانەمان بۆ پەیدا بکە. جولەکە خەجاڵەت بووە و بۆری خوارد.

*****

رۆژێک لە مەجلیسی (المتوکل)ی خەلیفەی عەباسی دا باسی حەزرەتی عوسمانیان کرد. ئەویش گوتی: خەلک چەندین رەخنە یان لە عوسمان هەیە، بۆ نموونە حەزرەتی ئەبوبەکر کە بوو بەخەلیفە و چووە سەر مینبەر لەبەر حورمەتی پێغەمبەر پلەیەک هاتەخوارێ و حەزرەتی عومەر لەبەر حورمەتی پێغەمبەر و ئەبوبەکر دوو پلە، بەڵام عوسمان کەبوو بە خەلیفە چووە سەر ئاخرین پلەی مینبەرەکە. پیاوێکی نەترس لە مەجلیسەکەدا وەدەنگ هات و گوتی: ئەی خەلیفە، تۆ باسی حەزرەتی عوسمان بە خەراپە مەکە و هەر سوپاسی بکە، چونکە ئەگەر ئەویش بهاتایە پلەی سێیەم دەبوو بە یاسای خەلیفەکان و دەبوو ئیستا جەنابت لەناو بیرێکدا خوتبەت بۆ وەخوێندینایە. خەلیفە و خەلکەکە دەستیان کرد بەپێکەنین.

*****

پیاوێک دەڵێ: جارێک چوومە مزگەوتی شاری (دیمشق) کۆمەڵێک دانیشتبوون وەک زانایان دەچوون. چووم لە نزیکیان دوو رکاتم نوێژ کرد و دانیشتم گوێم لێ بوو بە خراپە باسی حەزرەتی عەلی یان دەکرد. بە تورەییەوە هەستام. تەماشام کرد پیاوێکی ریشدرێژی ناوچاوان جوان لەولا نوێژی دەکرد. گوتم وادیارە پیاوی چاکە، چوومە لای و کە سلاوی دایەوە گوتم: مامە گیان ئەوانە بۆچی وا بە خەراپە باسی حەزرەتی عەلی دەکەن؟ نازانن کە کوڕی مامی پێغەمبەرە و مێردی فاتمەی زەهرایە؟ کابراگوتی: کاکە باسی چ دەکەی؟ ئەگەر یەکێک لە دەست و زمانی ئەو خەلکە ڕزگاری بوایە دەبوو (ئەبو محەممەد) بێ، باسی ئەویش بە خەراپە دەکەن، تا

ددگاته ئیمامی عەلی. گوتم: ئەبو محەممەد کێ یە؟ دەستی کرد بە گریان و گوتی: حەجاجی سەقەفی. کە ئەودم لە پیرە بیست سوێندم خوارد لەو شارە نەمێنم.

*****

کابرایەک خانوێکی بوو فرۆشتی و لەپاشان هەموو رۆژێ پێنج فەرزە دەچوو لەبەر دەرگای مزگەوتی نزیک خانوەکەی بانگی دەدا. رۆژێک لە دوای بانگدان و نوێژ کردن یەکسەر چووە خانوە کۆنەکە و بێ لە دەرکە دان چووە ژوورەوە، ژنان کە چاویان پێکەوت، هاواریان کرد و گوتیان: چۆن بەبێ پرس هاتیە ژوورەوە؟ کابرا گوتی: لێم ببورن، ئەمن لەو خانوەدا لە دایک بووم و لەبیرم چوو بۆوە کە فرۆشتوومە.

*****

لە پیاوێکی لادێیی یان پرسی: ئەرێ ئەمسال رەمەزانو چۆن گرت؟ لە وەڵامدا گوتی: وەڵڵا، زۆر خۆشبوو. گوتیان: ئاخر ئەمسال زۆر گەرم بوو. گوتی: ئێمە دەستی خۆمان لێوەشاند، یەکەم شەو سی پیاومان کۆبووینەوە و نیەتمان هێنا و بەیانی بەرۆژو بوین و بە رۆژێک خلاسمان کرد و خۆمان ئاسودە کرد.

*****

قوتابییەک چووە قوتابخانە و مامۆستاکەی دەستی کرد بە لێدانی، گوتیان: ئەوە بۆچی لێی دەدەی خۆ هیچ گوناحێکی نەکردووە؟ لە وەڵامدا گوتی: بۆ ئەوەی لە پێشدا لێی دەدەم هەتا بترسی و بێ ئەمریم نەکا.

*****

لە بارەی سەخاوەت و کەرەمەوە (ئەسمەعی) دەڵێ: رۆژێک چووم بۆلای پیاوێکی سەخی، داوای شتێکی لێ بکەم. تەماشام کرد بە پێچەوانەی جاران دەرکەوانی دانابوو، بۆ ئەوەی کەس نەچێتە لای، نەیهێشت بچمە ژوورەوە. لەپاشان دەرکەوانەکەی گوتی: بەخوا منی بۆ ئەوە دانەناوە کە نەهێڵم یەکی وەک تۆ بچێ بۆلای، بەڵکو لەبەر ئەوەیە، چونکە بەراستی زۆر دەست کورتە. ئەسمەعی دەڵێ: منیش ئەو شیعرەم نوسی و بۆم ناردە ژوورەوە.

(إِذا كَانَ الْكَرِيمُ لَهُ حِجابٌ فَما فَضْلُ الْكَرِيمِ عَلَى اللَّئِيمِ).

واتە، ئەگەر پیاوی سەخی و خاوەن کەرامەت دەرکەوانی هەبێ لەگەڵ پیاوی بەخیل و رژد و سەقیلدا فەرقی چیە؟ دەرکەوانەکە بردی و هاتەوە لە پشتی کاغەزی شیعرەکەی منەوە نوسیبووی. (إذا كانَ الكَرِيمُ قَلِيلَ مالٍ تَحَجَّبَ بِالحِجابِ عَنِ الغَرِيمِ). واتە، ئەگەر پیاوی سەخی دەستی کورتبوو خۆی لە قەرزداران

دەشاریتەوە. پێنج سەد دیناریشی لەگەڵ نارد بوو. ئەسمەعی دەڵێ: زۆرم بەلاوە سەیر بوو، گوتم: بەخوا ئەوە بە مەئموون ڕادەگەیێنم. چووم بۆلای و ئەو ڕووداوەم بۆ گێڕایەوە و کیسە دراوەکەم نیشاندا. کە تەماشای کرد گوتی: ئەوە پارەی (بەیت و ماڵە) بچن ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکەن. چوون کابرایان هێنا و مەئموون گوتی: تۆ دوێنێ نەهاتی سکاڵای فەقیری خۆت کرد و ئەو پارەماندا بەتۆ؟ بۆچی بە شیعرێک داوتە بە ئەسمەعی؟ کابرا گوتی: قوربان بەخوا درۆم لەگەڵ نەکردی، بەڵام حەیام کرد لە خوا کە ئەوەی هاتووە بۆلام بەدڵ شکاوی وەلامی بدەمەوە و پارەکەم دایە. مەئموون زۆری پێ خۆشبوو گوتی: بەڕاستی هەتا ئێستا عەرەبان پیاوی وەک تۆیان نەبووە، زۆری ڕێز لێگرت و کردی بە پیاو ماقوڵی خۆی.

*****

شێخی (قورطوبی) دەڵێ: یەکەم کەس کە ئینکاری قەرز دانەوەی کرد حەزرەتی (ئادەم) بوو. چونکە کاتێ خوای گەورە تەواوی بەرەی ئادەمیزادی نیشاندا، ئادەم گوتی: ئەی خوای گەورە ئەو کوڕە جوانە کێ یە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەوە داودە. ئادەم گوتی: ئەی خوای گەورە تەمەنی چەندە بێ لە دنیادا؟ خوا فەرمووی شێست ساڵ. ئادەم گوتی. تکات لێ دەکەم بۆی زیاد بکەی. خوای گەورە فەرمووی زیادی ناکەم. مەگەر تۆ لە تەمەنی خۆتِ بۆی بخەیتە سەر. ئادەم گوتی: تەمەنی من چەندە؟ خوا فەرمووی: هەزار ساڵ. ئادەم گوتی: ئەوە چل ساڵم دا بە داود. خوای گەورە نوسی و بە مەلائیکەکانی ئیمزا کرد. کاتێ ماوەی ژیانی ئادەم تەواو بوو، (ئیزرائیل) هات گیانی بکێشی، گوتی: ئەوە چ دەکەی؟ گوتی: هاتووم گیانت بکێشم. ئادەم گوتی: خۆ چل ساڵم ماوە. (ئیزرائیل) گوتی: ئەی نەددا بە داودی کوڕت؟ گوتی نا. بە ئەمری خوا قەبالەکەیان هێنا و نیشانیاندا بێدەنگ بوو.

*****

دەڵێن: محەمەدی کوڕی (جەهمی) گوتبووی خانوەکەم دەفرۆشم بە پنجا هەزار. موشتەری چوون گوتیان بە چەندی دەدەی؟ لە وەلامدا گوتی: دراوسێیەتی (سەعد)ی کوڕی (عاصم) دەفرۆشم بە چەندم لێ دەکڕن؟ گوتیان بۆ دراوسێیەتیش دەفرۆشی؟ گوتی: بەڵێ چۆن دراوسێیەتی کەسێک نافرۆشرێ کە خەراپەت لەگەڵ کرد ئەو چاکەت لەگەڵ بکا و کە داوات لێکرد قەت بێدڵیت نەکا و کە ڕووت لێ وەرگێرا ئەو ڕووت تێ بکا. سەعدی کوڕی عاسم ئەو قسەی بیستەوە پارەکەی بۆ نارد و گوتی: ڕازی نابم بە دراوسێیەتی من ڕازی نەبی و خانوەکەت بفرۆشی.

*****

له کتێبی (اَلفَرَجُ بَعدَالشِدَةَ)دا دەڵێ: کابرایەک لە شاری بەغدا گوتی ماڵێکی زۆرم بەمیرات بۆهاتەوە، بەڵام لە ماوەیەکی کورتدا هەمووم خەرج کرد، تا وام لێهات خەریک بووم خانوەکەم بفرۆشم. نانی شەوم نەمابوو، دایکم تەشی دەڕست بە پارە بۆ خەڵک، ئەویش دەری نەدێنا، مردنی خۆم زۆر لەو ژیانە پێخۆشتر بوو. شەوێک لە خەودا گوتیان هەستە بچۆ بۆ میسر تۆ لەوێ دەوڵەمەند دەبی. بەیانی زوو لە خەو هەستام و چووم بۆ ماڵی قازی (ئەبو عومەر). لەبەر ئەوەی کە باوکم زۆری خزمەت کردبوو، خزمەتکارەکەی ڕێگای دام چوومە خزمەتی و داوای نامەیەکم لێکرد بۆ ئەوەی لەوێ یارمەتیم بدن. نامەکەی بۆ نوسیم و بەرە و میسر وەڕێ کەوتم، کاتێ گەیشتمە میسر نامەکەم گەیاند، بەڵام هیچ فایدەی نەبوو. خوای گەورە دەرگای ڕزقی لێ پێچیووە دابووم، ئەوەی پێشم بوو خەلاس بوو. بیرم لە سوالکردن دەکردەوە ئەویشم زۆر پێ عەیب و حەرام بوو. تا نیوەشەو هەر دەخولامەوە، لەناکاو تووشی حەرەسی ناو بازاڕ بووم، کە زانی غەریبەم گرتمی و گوتی: چکارەی؟ باسی بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕایەوە. کابرا پێکەنی و گوتی: بەخوا تا ئێستا لە تۆم کەرتر و ئەحمەق تر نەدیوە. ئەوە چەند ساڵە لە خەودا پێم دەڵێن هەستە بچۆ بۆ بەغدا بۆ فلان گەڕەک و فلان کوچە و فلان خانوبەرە، بەو نیشانەی کە لە ناوەڕاستی حەوشەکەیدا دارێکی (سیدری) تێدایە. لەبن ئەو دارە کوپەیەکیان شاردۆتەوە، سی هەزار دیناری تێدایە، بەڵام هەتا ئێستا گوێم نەداوەتێ. کەچی تۆی ئەحمەق بەهۆی خەونی شەوێکەوە وڵاتی خۆت بەجێ هێشتووە و هاتووی بۆ میسر. ئەو ناوونیشانانەی کە حەرسەکە گوتنی ڕاست ناوونیشانی ماڵی ئێمە بوو، تۆزێک هاتمەوە سەرخۆ و کابرا بەریدام. ئەو شەوە چوومە مزگەوت نوستم و بەیانی بەرەو بەغدا وەڕێکەوتمەوە و یەکسەرە چووم بن دارەکەم هەڵکەند، کوپەیەکی تێدابوو، کە پارەکەم حیساب کرد ڕاست سی هەزار دینار بوو.

*****

شێخ (شەهابەالدین) لە کتێبی (مستطرف)دا دەڵێ: دوو پیاوی ئەحمەق لە سەفەرێکدا بوونە هاوڕێ یەکیان بە ئەویتری گوت: ئەو ڕێگایە بە قسەکردن نەبێ تەواو نابێ. وەرە با نیازی دڵی خۆمان بەیەکتر بڵێین. کابرا گوتی باشە، تۆچ لە خوا داوا دەکەی؟ گوتی ئەمن لە خوام دەوێ مێگەلێکم مەڕ و بزن بداتێ. هەتا شیر و گۆشتەکەیان بخۆم و خوری و تووکەکەشیان بفرۆشم. ئەویتریان گوتی منیش داوام لە خوا ئەوەیە کە چەند گورگێکم بداتێ تا هەموو مەڕ و بزنەکانی تۆ بخۆن. لەسەر ئەوە لێیان بوو بە شەڕ و دە[illegible]دایە ئێخەی یەکتر. ئاخری هاتنە سەر

ئەوە کە شەڕ نەکەن و یەکەم کەس کە تووشی بوون، بیکەن بە حەکەم. زۆر نەڕۆ یشتن تووشی پیاوێک بوون کەرێکی پێ بوو دوو خێگە دۆشاوی لێ نابوو. بەسەرهاتی خۆیان بۆ گێڕایەوە و گوتیان تومان بە حەکەم قبوولە چی بڵێی لە قسەت دەرناچین. کابرا بارەکەی خست و زارکی خێگەکانی کردەوە و دۆشاوی وەبەرزێ گێڕا و گوتی: یا خوا خوێنی من وەک ئەو دۆشاوە برژێ کە کەس لە ئێوە کەرتر و ئەحمەق تر بێ.

*****

کابرایەک تەماشا دەکا ژنەکەی بە نێردیوانێکدا سەردەکەوێ. گوتی: ئەگەر لەوە زیاتر سەر کەوی یان بێیتەخوارێ یان هەرلە جێگای خۆت ڕاوەستی هەرسێ تەلاقت بکەوی. ژنەکە زۆر وریا بوو، گورج خۆی بەردایەوە. کابرا زۆری پێخۆش بوو گوتی: یاخوا بەفیدات بم، ئەگەر ئیمامی (مالیک) وەفات بکا، خەڵکی شاری (مەدینە) پێویستیان بەتۆ دەبێ بۆ فتوادان.

*****

جارێک (مەهدی) خەلیفەی بەغدا کاتی ڕاو لە لەشکرچییەکانی دوور دەکەوێتەوە و ڕوو دەکاتە ڕەشماڵی عەرەبێک و دەڵێ: میوان ڕادەگرن؟ خاوەن ماڵەکە دەڵێ: بەڵێ. خەلیفە دادەبەزێ و خاوەن ماڵ نانێک و پیاڵەیەک شیری بۆ دێنێ و دەڵێ فەرموو. خەلیفە نان و شیرەکە دەخوا. کابرا لە کوپەیەکدا کاسەیەک شەڕابی بۆ تێدەکا و دەڵێ فەرموو خەلیفە ئەویش دەخواتەوە و ڕوو دەکاتە کابرا و دەڵێ دەزانی ئەمن کێم؟ کابرا دەڵێ: نازانم خەلیفە دەڵێ: ئەمن پیاوی تایبەتی ئەمیری موسوڵمانانم. کابرا کاسەیەکی دیشی بۆ تێدەکا و دەیخواتەوە. ئینجا خەلیفە دەڵێ: دەزانی ئەمن کێم؟ دەڵێ بەڵێ پیاوی تایبەتی ئەمیری موسوڵمانانی. خەلیفە دەڵێ نا هەو نیم. کابرا دەڵێ: ئەی چی؟ خەلیفە دەڵێ گەورەی لەشکری خەلیفەم. کاسەیەکی دیشی بۆ تێدەکا، دەیخواتەوە و دەڵێ دەزانی ئەمن کێم؟ دەڵێ بەڵێ گەورەی لەشکری ئەمیری موسوڵمانانی. دەڵێ نا هەو نیم. کابرا دەڵێ: ئەی چی؟ دەڵێ ئەمن ئەمیری موسوڵمانانم. کابرا ڕاست دەبێتەوە و توند زارکی کوپەکە دەبەستی و دەڵێ: هەستە برۆ بەخوا هیچی دیکەت بۆ تێناکەم و خوا حافیزت نەبێ. کاسەیەکی دیکەت بۆ تێکەم دەڵێی ڕەسوڵی خوام، مەهدی زۆر پێدەکەنی و لەوکاتەدا پیاوەکانی دەگەنێ و کابرا خەڵات دەکا.

*****

دەڵێن: عەرەبێک لەسەر پێشاوێ دانیشتبوو گوێ دەکرد و نانی دەخوارد و

خۆشی دەدوزی. گوتیان: جا چۆن وادەبێ؟ لە وەڵامدا گوتی بۆ نابێ. کۆنەکەی فڕێ دەدەم و تازەی تێدەکەم و دوژمنان دەکوژم، لەوە باشتر چ دەبێ؟

*****

کابرایەک دەچێ دەبێ بە میوانی ( یەزیدی) کوڕی (مەزیدی). کاتی نان خواردن (یەزید) دەڵێ: کوڕینە تۆزێک پاڵ وێکدەن و جێگای بکەنەوە با دەستی بگاتێ. کابرا دەڵێ: نا زەحمەت مەکێشن تەنافەکەم درێژە، دەیگاتێ. یانی باسکم درێژن. کاتێ دەست درێژ دەکا بۆ خواردنەکە بایەکی لێ دەبێتەوە. یەزید لەسەرەخۆ دەڵێ: لام وایە تەنافەکەت هەودایەکی پسا. کابراش لە سەرەخۆ دەڵێ هیچ نیە گرێی دەدەمەوە.

*****

تەماشایان کرد کابرایەک چۆتە ناو حەوزێکەوە و بەنێکی بەدەستەوە گرتووە، هەر جارەی کە خۆی تێهەڵدەکێشی گرێیەک لە بەنەکە دەدا. گوتیان: ئەوە چ دەکەی؟ لە وەڵامدا گوتی. ئەمساڵ زستانەکەی زۆر سارد بوو (غوسلی) لەش پیسیم لەخۆم دەرنەکردووە، ئێستا قەزایان دەکەمەوە.

*****

دەڵێن: عەرەبێک ناوی مووسا بوو، کیسە پارەیەکی دزی و چو بۆ مزگەوت بۆ نوێژ. کاتێ نوێژیان دابەست و مەلا دەستی کرد بە سوڕەت خوێندن، گەیشتە ئەو ئایەتە کە دەڵێ: (وَمَاتِلْكَ بِيَمِينِكَ يامُوسىٰ) واتە ئەوە چیە بەدەستی ڕاستتەوەیە ئەی مووسا؟ کابرا توڕە بوو و گوتی: بەخوا وادیارە ئەو مەلایە سیحر بازە. پارەکەی فڕێدا و ڕایکرد.

*****

دەڵێن: عەرەبێک دەچێ بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت. نوێژ دادەبەستن و مەلا دەگاتە سەر ئەو ئایەتە کە دەڵێ: ( قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ اللّٰهُ وَ مَنْ مَعِيَ أَوْ رَحِمَنا). واتە تۆ بڵێ ئەگەر دیمن خوای گەورە من و ئەوانەی لەگەڵ منن بە هیلاکی بردن، یان ڕوحمی پێکردن. کابرای عەرەب توڕە بوو هاواری کرد و گوتی: یاخوا مەلا هەرخۆت بەهیلاک بچی. جا ئەوانەی لەگەڵ تۆن چ گوناحێکیان هەیە؟ نوێژەکەی بڕی و چووە دەرەوە. خەڵکەکەش لەبەر پێکەنین نوێژەکەیان بڕی.

*****

دوو کەس دەچنە لای قازی. یەکیان دەڵێ جەنابی قازی (تەنبور)ێکم لەلای ئەو پیاوەیە نامداتەوە. کابرا دەڵێ: جەنابی قازی درۆ دەکا. قازی بە خاوەنی تەنبورەکە

دەڵێ: شاهیدت هەیە؟ دەڵێ بەڵێ قوربان. دەچێ دوو شاهیدان دێنێ، دەڵێن بەڵێ جەنابی قازی ئەو پیاوە ڕاست دەکا. کابرای داوا لێکراو دەڵێ: جەنابی قازی لە شاهیدەکان بپرسە و بزانە کاریان چیە. قازی دەڵێ: کورم شوغڵتان چیە؟ یەکیان دەڵێ ئارەق فرۆشم و ئەویتریشیان دەڵێ: قوربان منیش (جلادم). واتە تۆڵە وەستێنم. قازی دەڵێ: شاهیدی (تەنبور) لەوانە باشتر نابێ، کورم بچۆ تەنبورەکەی بدەوە.

*****

جارێک (هارونەڕەشید) چەند پیاوێکی ڕیشدرێژی لە مەجلیسدا دەبن و چەند کوڕی گەنجی ڕیش نەهاتووش خزمەت دەکەن. قسە دێتە سەرباسی کابرایەک کە داوای پێغەمبەری دەکا لە شاری بەغدا. هارونڕەشید تورە دەبێ و دەڵێ: هەرئێستا بچن بۆم بانگ بکەن. فەوری دەچن دەیهێنن بۆلای هارونەڕەشید و دەڵێ: ڕاستە داوای پێغەمبەری دەکەی؟ کابرا دەڵێ: بەڵێ هارونەڕەشید زۆری پێ سەیر بوو، گوتی: باشە بەڵگەت لەسەر پێغەمبەریت هەیە؟ گوتی چ داوا دەکەی فەرموو. هارونەڕەشید گوتی: ئەو گەنجە دەم ڕوتانە بکە بە ڕیشدار. کابرا تۆزێک ڕاما و پاشان گوتی: قوربان چۆن دڵم دێ ئەو دەم ڕوتە جوانانە ناشیرین بکەم، ئەگەر دەفەرمووی هەتا ئێستا بە دەقیقەیەک ئەو ڕیشدارانەت بۆ بکەم بە کۆسە. هارونەڕەشید زۆر پێکەنی و گوتی: برۆ هەر پێغەمبەر بە.

*****

دوبارە دەڵێن لە زەمانی (مەئمون)دا یەکێک پەیدا بوو داوای پێغەمبەری دەکرد، چوون هێنایان بۆلای مەئمون. مەئمون گوتی: بەڵگەت لەسەر پێغەمبەریت چیە؟ کابرا گوتی: بەڵگەم ئەوەیە ئێستا دەزانم دڵی جەنابت دەڵێ چی؟ گوتی دەڵێ چی؟ کابرا گوتی دەڵێ درۆ دەکا پێغەمبەر نیە. مەئمون ئەمری کرد بردیان بۆ بەندیخانە. پاش ماوەیەک بانگیان کردەوە بۆلای و گوتی: لەو ماوەی بەندیخانەتدا وەحیت بۆ نەهاتووە؟ کابرا گوتی نەخێر مەئمون گوتی: بۆچی؟ کابرا لە وەلامدا گوتی: چونکە (مەلائیکە) ئەت ڕوو ناکەنە بەندیخانە. مەئمون زۆر پێکەنی و ئازادی کرد.

*****

سوالکەرێک دەچێتە بەر دەرگای ماڵێک و دەڵێ: ڕەحمەتی خواتان لێ بێ (قران)ێکم بدەنێ، لە وەلامدا گوتیان خوا بتداتێ نیمانە، گوتی: هێندێکم گەنم بدەنێ، گوتیان نیمانە، گوتی نیسک بێ، نۆک بێ، ئارد بێ، جۆ بێ هەر باشە، گوتیان: نیمانە. گوتی: ڕۆنیش بێ هەرباشە، گوتیان: نیمانە. گوتی دەچۆڕێکم ئاو

بدەنێ، گوتیان ئاویشمان نیە. سوالکەرەکە گوتی: کەواتە مال نەوێرانینە بۆ لێرە دانیشتوون، هەستن برۆن سوال بکەن، خۆ وادیارە ئێوە لە من موستەحەق ترن بۆ سوالکردن. کابرای سوالکەر ئەوەی پێی دەبێ بۆیان دادەنێ و دەڕوا.

*****

جارێک ئارەقخۆرێک ئارەقی خواردەوە و شەشدانگ مەست دەبێ. بەلای مزگەوتێکدا دەڕوا، لەو کاتەدا مجێوری مزگەوتەکە بانگ دەدا، دەنگی زۆر ناخۆش دەبێ. کابرای سەرخۆش دەچێ دەست دەکا بە لێدانی و بە پێلاوان دەچێتە سەر سینگی. دەچن دەیگرن و دەڵێن: ئەوە بۆ وا لەو فەقیرە دەکەی؟ لە وەلامدا دەڵێ: خۆ بە خوا لەبەر ئەوە لێی نادەم کە دەنگیم پێناخۆشە. لەبەر ئەوە لێی دەدەم چونکە بەهۆی دەنگە ناخۆشەکەیەوە هەموو گاور و جولەکە لۆمەی موسولمانان دەکەن.

*****

جارێک پیاوێکی فەقیری دەست کورت لەگەڵ کورەکەی بە کۆلانێکدا دەڕۆن، لەوکاتەدا جەنازەیەک لە ماڵێک دێننەدەر و دەیبەن بۆ سەر قەبران. ئافرەتێک بە دوایدا دەگری و لەخۆی دەدا و دەڵێ: یاخوا کوێر بم، ئێستا دەیبەن بۆ ماڵێک، نە فەرشی تێدا ڕاخراوە، نە دۆشەک و پشتی تێدایە. کورەکەی لە بابی نزیک دەبێتەوە و دەڵێ بابە ئەوە دەیبەن بۆ ماڵی ئێمە؟

*****

حاجی مەلا عەزیزی (واعیظی) لە سەردەشتێ گوتی: لە زەمانی ڕەزا شادا دوکانم هەبوو. پیاوێک بە ناوی (میرئات) قازی لەشکری بوو. زۆرجار دەهات لەلام دادەنیشت. وا ڕێکەوت گیرام و بردیانم بۆ زیندانی قەسری قەجەر و تا سێ ساڵ لێیان نە پرسیم. لە زیندانا دڵخۆشی خەڵکم دەدایەوە و دەمگوت: (الصبر مفتاحُ الفرج) یانی خۆڕاگرتن لەسەر بەلا و موسیبەت دەرگای لابردنی غەم و پەژاردت بۆ دەکاتە. کابرایەکی عەجەم لە وەختی ئامۆژگاری کردنەکەمدا هات و گوتی: واعیظی گوتم: بەڵێ. بە فارسی ئەو شیعرەی خوێندەوە و گوتی:

گەر بچەسپانەند بە کونەت یەک ئەرەج
سەبر کون الصبر مفتاح الفرج

یانی ئەگەر پەرۆیەکی دوو بستی یان لە قوونێ دای هەر سەبر بگرە، چونکە سەبر کلیلی کردنەوەی دەرگای غەم و پەژاردیە. گوتی: لەپاش سێ ساڵ بردیانم بۆ دادگا، لە ڕێگادا تووشی (میرئات) بووم، کە چاوی پێم کەوت گوتی واعیظی ئەوە چیە؟ بەسەرهاتی خۆم بۆ گێرایەوە. کە چوومە دادگا، (میرئات) لەلای ڕەئیسی

دادگا بوو، سێ ساڵیان حوکم دام، سێ ساڵە زیندانیەکەیان بۆ حیساب کردم و بەربووم. میرزئات گوتی: واعیظی (زبانت ببر، قلمت بشکن)، زمانت ببڕە و قەڵەمەکەت بشکێنە، چونکە بەهۆی ئەو دووانەوە تووش بووی.

*****

جارێک شاعیری بەناوبانگ (موتەنەببی) بە قەسیدەیەک زۆر مەدحی یەکێک لە دوژمنانی (مەلیک) دەکا. مەلیک پێدەزانێ و ئەمر دەکا موتەنەببی بگرن و ئەویش لەترسانی خۆی دەشارێتەوە. پاش ماوەیەک مەلیک بە کاتبەکەی دەڵێ: نامەیەکی جوانی لە زمانی منەوە بۆ بنوسە با بێتەوە هیچی پێ ناڵێم. کاتبەکە موتەنەببی زۆرخۆش دەوێ و دەزانێ مەلیک بە فێڵ ئەو نامەی بۆ دەنێرێ، لە ئاخری نامەکەدا بۆی دەنوسێ: (قد عفونا ان شا اللە). کاتبەکە بەعەمدی شەددەیەک لەسەر نوونی (ئیننەکە) دادەنێ. کاتێ نامەکە دەگاتە دەست موتەنەببی و دەیخوێنێتەوە حاڵی دەبێ و (ئەلفێک) لە دوا نوونەکەوە دادەنێ و نامەکە بۆ کاتبەکە دەنێرێتەوە. جا تەماشا زیرەکی و زەکاوەتی ئەو دوو ئینسانە بکە کە چۆن لە یەکتر حاڵی بوون. کاتبەکە کە شەددەی لەسەر نوونی (ان) دانا بوو مەبەستی ئایەتی (إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ )ە بوو. موتەنەببی حاڵی دەبێ و کاتێ نامەکەش دەگاتە دەست کاتبەکە فەوری دەزانێ کە ئەو (ئەلفە) زیادەی موتەنەببی بۆی زیاد کردووە ئیشارەیەوە لای ئایەتی (إِنَّا لَنْ نَدْخُلَهَا أَبَدًا مَا دَامُوا فِيهَا )یە. یانی ئێمە نایێینەوە مادام ئەوان لەوێدابن.

*****

سەبارەت بە زەکاوەتی(مەئمون)ی کوڕی (هارونەڕەشید)یش دەڵێن: مەئمون دەرسی قورئانی لای زانای بەناوبانگ (کیسایی) دەخوێند. مە... قورئانەکەی دەخوێندەوە و ئەو گوێی لێ ڕادەگرت، ئەگەر بەغەڵەتی وەخوێندایە کیسائی سەری بەرز دەکردەوە و ئەو حاڵی دەبوو و دەگەڕایەوە سەری و ڕاستی دەکردەوە. دەڵێن: جارێک مەئمون دەگاتە سەر ئەو ئایەتە کە دەفەرمووێ (يَاأَيُّهَا ٱلَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَالَا تَفْعَلُونَ) کیسائی سەر بەرز دەکاتەوە و تەماشا مەئمون دەکا، مەئمون دەگەڕێتەوە سەر ئایەتەکە و تەماشا دەکا غەڵەتی نەخوێندۆتەوە. پاش دەرسەکە، دەچێتەوە لای باوکی دەڵێ: ئەی باوکە ئەوە چ وەعدەیەکت بە مامۆستا داوە و بەجێت نەگەیاندووە؟ هارونەڕەشید دەڵێ: بۆ، هیچی لە لا باسکردی؟ دەڵێ: هیچی باس نەکرد، بەڵام کە ئەو ئایەتەم خوێندەوە سەری بەرز کردەوە و تەماشای کردم زانیم شتێکی دەدڵ دایە. هارونەڕەشید دەڵێ: ڕاست دەکەی، ڕۆژێک داوای کرد

شتێک بدەم بە(فەڕرا)، فەڕرا زانایەکی ئەو سەردەمە بوو. گوتی: بەڵام هەتا ئێستا وەسەر نەپرژاوم. هارونەڕەشید زۆر ئافەرینی کوڕەکەی کرد و شتەکەشی بۆ فەڕرا نارد.

*****

جارێک ژن و مێردێک لێیان دەبێ بە شەڕ و جیاوازی دەکەوێتە بەینیانەوە و لەسەر کوڕەکەیان لێیان دەبێ بەکێشە و دەچن بۆلای حاکم. ژنەکە دەڵێ: جەنابی حاکم ئەو کوڕە، کوڕی منە، نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ سەعات و نۆ دەقیقە و نۆ سانیە بە سگی خۆم هەڵم گرتووە. لە باوەشی گەرم و نەرمی خۆمدا گەورەم کردووە، بە مەمکی خۆم شیرم داوەتێ. کاتێ بەخەبەر بووە ئاگاداریم کردووە. کە خەوی هاتووە نواندومە و ڕامژاندووە، تا بەو حاڵە گەیشتووە، ئێستا ئەو دەیەوێ لێم دوربخاتەوە. حاکمەکە ڕوو دەکاتە کابرا و دەیێ: وەڵامت چیە؟ کابرا دەڵێ جەنابی حاکم ئەوەی گوتی ڕاست دەکا، بەڵام من لەپێش ئەودا هەڵمگرتووە و ئەمن لەپێش ئەودا دامناوە و ئێستاش وەبەر خوێندنی دەنێم و لای دایکی هیچ فێرنابێ. حاکم ڕووی کردە ژنەکە و گوتی: وەڵامت چیە؟ ژنەکە گوتی: جەنابی حاکم ئەوەی دەیڵێ ڕاستە، بەڵام هەڵگرتن و دانانی من لەگەڵ هی ئەو فەرقی زۆرە. کاتێ ئەو هەڵیگرتووە زۆر سووک بووە، بەڵام کە من هەڵمگرتووە زۆر گران بوو. ئەو بە ئارەزووی خۆی و بۆ خۆشی و هەوەسی خۆی دایناوە، بەڵام من بە ڕەزا و ئارەزووی خۆم دام نەناوە، پێیەوە نیوە عەمر بووم تا دامناوە. حاکم قسەی ژنەکەی زۆر پێخۆش و سەرنج ڕاکێش بوو، کوڕەکەی دا بەو.

*****

دەڵێن (ئەسکەندەر) ڕووی لە هەر شارێک بکردایە وێرانی دەکرد و خەڵکەکەشی دەکوشت. جارێک ڕوو دەکاتە ئەو شارە کە ڕاوێژکەرەکەی و مامۆستاکەی لەوێ دەبێ و خەڵکی شارەکە زۆریان خۆش دەوێ. خەڵکەکە کە دەزانن ئەسکەندەر نزیک بۆتەوە پەنا بۆ کابرا دەبەن. کابرا دەڵێ: غەمتان نەبێ بە فێڵێک ڕزگارتان دەکەم. ئەسکەندەر کە چاوی بە مامۆستاکەی دەکەوێ زۆری پێخۆش دەبێ و زۆری ڕێز لێ دەگری و دەڵێ: چ دەفەرمووی تا وابکەم. مامۆستاکەی دەڵێ، خۆت دەزانی بەشی زۆری سەرکەوتنەکانت بەهۆی ئامۆژگارییەکانی من بوون. ئێستاش دەزانم خەڵکی ئەو شارە بەهۆی منەوە، زۆریان ئومێد بەتویە، بەڵام من زۆرم ڕق لەوانە، جا ئەوەی من سەبارەت بەوان داوام لێکردی بەڵێنم پێ بدە بەقسەم ناکەی. ئەسکەندەر گوتی، ئەوە بەڵێنم دا. کابرا گوتی، تکات لێ دەکەم شارەکەیان وێران بکە و بیانکوژە،

ئەسکەندەر چونکە وەعدەی دابوو بە قسەی نەکرد و ڕزگاریان بوو.

*****

کابرایەکی موسوڵمان لە شاری (بەسرا) زۆر خەریکی قورئان خوێندن دەبوو. ڕۆژێک بیستی ئەمیری موسوڵمانان ئیجازەی داوە کە ئەوەی زوڵمی لێکراوە هەرچی بێ ئەو شتەی بدەنەوە. کابرای موسوڵمان زۆری پێخۆش بوو، هەستا چووە ماڵێ و قورئانەکەی هێنا و لەسەر سورەتی (بەرائەت) (بسم الله)ی نوسی و گوتی: ئۆخەی، بە خوا زۆر لەمێژە غەدریان لەو سورەتە کردبوو، زیاد لەو هەموو سورەتانە (بسم الله)کەیان لابردووە.

*****

پیاوێک لە ناوەڕاستی بازاڕ دانیشتبوو نانی دەخوارد. گوتیان، کوا ئێرە شوێنی نان خواردنە؟ لە وەلامدا گوتی: ئەگەر لە بازاڕ برسیت بوو، دەبێ لە بازاڕ نان بخۆی. کابرایەک دەستی کرد بە جنێو پێ دانی، گوتیان، ئەوە بۆ وەلامی نادەیەوە؟ لە وەلامدا گوتی، ئەگەر سەگێک پێت وەڕی دەبێ تۆش پێی بوەڕیەوە؟ یان ئەگەر کەرێک لووشکەی لێدای دەبێ لووشکەی لێ بدەیەوە؟

*****

دەڵێن: ڕۆژێک (هیشام)ی کوڕی (عەبدولمەلیک)، ڕوو دەکاتە دانیشتوانی مەجلیسەکەی و دەڵێ: ئێوە دەزانن چ شتێک لە هەموو شتێک بە لەزەتترە؟ زۆربەی خەڵکەکە بێدەنگ دەبن و یەکێک هەڵدەداتێ و دەڵێ: قوربان! تۆ قەت گروێ بووی، خۆت خوراندبێ؟ خۆ خوراندن لە هەمووشتێک بەلەزەتترە. هیشام پێدەکەنێ و دەڵێ، خوا گرویت بکات و قەت چاک نەبیەوە تا هەر لە لەزەت دابی.

*****

پیاوێک داوای دوو سەت دیناری بەقەرز لە یەکێک کرد. خاوەن پارەکە گوتی: ئەو دوو سەت دینارەت بۆچیە؟ کابرا گوتی، کەرێکی پێدەکڕم و دەیفرۆشمەوە، بەڵکو بیست دیناری لێ قازانج بکەم. خاوەن پارەکە گوتی، ئەو کڕین و فرۆشتنەوەی بۆچیە، هەر ئێستا بیست دینارت دەدەمێ بۆخۆت خەرجی بکە. کابرا گوتی نا وەڵلا هەر دوو سەت دینارە قەرزەکەم دەیە، خاوەن پارە گوتی: وادیارە بە هەویای دانەوەی نی، برۆ خوا حافیزت بێ، بچووە لە یەکی دی قەرز بکە.

*****

دەڵێن: پیاوێکی (شێت)یان برد بۆلای قازی بۆ شاهیدی دان لەسەر ژن و پیاوێک کە زینایان کردبوو. قازی گوتی: تۆ شاهیدی دەدەی و چاوت لێبوو کە تێی نا و

دەری هێنایەوە؟ کابرا شێتە لە وەڵامی قازی دا گوتی: خۆ جەنابی قازی؛ من ئەگەر چەرمی قونێشی بوومایە وەک جەنابت دەفەرمووی، ئاوام چاو لێ نەدەبوو.

*****

کابرایەک دەڵێ: لەگەڵ پیاوێکی فارسی خەڵکی شەهری (رەی) دۆستایەتیمان زۆرخۆشبوو. ماوەیەک دیار نەبوو، هەستام چووم بۆ عیادەت و ئەحواڵپرسی. لەبەر دەرگا بەڕەیەکیان ڕاخست و لە سەری دانیشتین. کابرایەک هەر دەهاتە دەرو دەچووە ژوورەوە. گوتم ئەوە کێ یە؟ وەڵامی نەدامەوە تا دوو سێ جار م لێ دووپات کردەوە. لە ئاخردا سەری بادا و گوتی: ئەوە مێردی خوشکی پوورمە، واتە باوکی یەمتی.

*****

جارێک چەند کاروانچی بە ڕێگایەکدا دەڕۆن و لەسەر ڕێگا( شێر)ێک بەرامبەریان دێ، زۆر دەترسن. یەکیا ن غیرەت وەبەر خۆی دەنێ و خۆی ئازا دەکا و بەرەو شێرەکە دەچێ. شێرەکە پەلاماری دەدا و وەبن خۆی دەخا، هاوڕێکانی تێکرا سواری شێرەکە دەبن و لەسەر کابرای لا دەبەن و شێر دەڕوا. هاوڕێکانی لە کابرا دەپرسن حاڵت چۆنە؟ لە وەڵامدا دەڵێ، زۆر باشم. هیچ شوێنێکم نەشکاوە، بەڵام ئەو شێرە حیزبابە گوی دەپانتۆڵەکەم کردووە. ئەوەندە خەجاڵەت دەبێ شەرم دەکات، بڵێ لە ترسان خۆم پیس کردووە.

*****

لەکتێبی (کلیل و دیمنە)دا دەڵێ: ئەگەر هات و دوژمن ئیزهاری دۆستایەتی کرد، ئاگادار بە، بەسەهو نەچی، چونکە بەهۆی قازانج و بەرژەوندی خۆیەوە دەیەوێ لێت نزیک وەبێ، دەنا هەرکاتێ بەرژەوندی نەما دەگەڕێتەوە سەر دوژمنایەتیەکەی خۆی. چونکە گوتراوە، تەبیعەتی دوژمن وەک تەبیعەتی(ئاو) دەچێ. ئاو گەرم دەکەی گەرم دەبێ، بەڵام کاتێ ڕاتگرت زۆری پێناچی دەچێتەوە سەر تەبیعەتە ساردەکەی خۆی.

*****

حاجی مەلا (سەید ڕەشید) کە بەداخەوە بە ناحەق لە گوندی دەشتێوی عێراق شەهید کرا، لە گوندی (ئالومتان) فەقێ دەبێ. هاوینێ هەواریان دەچێتە (وەزنێ). دوا نیوەڕۆیەک دەچێتە دەورکردنەوە و لەکاتی موتالەعە لەبن پنچە (گوێنی)یەک خەوی لێ دەکەوی. کاتێک وەخەبەر دێ هەست دەکات (مار)ێک بە دەلینگی دەرپێکەیدا دەچێتە ژوورەوە و سەری دەباتە نزیک موسلّدانی. ئەویش لەترسان ناوێری خۆی ببزێوی و هەست لەخۆی دەبڕێ. هەرکە بەعاستەم خۆی دەبزێوی،

مارەکەش دەچولێ. تا ماوەیەک بەمجۆرە لەسەر پشت ڕادەکشێ و چاوەڕوانی ئەوە دەکا، ڕێبوارێک، شوانێک بەوێدا بێ و بە ئیشارە ئاگا داری بکا، بەلام کەس نایە. لە ناکاو توووند هەر دوو دەستانی دەبا و سەری مارەکە دەگری و هاوار دەکا و ڕاست دەبێتەوە و ڕادەکا، بەلام کە تەماشا دەکا مار نیە، بەڵکو بەندۆخینەکەیتی.

*****

(شێخ و لئیسلامی) سەردەشتی پیاوێکی قسەخۆش و دەستکورت بوو. دۆستی (پێشەوا) قازی محەممەد بوو. جارێک لە (سابلاغ) دەچێتە مەجلیسی پێشەوا. لەوکاتەدا ئاغاوەت و پیاوماقولی سابلاغ و دەوروبەری زۆر لە خزمەتدا دەبن. لە ناوەڕاستی قساندا باسی داهاتی سالانەی خۆیان دەکەن. یەکیان دەلێ: ئەو سالّ فلان باغم داوە بەوەندە بە ئیجارە و یەکی دیکە دەلێ: واریداتی فلان ملکم ئەوەندە بووە و یەکی دیکە دەلێ ئەو سالّ داهاتم زۆر نەبووە و هەر یەکە بەجۆرێک باسی حاسلاتی خۆیان دەکەن. جەنابی پێشەواش دەزانی کە شێخە لئیسلام زۆر دەست کورتە. ڕوو دەکاتە شێخەلئیسلام و دەلێ: ئەی شێخ تۆ بۆ باسی خۆت ناکەی؟ شێخە لئیسلام لە وەلامدا دەلێ قوربان: (مابە تەماشای جیهان ئامەدەیم). پێشەوا لە مەبەستی شێخە لئیسلام دەگات، بەلام هێندێک ئاگایان لە تەواوی ئەو شیعرە نابێ و دەلێن: ئەوە مانای چیە؟ پێشەوا دەلێ، شێخە لئیسلام هەتا باربویەکی باشت نەکەن، پێیان مەلێ. دەلێن: بابە چ دەلێی حازرین و تەواوی بکە. شێخە لئیسلا م ڕوودەکاتە پێشەوا و دەلێ: قوربان ئیجازە هەیە؟ پێشەوا پێدەکەنی و دەلێ: بەلێ. ئینجا شێخە لئیسلام شیعرەکەیان بەتەواوی بۆ دەخوێنێتەوە و دەلێ:

دەولەت بە سەگان دادە و نیعمەت بە خەران.
پەس ما بەتەماشای جیهان ئامەدەئیم.
خەلکەکە زۆر پێکەنین و پارەیەکی باشیان بۆ کۆ کردەوە.

*****

ڕۆژێک دەچن عەرزی شێخ محەممەدی کوری شێخی(بورهانی) دەکەن و دەلێن: قوربان! شێخ عەبدولرحیمی برات ئەمری خوای بەجێ هێناوە و وەفاتی کردووە. لە وەلامدا دەلێ: خوا ڕەحمی پێ بکا، ئەوە یەکەم جارە کە ئەمری خوا بەجێ بێنێ. لە دوای شۆڕش ئێران، لە کاتێکدا زوربەی کوردستان لەژێر دەسەلاتی حیزبی دیموکرات دابوو، ئیقبالی حاجبی و ژنەکەی و فەرهادی کوری شوکروللای بابان و چەند هونەرمەند بە کوردستاندا دەگەڕێن و کوڕی هونەری بۆدلخۆشی خەلک دەبەستن.

ڕۆژێک دەچنە هەواری (مەیدان چۆغە)ی (نەستان)یَ و بەزم ساز دەکەن. پیرێژنێک بە ناوی پوور زلێخا هەر دێت و لە ژنەکەی ئیقباڵ ڕادەمێنێ و لەپاشان دەڵێ: ئەیارۆ قوڕم بەسەری ئاخر زەمانە، ساڵان هەر پیاو لۆتی بوون، کەچی ئێستا ژنیش بوون بەلۆتی.

*****

لە کتێبی(الحوجەج البینات)دا دەڵێ: جارێک کابرایەکی مونکیری پیاوچاکان دەچێتە کتێبخانەیەک و تەماشا دەکا کتێبێکی گەورە دێتە بەرچاوی، لە کتێبفرۆشەکە دەپرسی ئەو کتێبە چیە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ (مەسنەوی)یە. کابرای مونکیر پێدەکەنی و دەڵێ: (مەشنەوی)؟ بەحەرفی شینی دەخوێنێتەوە. ئینجا هەڵی دەگری و بە چاوێکی زۆر بێ ئەدەبانەوە لێکی دەکاتەوە، یەکەم شیعر کە دەێتە بەرچاوی ئەو شیعرە دەبێ کە دەڵێ:

ئەی سەگی مەلعون تو عەوعە و میکونی
مەسنەوی ما را تو مەشنەوی میکونی

خەجاڵەت دەبێتەوە و بە ئەسپای کتێبەکە دادەنێتەوە و بێدەنگ دەڕوا.

*****

ڕۆژێک شێخ محەممەدی شێخ جەلال کە ئیمامی مزگەوتی (سابونکەران) بوو لە شاری سلێمانی گوتی: لەو ساڵانەی پێشودا فەقێیەکمان لابوو، زۆر کەودەن بوو، ناومان نابوو (عولەما). ڕۆژێک لێمپرسی و گوتم: بە فارسی بە (چرا) دەڵێن چی؟ لە وەڵامدا گوتی: پێی دەڵێن (سەبوک)، گوتم: چۆن پێی دەڵێن سەبوک چوزانی؟ گوتی: ئەی ئەوە نیە لە گولستاندا دەڵێ، سەنگێن نەشەوەم سەبوک چرا.

*****

دەڵێن: خوای گەورە بۆ هەرشتێک وەخت و سەعاتێکی دیاری کردووە. وەختێ بۆ لە دایک بوون، وەختێ بۆ کاتی مردن، وەختێ بۆ نەمام ناژتن، وەختێ بۆ بەروسەمەر، وەختێ بۆ بڕین و هەڵکەندن، وەختێ بۆ شەڕ و ئاژوە، وەختێ بۆ سوڵح و ئاشتی، وەختێ بۆ ئیشوکار، وەختێ بۆ حەسانەوە و پشوودان، وەختێ بۆ ئێش و ئازار. وەختێ بۆ ساغ و سەلامەتی، وەختێ بۆ دروست کردن و کاتێ بۆ ڕوخاندن، وەختێ بۆ خۆشی و شادی، کاتێ بۆ گریە و زاری وەختێ بۆ دەباوەش گرتن، کاتێ بۆ جیابوونەوە، وەختێ بۆ کەسب و قازانج، کاتێ بۆ خەسارەت و زەرەر،وەختێ بۆ ئاگاداری. کاتێ بۆ لەبیرچوونەوە، وەختێ بۆ لەبەرکردن، کاتێ بۆ دڕین و فڕێدان، وەختێ بۆ قسە و باس، کاتێ بۆ سکوت و بێدەنگی، وەختێ بۆ دۆستایەتی، کاتێ بۆ

دوژمنایەتی، بە کورتی کەلام لە لەدایک بوونەوە تا مردن. کەوایە هیچ لەوە چاکتر نیە کە تا دەتوانی چاکە بکە و خۆت لە خەراپە بپارێزە.

*****

کابرایەک تازە موسولمان ببوو. ڕۆژێک ویستی وەک جاران شەڕاب وەخوا. گوتیان: تۆ تازە بویە موسولمان و شەڕاب حەرامە وەیخۆی. ڕۆژێ چوو بۆ دیسکۆ ڕەقس بکا، گوتیان، ڕەقس حەرامە. ڕۆژێکی دی چووە کۆڕی گۆرانی و مۆسیقا، گوتیان حەرامە مەچووە. ڕۆژێکی دیکە ویستی یاری وەرەق و دامە بکات، گوتیان حەرامە مەیکە. ڕۆژێک چاوی بە کچێک کەوت و عاشقی بوو، گوتیان ئەزەر بازی حەرامە. تا ئاخر کابرای تازە موسوڵمان وای لێهات، دەستی بۆ هەرشتێک دەبرد دەبووایە پێشتر پرس بکا داخوا حەرامە یاننا. ڕۆژێک لە مەجلیسێکدا دانیشتبوو چایان بۆ هێنا. لە کابرای پرسی کاکە ئەوە حەلاڵە یان حەرام؟ گوتی چا حەلاڵە وەیخۆ. کابرای تازە موسوڵمان ڕووی کردە پیالە چایەکە و گوتی: ئەگەر تۆش حەرام بووایەی، منی تازە موسوڵمان چ گویەکم دەخوارد؟

*****

لەگەڵ کوڕێکی هەولێری ماوەیەک پێکەوە لە جێیەک بووین. ڕۆژێک گوتی: مامۆستا؛ کەر بوویمە. گوتم خوا نەکا، بۆ کەر بووی؟ پێکەنی و گوتی: خوا عەفووت بکا کەر نەبوویمە، گێم کەر بووە گێ. بە زاراوەی خۆیان یەعنی گوێم کەڕ بووە.

*****

(عەبدوڵلای موبارەک) دەڵێ: ساڵێک لە حەج دەگەڕامەوە. لە ڕێگادا لە دوورەوە تارماییەکم دی، کە نزیک بوومەوە ئافرەتێک بوو، عەبایەکی خوری بە سەرخۆیدا دابوو. سلاوم لێکرد، لە وەڵامدا بە ئایەت جوابی دامەوە و گوتی: (سلامٌ قَوْلاً مِنْ رَبٍّ رَحِيمٍ) گوتم: ڕەحمەتی خوات لێ بێ ئەوە بۆ تەنیای؟ گوتی: (وَمَنْ يُضْلِلِ اللّٰهُ فَمَا لَهُ مِنْ هادٍ). زانیم کە بەجێماوە، گوتم: بۆ کوێ دەچی؟ گوتی: (سُبْحانَ الَّذِي أَسْرا بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِالحرامِ إلى الْمَسْجِدِالأَقْصى). زانیم دەگەڕێتەوە بۆ (بيت المقدس). گوتم: چەند ڕۆژە لێرەی؟ گوتی: (ثَلاثَ لَيالٍ سَوِيًّا). گوتم: وادیار خواردن و خوارد نەوەت لە لانیە؟ گوتی: (هُوَ يُطْعِمُني وَيَسْقِينِ) گوتم: چۆن دەستنوێژ دەگری؟ گوتی: (فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا ماءً فَتَيَمَّمُوا صَعيدًا طَيِّبًا). گوتم خواردنم پێیە فەرموو. گوتی،(ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيامَ إِلى اللَّيلِ). گوتم، دروستە لە سەفەردا بەڕۆژو نەبین. گوتی، (وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌلَكُمْ). گوتم، بۆ وەک من قسە

ناکەی؟ گوتی، (مایَلفِظُ مِنْ قَوْلٍ اِلاّ لَدَیْهِ رَقیبٌ عَتیِدٌ) گوتم، لە کام خێڵی؟ گوتی، (وَلا تَقفُ مالَیْسَ لَکَ بِهِعِلْمٌ)، گوتم، بمبورە، گوتی: (لا تَثریبَ عَلَیْکُمُ الْیَوْمَ). گوتم، وەرە سواری وشترەکەی من بە. گوتی، (وَما تَفعَلوا مِنْ خَیْرٍ یَعْلَمْهُ اللّهُ) وشترەکەم ئیخ دا. گوتی، (قُلْ لِلْمؤمِنینَ یَغُضّوا مِنْ أبْصارِهِمْ). چاوم لە سەریەک نا و گوتم، سواربە. گوتی، (سُبْحانَ الذی سَخَّرَ لَناهذا)، کە خەریک بوو سواربێ، وشترەکە کراسەکەی گرت و جووی. گوتی، (وماأصابَکُمْ مِنْ مُصیبةٍ فَبِما کَسَبَتْ أیدیکُمْ). دەڵێ، سوار بوو، ئاوساری وشترەکەم گرت و رامکیشاو دەستم کرد بە بانگ کردن و بەپەلە ڕۆیشتن. گوتی، (وَاقْصُدْ فی مَشْیِکَ وَ اغْضُضْ مِنْ صَوْتِکَ) ئینجا لەسەرەخۆ شیعرم دەخوێندنەوە و دەڕۆیشتم. گوتی، (فَاقْرَؤُاما تَیَسَّرَمِنْهُ) گوتم، زۆر بەهرەمەندی، گوتی،(وما یذکرإلاّ اوُلوا الألباب) گوتم: مێردت هەیە؟ گوتی: (یاایهاالذینَ آمَنوالا تَسْأ لوا عَنْ أشیاءَاِنْ تُبْدَ لَکُمْ تَسُؤْکُمْ). گەیشتینە قافڵە، گوتم، کێت لەگەڵ ئەو قافڵەیە؟ گوتی، (المالُ و البنونَ زینةُ الحیاةِ الدُّنیا). زانیم کە کوڕی لەگەڵ قافڵەکەیە. گوتم، کوڕەکانت چکارەن؟ گوتی، (وعلاماتٍ و بالنجمِ هُمْ یهتَدوُن). دەڵێ، زانیم کە ڕێ نیشاندەری کاروانەکەن. چووینە لای خێوەتێک و گوتم، کێت لێرەیە؟ گوتی، (واتخذاللّهُ ابراهیمَ خلیلاً، وَ کَلَّمَ اللّهُ مُوسیٰ تکلیماً، یایحی خذالکتابَ بقوةٍ). فەوری برایم و مووسا و یحیا هاتنەدەر و گوتی، (ابعثُوا أحَدَکُمْ بِوَرِقِکُم هذهِ الی المدینةِ فلینظر أیّها أزکی طعاماً فلیتکُمْ برزقٍ مِنْهُ). یەکیان چوو خواردنی کڕی و هاتەوە. گوتی: (کلوُا واشْرَبوُا). گوتم تا پێم نەڵێن دایکتان بۆ وایە هیچ ناخۆم. گوتیان: ئەوە چل ساڵە بە قورئان نەبێ قسە ناکا.

*****

پیاوێک دەڵێ چووم بۆلای ابن سیرین و گوتم: لە خەومدا مۆرم لەسەر دەمی پیاوان و فەرجی ژنان دادەنا، بۆم لێک وەدە. گوتی: وادیارە تۆ بانگ دەدەی؟ گوتم بەڵێ. گوتی تەعبیرەکەی ئەوەیە کە تۆ لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزاناندا لە پێشتی ڕۆژبوونەوەدا بانگ دەدەی. پیاوێکی دی چوو گوتی : لە خەومدا جەواهێراتم دەملی بەرازان دەکردن. ابن سیرین گوتی: ئەوە تۆ دەرس بە نائەهلان دەڵێی.

*****

کابرایەک عادەتی وابوو بەبێ بانگهێشتن دەچوو بۆ ماڵان. ڕۆژێک تووشی کۆمەڵێک بوو، وەیزانی دەعوەت کراون. وەدوایان کەوت. کاتێک زانی ئەوانە پیاوخەراپن و دەیانبەن بۆ دادگا، دەست دەکا بەگریان و دەڵێ: قوربان جەنابی حاکم؛ بە خوا ئەمن لەوانە نیم، لە ڕێگادا ڕەدگەڵیان کەوتم، وەمزانی بانگهێشتن

کراون بۆ نان خواردن بۆیە وەدوایان کەوتم. حاکمەکە دەڵێ: ئەوە ناخوا، ئەو درۆیەم قبوڵ نیە، بەرن سەری ببڕن. کابرا کەزانی هەر لە سەری دەدەن گوتی، دەجەنابی حاکم؛ لەباتی سەر بڕینم زگم بدڕن، چونکە بەڕاستی ئەو منی بەو دەردە برد. حاکم کە زانی ڕاست دەکا، زۆر پێکەنی و ئازادی کرد و گوتی: بڕۆ بەڵام جارێکی دی بەقسەی مەکە.

*****

ڕۆژێک (ئەبو دولامە) دەچێ بۆلای (ئەبو جەعفەری مەنسور) و ئەو شیعرەی بۆ دەخوێنیتەوە: (إِنِّي رَأَيْتُكَ فِي الْمنا) (مِ وَأَنْتَ تُعْطِيني خِيارَةْ). ( مَمْلُوَّةً بِدراهِمَ )( وَعليكَ تَفسِيرُ العِبارَةْ). واتە ئەی ئەبو جەعفەر ئەمشەو لە خەومداجەنابت خەیارێکت دامێ، کە تەماشام کرد ناوەکەی پڕ بوو لە درهەم. نازانم ئەوە مانای چیە، ماناکەم بۆ لێک وەدە. ئەبو جەعفەر پێدەکەنی و دەڵێ: مانای ئەوەیە، بچۆ خەیارێک بێنە تا بۆت پڕ بکەم لە درهەم. ئەبو دولامە دەچێ (کولەکەیەکی) گەورە دێنی. ئەبو جەعفەر دەڵێ، ئەوە چیە؟ ئەبو دولامە دەڵێ، قوربان تەڵاقم کەوێ لەوە زیاترم نەدیەوە. ئەبو جەعفەر زۆر پێدەکەنی و پارەیەکی زۆری بۆ تێدەکا.

*****

دەڵێن: ئینسان قەت لە لۆمەی خەڵک ڕزگاری نابێ. جارێک کابرایەکی لادێیی لەگەڵ ژنەکەی دەچن بۆ سەفەر، کەرێکیان پێدەبێ. کابرا دەڵێ: ئافرەت وەرە تۆ سواری کەرەکە بە. ئافرەتەکە سوار دەبێ و کابرا وەپێشی دەکەوێ و دەڕۆن. زۆر ناڕۆن کە تووشی کۆمەڵێک دەبن، لەسەر کانیاوێک دانیشتوون، سڵاویان لێ دەکەن و بە لایاندا تێدەپەڕن. کۆمەڵەکە دەست دەکەن بە پێکەنین و دەڵێن: تەماشا ئەو ژنە هیچ شەرم ناکا بۆخۆی سوار بووە و ئەو پیاوە پیرە بەستەزمانەی وەپێش خۆی داوە. کاتێ تۆزێک دوور دەکەونەوە، کابرا دەڵێ: ئافرەت وەرەخوارێ با ئەمن سوار بم، گوێت لێبوو چیان گوت؟ ژنەکە دێتە خوار و کابرا سوار دەبێ. ماوەیەک ڕۆیشتن، تووشی چەند کەسێک بوون. کە چاویان پێکەوتن گوتیان: ئەو مردوو مراوە بۆخۆی سوار بووە و ژنەکەی بە پێیان دەڕوا، بانگیان کرد و گوتیان: ئەرێ کابرا ئەوە هیچ حەیا ناکەی؟ ئەو ئافرەتە زەعیفەت وەپێش خۆ داوە و بۆخۆت سوار بووی؟ کە دوور کەوتنەوە کابرا گوتی: ئافرەت! تۆ سوار بووی پێمان پێکەنین و لۆمەی تۆیان کرد، ئەمن سوار بووم غەیبەتی منیان کرد. وەرە با هەردووکمان سواربین. ژنە لەپێشەوە و کابرا لەدوواوە سوار بوون. کە چاویان پێکەوتن گوتیان: تەماشا ئەو کابرایە چەند بێشەرمە، ئەو ئافرەتەی چۆن دەباوش گرتووە؟ ئەگەر

ژنی خۆیەتی باشە و دەباوەشی گری و ئەگەر هی خۆشی نیە عەیب ناکا بۆ وا دەباوەشی گرتووە؟ کە دوور کەوتنەوە کابراگوتی: ئافرەت ئەو خەلکە زۆر سەیرە؟ تۆ سوار بووی هەر ناڕازی بوون، ئەمن سوار بووم هەر ناڕازی بوون، پێکەوە سوار بووین هەر ناڕازی بوون. وەرە با هەردوو بە پێ بڕۆین و کەرەکە ڕاکێشین، کەرەکەیان ڕاکێشا و ڕۆیشتن. کە چاویان پێکەوتن گوتیان ئەو ژن و پیاوە چەند بێعەقلن، ئەو کەرە بەتاڵەیان پێ یە کەچی سواری نابن. کاتێ لەوانیش دوور کەوتنەوە کابراگوتی: ئافرەت ئەو کەرە ئابڕوی بردین با سەری ببڕین و لەکۆڵ خۆمانی بکەینەوە. ژنەکە گوتی: ئاخر ئەوجار دەلێن: شێت بوون، ناوەللا گوێ مەدە قسەی خەلک و لێخورە.

*****

جارێک (حەجاجی سەقەفی) لە زانای بە ناوبانگ (جەوهەری) دەپرسی و دەلێ: باشترین نیعمەت چیە؟ لە وەلامدا دەلێ: ئەمن و ئاسایش. حەجاج دەلێ، بۆ؟ جەوهەری دەلێ، چونکە قەت ئینسان لەکاتی ترس و نائەمینیدا لەزەت لە ژیان نابا. حەجاج دەلێ، لە دوای ئەمن و ئاسایش چیتر باشە؟ دەلێ، لەش ساغی و سەلامەتی، چونکە نەخۆش و دەردەدار لەزەت لە ژیان نابینێ. حەجاج دەلێ، چیدیش؟ جەوهەری دەلێ، لاویەتی و گەنجی، چونکە ئینسان کە پیر بوو لەزەت لە ژیان ناکا. حەجاج دەلێ، لە دوای ئەوانە چیتر باشە؟ دەلێ، دەوڵەمەندی، چونکە فەقیر و هەژار قەت لەزەت لە ژیان نابەن. حەجاج دەپرسێ چیتر؟ جەوهەری دەلێ، نیعمەتی لەوە زیاتر نیە.

### ئەوانە چەند وێنە و پەندی لوقمانی حەکیمن

دەلێ: جارێک (ئاسک)ێک زۆری تینو دەبێ. دەچێتە سەر ئاوێک ئاو وەخوا، وێنەی خۆی لە ئاوەکەدا دەبینێ. کە چاوی بە لولاکەکانی دەکەوێ ئەوەندە باریکن زۆر نارەحەت دەبێ. بەلام کە تەماشای شاخە درێژەکانی دەکا زۆر بەخۆی دەنازی و دلخۆش دەبێ. لەوکاتەدا ڕاوچی دەگەنە سەری و دەردەپەڕێ. تا لە دەشتێ تێدەپەڕی نایگەنێ بەلام کاتێ دەگاتە ناودار و دەوەنان شاخەکانی تێدەگیرێن و ڕاوچی دەگەنە سەری و دەیکوژن. لەکاتی سەرەمەرگدا دەلێ، ئای چەند نەزان و فەقیر بووم. ئەوەی بەلامەوە هیچ نەبوو ڕزگاری کردم، بەلام ئەوەی شانازیم پێوە دەکرد بەکوشتن دام.

*****

دەلێ: جارێک گەرما تینی بۆ (شێر)ێک هێنا و چوو لە ناو (ئەشکەوت)ێکدا خۆی

فیتک وەکا، خۆی بە عەرزیدادا و لێی ڕاکشا. چەند دەعبا و مێشولە بە پشتی هەلگەران و تینیان بۆ شێنا، ڕاست بووە و لەناخان تەماشای ڕاست و چەپی خۆی دەکرد و زۆر نارەحەت بوو، زۆر دەترسا. لەوکاتەدا (ڕێوی)یەک بەرامبەری ڕاوەستا بوو، دەستی کرد بە پێکەنین. شێر گوتی: خۆ ئەمن کە ئەوەندە نارەحەتم لەترسی ئەو دەعبایانە نیە، بەلکو لەبەر ئەو بێ حورمەتی یە نارەحەتم. جا مانای وایە کە بێحورمەتی بەلای ئینسانی ژیر و عاقلەوە لە مردن ناخۆشترە.

*****

دەڵێ:(شێر)ێک ویستی (گا)یەک بگری و بیخوا، زۆری لەگەڵ خەریک بوو، هیچی بۆ لەگەڵ نەکرا. گایەکە زۆر گەورە و بەتاقەت بوو. چو بە گایەکەی گوت: بەرخێکی زۆر قەلەوم کوشتۆتەوە، زۆر خۆشحاڵ دەبم کە نانی ئێوارە لە لای من بخۆی. گوتی. زۆر باشە، هەستا وەدوای کەوت. کاتێ گەیشتنە جێگای شێرەکە، تەماشای کرد دار و مەنجەلێکی زۆر کۆ کراوەتەوە، بێ سێ و دوو ڕایکرد. شێر گوتی، دوای ئەوە کە بەقسەت کردم و هاتی بۆ ڕادەکەی؟ لە وەلامدا گوتی، ئێستا بۆم ڕوون بۆوە کە ئەو هەموو دارە زۆرە و خۆ ئامادە کردنەت بۆ گەورەتر لە بەرخە. مانای ئەوەیە نابێ بەقسەی دوژمن بە سەهو بچی و تەفرەت بدا.

*****

دەڵێ:(شێر)ێک ئەوەندە کز و لاواز ببوو، کە نەیدەتوانی بچێتە ڕاوێ و حەیوانێک بگری و بیخوا. ویستی فێلێک بکا تا لووقمەیەکی دەستکەوێ، هات بەدرۆ خۆی نەخۆش کرد و چوو دەنەشکەوتێکەوە. کاتێ وەحش و جانەوەران خەبەریان زانی، یەک لە دوای یەک دەچوون بۆ عەیادەتی. ئەویش ئەوەی پێی دەگەیشتە ژوور ئەشکەوتەکە پەلاماری دەدا و دەیخوارد. ڕۆژێک (ڕێوی) هات بۆ لای و هەر لە زاری ئەشکەوتەکەوە ئەحوالی پرسی. شێر گوتی: ئەی بۆ نایەیتە ژوور؟ گوتی، گەورەدم خەریک بووم بێمە ژورەوە، بەلام تەماشا دەکەم جێگای پێی زۆران دیارە کە هاتوونە ژور، بەلام نابینم هاتبنەوە دەرەوە، خواحافیز.

*****

دەڵێ: (ئاسک)ێک لەترسی ڕاوچیان ڕادەکا و دەچێتە ناو ئەشکەوتێکەوە. لە ناکاو شێرێک لێی وەژور دەکەوێ و دەیگرێ. کاتی گیان دانی دەڵێ: ئای چەند بەدبەختم، لە دەست خەلک ڕامکرد و دەداوی شێر کەوتم. مانای وایە زۆرجار ئینسان لەبەر زەرەدێکی کەم ڕادەکا و تووشی زیان و بەلایەکی گەورەتر دەبێ و پێویستە زۆری ئاگا لەخۆ بێ.

*****

دەڵێ:(ئاسک)ێک زۆری تینو دەبێ، خۆی دادێڵێتە ناو بیرێکەوە و تێر ئاو دەخواتەوە، بەڵام کاتێ دەیەوێ وەسەر کەویتەوە هەرچەند دەکا ناتوانی بێتەوە دەر. لەوکاتەدا (ڕێو)یەک تەماشای دەکا و دەڵێ: ئاخر براله کارێکی زۆرخەراپت کردووە، دەبوایە بەرلەوەی دەچی ناوی، بیرله هاتنه دەر بکەیەوە. مانای وایە هەرکەسێک کە بەبێ پرسوڕا کار بکا ئاوای بەسەر دێ.

*****

دەڵێ: جارێک (سیسارگە کەچەڵە) و (کەروێشک) لێیان دەبێ بەشەڕ. کەروێشک پەنا دەبەن بۆ (ڕێوی) و دەڵێن: دەبێ فریامان بکەوی. ڕێوی لە وەڵامیاندا دەڵێ: ئەگەر ترسەنۆکی ئێوە و بەدەسەڵاتی سیسارگەکەچەڵەم نەزانیایە یارمەتیم دەدان. مانای وایە دەبێ ئینسان تا بۆی بلوێ بە گژ لەخۆی بەدەسەڵات تردا نەچێ، دەنا تووشی پەشیمانی دەبێ.

*****

دەڵێ: جارێک (کەروێشک)ێک تووشی (شێر)ێکی مێ دەبێ و دەڵێ: ئەمن هەموو ساڵێ چەند بەچکەم دەبێ، بەڵام تۆ لە تەمەنی خۆتدا هەر یەک دووانێکت دەبێ. شێر لە وەڵامدا دەڵێ: ڕاست دەکەی، بەڵام یەک دووانەکەی من زۆر ئازان. مانای وایە کوڕێکی ئازاو عاقڵ و زانا لە دە کوڕی خەراپ باشترە.

*****

دەڵێ: پیرێژنێک مریشکێکی هەبوو، کە ڕۆژێ دوو هێلکەی دەکرد. پیرێژن لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر دانی زۆر بدەمێ ڕەنگە ڕۆژێ دە هێلکەم بۆ بکا، هات جامێکی دان بۆ ڕۆ کرد. مریشک ئەوەندەی خوارد جیقڵدانەی تەقی. مانای وایە کە زۆر کەس بۆ قازانجی زۆر دەست مایەکەشی لە دەست دەدا.

*****

دەڵێ: (مێشوولە)یەک چوو لەسەر شاخی (گا)یەک نیشت، لە دڵی خۆیدا لای وابوو قورسایی خستۆتە سەر گایەکە، گوتی: ئەگەر دەزانی نارەحەتم کردووی بفەرموو تا بفڕم. گایەکە پێکەنی و گوتی: فەقیر من هەستم بەوە نەکرد کە لەسەر پشتم نیشتی بەخۆم نەزانی، ئەگەر بشفڕی ئاگا ناکەم. مانای وایە دەبێ ئینسان وەزن و قەدر و قیمەتی خۆی بزانی.

*****

دەڵێ: کابرایەک کۆڵە دارێکی زۆرگرانی هەڵگرتبوو. لەناکاو کۆڵە دارەکەی فڕێدا

و گوتی: ئەی مەرگ لە کوێی ڕزگارم بکەی؟ مەرگ هات گوتی: ئەوەتام بۆ هاوارم دەکەی؟ کابراگوتی: بە قوربانت بم بۆ ئەوەی ئەو کۆڵە داردم لە کۆڵ نێیەوە. مانای وایە هەموو کەس ژیانی دنیای پێخۆشە.

*****

دەڵێ: کابرایەک ڕۆژێک (بەران)ێک و (بزن)ێک و (بەراز)ێک دەبا بۆ بازاڕ بیانفرۆشی. بەران و بزنەکە زۆر لەسەرەخۆ و بێ ئەملاوئەولا دەڕۆن، بەڵام بەرازەکە داناسەزرێ، هەر ئەملاوئەولا دەکا و لە ڕێگا لا دەدا. کابرا زۆر ناڕەحەت دەکا. کابرا تووڕە دەبێ و دەڵێ: ئەی پیسی بەدفەڕ بۆ وەک ئەو بزن و بەرانە ئارام ناگری و ئەوەندەم ئەزیەت دەدەی؟ بەرازەکە لە وڵامدا دەڵێ، ئاخر گەورەم؛ هەر کەس بیرلە حالی خۆی دەکاتەوە. ئەمن دەزانم کە بەرانەکە بۆ خوریەکەی ڕادەگرن و هیچی لێ ناکەن و بزنەکەش لەبەر شیر و ماستەکەی، بەڵام هەرکە منیان کڕی دەمبەن بۆ قەسابخانە. ئەوە مانای وایە، ئەوەی خەراپە زۆر دەکا دەفیتی خۆی دەگا و دەزانی عاقیبەتی چۆن دەبێ.

*****

دەڵێ: ڕۆژێک (لاولای)ێک بە باغەوانێک دەڵێ: ئەگەر ئەمن دڵسۆزێکم ببوایە و لە ناوەڕاستی باغەکەیدا بیڕواندمایە و پەروەردەی بکردمایە، پاشا و مەلیک ئارەزووی دیداری گوڵ و بەری منیان دەکرد. باغەوان هەڵیگرت و هێنای لە ناوەڕاستی باغەکەیدا ناژتی و هەموو ڕۆژێک دووجاری ئاو دا. زۆری نەخایاند گەشەی کرد و درکەکانی پێگەیشتن و لق و پۆی بە هەموو دارەکان هەڵگەڕا و وشکی کردن و ڕەگەکانی تەواوی عەرزەکەیان داگرت و لەبەر درکی زۆر کەس نەیوێرا توخونی بێ. ئەوە مانای وایە کە هەر کەسێک ئینسانی خەراپ وەخۆ گری و خزمەتی بکا ئاخری تووشی پەشیمانی دەبێتەوە.

*****

دەڵێ: جارێک (قالۆچەڕەشکە) بە (مێش هەنگوین) دەڵێ: ئەگەر لەگەڵ خۆتم بەری لەتۆ باشتر هەنگوین دروست دەکەم. مێش هەنگوین دەڵێ باشە، بەڵام ئەگەر نەتزانی، خۆم دەزانم چیت لێ دەکەم. لەگەڵ خۆی دەیبا. قالۆچە، هەرچەند دەکا هیچی بۆ ناکرێ. مێشەکە پێیەوە دەدا و دەیکوژێ. لە وەختی سەرەمەرگدا قالۆچەکە بەخۆی دەڵێ، دەبخۆ ئەوە دەردت بێ، تۆ کە نازانی قیروزفت دروستکەی چۆن دەتەویست هەنگوین دروست بکەی. ئەوە مانای وایە کە شتێک نازانی دەستی بۆ مەبە.

*****

دەڵێ: (سەرما) و (گەرما) لێیان بوو بە کێشە و هەریەکە لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ئەمن دەزانم ئادەمیزاد ڕوت بکەمەوە و لیباسەکەی لەبەر داکەنم. (با) زۆر بەتوندی و تووڕەییەوە تینی دایە خۆی و هەستا هات، بەڵام هەرچەند بەهێزتر دەبوو ئینسان باشتر بەرگ و لیباسەکەی دەخۆیەوە دەپێچا و (با) نەیتوانی ڕووتی بکاتەوە. بەڵام، کاتێ خۆرهەڵات و (گەرما)ی نیوەڕۆ تینی هێنا ئینسانەکە ناچار بوو لە (گەرمان) کراسەکەی داکەنی و بە شانی دادا.

*****

دەڵێ: (کـوڕ)ێک کـوللەی دەگـرتن. چاوی بە (دوپشـک)ێک کـەوت وەیزانـی (کولله)یەکی گەورەیە، دەستی جۆ برد بیگری و زانی کە هەو نیە. دوپشکەکە گوتی: ئەگەر دەتگرتم تۆیەم پێ دەکردی لە کولله گرتن. ئەو پەندە دەڵێ، دەبێ ئینسان فەرقی چاک و خەراپ بکا.

*****

دەڵێ: سەگێک دەچێتە قەسابخانە و پارچە گۆشتێک دەفرێنی و دەچێتە لای ئاوێکەوە وەپەڕی. کاتێ وێنەی پارچە گۆشتەی بە دەمیەوە لە ئاوەکەدا دەبینی، زۆر بە گەورەتر لەوە دێتە بەرچاوان. ئەوەی خۆی فڕێدەدا و پەلاماری ئەوەی ناو ئاوەکە دەدا، بەڵام کە دەچێتە ناو ئاوەکەوە هیچ نابینی. تا دەگەڕێتەوە بۆ لای، ڕێوی دەیبا. سەگ کە وای بەسەر دێ دەڵێ: بەڕاستی تەماع خەراپی بەسەر هێنام و ئەوەی بووشم لە دەستی دەرهێنام.

*****

دەڵێ: ورگ و قاچ دەکەونە کێشەوە، قاچ دەڵێ: ئێمە بەهێز و توانای خۆمان لاشە و بەدەنی ئینسان و گیانلەبەرانمان ڕاگرتووە. ورگ دەڵێ: وانیە. ئەگەر ئەمن شتێک نەخۆم، ئێوە هەر ناتوانن بەڕێدا بڕۆن. جا چ بمێنێ شتێک هەڵگرن. ئەو پەندە دەڵێ: کەس بە تەنیا هیچی پێناکرێ و پشت بەیەکتر ببەستن هەتا تواناتان هەبێ.

*****

دەڵێ: ئاسنگەرێک سەگێکی هەبوو، لەگەڵی دەچوو بۆ دوکان. لەکاتی کارکردندا لەبەر دوکانەکەی وەردەکەوت، بەڵام کاتێک کابرا دەستی لە کار دەکێشایەوە و خەریکی خواردنی نان دەبوو، سەگەکە وەخەبەر دەهات و لەبەر دەمی قووت دەبۆوە. ڕۆژێک ئاسنگەر ڕووی کردە سەگەکە و گوتی: ئەرێ ئەی سەگی سەگباب؛ بۆچی تۆ

به زرمه زرم و دەنگی ئاسن کوتان تا نیوەڕۆ وەخەبەر نایەی؟ بەلام بەدەنگی پاروە نانێکی نهێنی من گورج هەڵدەستی و لەبەر دەمی من قووت دەبیەوە.

*****

دەڵێ: سەگێک دەکەویتە سەر گورگێک و ڕاوی دەنێ و گورگ لەبەری ڕادەکا. سەگەکە خۆی فش دەکاتەوە و فەخر دەکا کە ئەوەندە ئازاو گورج و گۆلە، گورگی ڕاوناوە. گورگ ئاوڕی دایەوە سەر و گوتی: وامەزانە کە ئەمن لەتۆ دەترسم و لەترسی تۆ ڕادەکەم؟ بەلکو لەترسی ئەو کەسە ڕادەکەم کە بە دواتەوەیە. ئەو پەندە دەڵێ: دەبێ ئینسان فەخر بە شتێکەوە بکا کە خۆی هەیەتی و لە خۆیدا مەوجودە، نەک بە هی خەلکی دیکەوە.

*****

دەڵێ: دوو کەڵەشێر لێیان بوو بە شەڕ و تێکهەڵپڕژان، یەکیان بەزی و هەڵات خۆی شاردەوە، بەلام ئەوەی ئازایان لەخۆی بایی بوو، چووە سەربانی و دەستی کرد بە باڵ لێکدان و خوێندن و پێی لە عەرزێ بڕابوون. لەوکاتەدا هەڵۆیەک چاوی پێکەوت و پەلاماری دایە و بردی. ئەوە مانای وایە، پیاو نابێ قەت لەخۆی بای بێ.

*****

دەڵێ: جارێک کۆمەڵێک (قاز) و (سوێسکە) پێکەوە پەیمانیان بەست کە هەر پێکەوە بلەوەڕێن و لە یەکتر دانەبڕێن. ڕۆژێک لە مەزرایەک دەگەڕان. چەند ڕاوچیان لێ پەیدا بوون. سوێسکە کە چاویان بە ڕاوچیەکان کەوت، چونکە سوک بوون لە شەقەی بالانیان دا و فڕین و بۆی دەرچوون، بەلام قازەکان چونکە زۆر قورس و قەڵەو بوون نەیانتوانی بفڕن و تووش بوون. ئەوە مانای وایە، ئینسان دەبێ لەگەڵ هاوسنفی خۆی تێکەڵ بێ.

**هەتا ئێرە پەندەکانی لوقمان بوون.**

*****

دەڵێن: مەلایەک قوتابخانەی هەبوو دەرسی بە منداڵان دەگوت، بەلام لە ماڵەوە هەمیشە ڕوو بە ڕووی ژنەکەی لە دوا هەموو نوێژێک لە دوعاکانیدا دەیگوت خوایە لە مەکری ژنانم بەدور کەی. ژنەکەی زۆری پێ ناخۆش بوو کە میردەکەی لە لای وی ئاوا دەرجەق بە ژنان بدوێ. ڕۆژێک بە مەلای گوت: بۆ بەقسەم ناکەی ئەو دوعایە تەرک کەی؟ مەگەر تۆ لە مەکری ژنان ناترسی؟ گوتی: ئێستا کە هەردەست لەو دوعایە هەڵناگری، دەبێ بەلایەکت بەسەر بێنم کە بە داستان وەیگێڕن و تا تۆ ماوی ئەو دوعایەت بە دەمدا نەیەتەوە. مەلا پێکەنی و گوتی: ئافرەت خەیالی خاو

مەکە، ئەمن لەو پیاوە عەوام و نەزانانە نیم کە مەکری تۆ کارم تێ بکا. ئەمن زانام و چەند کتێبم لە مەکری ژناندا خوێندۆتەوە و بە زانیاری خۆم دەتوانم جڵەوی مەکری ژنان بگرم.

ڕۆژێک مەلا ژن بە دزی مەلا چوو بۆ قوتابخانەکەی و هێندێک نوقڵ و مێوژی بۆ قوتابییەکان برد و زۆری دڵخۆشی دانەوە و لەپاشان گوتی: تکاتان لێ دەکەم قوتابینە، کە مەلا هاتەوە هەمووتان بڵێن: ئەی مامۆستا ئەوە ئەمڕۆ ڕەنگت بۆوا گۆڕاوە و زەرد هەڵگەڕاوی؟ خوا نەخواستە تووشی نەخۆشی بووی؟ کاتێ مەلا چۆوە قوتابخانە گوتیان مامۆستا ئەوە بۆ ئاوات لێهاتووە؟ بۆچی ڕەنگت پەڕیوە و کز بووی؟ مەلا گوتی نا زۆر باشم، هیچم نیە، بەڵام کە زانی هەموو قوتابییەکان هەر ئاوا دەڵێن، کەوتە شکەوە و گوتی: لەوانەیە تووشی نەخۆشییەک بووبم و بەخۆم نەزانیوە. ئەگەر وا نەبوایە هەر یەک دوانیان وەیان دەگوت، هەموان وەیان نەدەگوت. ئەوەندەی بیر لێکردەوە هەستی بە ناڕەحەتی کرد و گوتی: وادیارە قوتابییە بە وەفاکانم ڕاست دەکەن نەخۆشم. بە قوتابییەکانی گوت بڕۆنەوە مەرەخەستن و هاتەوە بۆ ماڵەوە. کە مەلا ژن چاوی پێکەوت وەک ئاگای لە هیچ نەبێ گوتی: ئەیەڕۆ مەلا ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟ خوانە خواستە نەخۆشی ڕەنگت وا پەڕیوە؟ مەلا گوتی: وادیارە تووشی نەخۆشی بووم. مەلا ژن هاواری کرد و گوتی: خوا نەکا تۆ نەخۆش بی، ئەگەر تۆ نەخۆ ش بی، من ژیانم تاڵ دەبێ. مەلا ناڵاندی و گوتی: هەموو ئەندامەکانم وشک بوون، حاڵم زۆر خەراپە، سەرم گێژ دەخوا، دەمار و ڕەگەکانی ملم وشک بوون، ئەگەر دەتوانی تۆزێک سەر و ملم داماڵە. مەلا ژن بە فرسەتی زانی هێندێکی زەردەچێوە کردە ناو مستی و لەگەڵ شێلان و داماڵینەکەی سەرو ڕووی مەلای زەرد کرد و لەپاشان گوتی: ئەی ماڵ وێران خۆم یاخوا قەزات لەمن کەوی، ڕەنگت وردە وردە زەرد هەڵدەگەڕێ، وا دیارە تووشی نەخۆشی زەردوویی بووی، خوا ڕەحم بەمن بکا، خۆ ئەگەر مێردە خۆشەویستەکەم زەردوویی بگری لەتاوی دەمرم. مەلا داوای لە مەلا ژن کرد ئا وێنەی بۆ بێنی، کە تەماشا ئاوێنەی کرد و زەردی ڕوخساری خۆی دی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: ڕاست دەکەی، تەماشا تووشی چ بەڵایەک بووم؟ زەردوویم گرتووە. مەلا ژن دەستی کرد بە گریان و هاوار و دەیگوت: خوایە ڕەحم بەمنداڵە وردەکانم بکە، مەلام لێ نەستێنیەوە.

ئەو وەزعە مەلای زیاتر ناڕەحەت کرد. مەلا ژن گوتی: چاک وایە بچم دوکتۆر بانگ کەم و بزانم چیەتی؟ هەستا ڕۆیی. مەلا هەستی کرد کە زۆری برسیە و هێزی

کەم بووە. گوتی با بزانم چمان هەیە کەمێک بخۆم. تەماشای کرد کفتەیان هەیە و دەستی کرد بە کفتە خواردن. مەلا ژن کە چۆو بوو دوکتۆر بێنی، لە ڕێگادا فکری کردەوە و گوتی خۆ مێردەکەم نەخۆش نیە، ئەگەر دوکتۆر بێ دەزانی ساختە و فێڵەکەم ئاشکرا دەبێ. باشتر وایە وەگەڕێم و بڵێم دوکتۆر نەهات. کاتێ هاتەوە تەماشای کرد مەلا شتێک دەخوا. مەلاش کە چاوی بە مەلا ژن کەوت، لە خەجالەتیان دەمی پێکەوە نا و کفتەی دەگوپێ گرت. مەلا ژن گوتی: وا دیارە ملە خرەت گرتووە، لە دڵی خۆیدا گوتی باشترە بچم پوور زێنەبێ بانگ کەم بۆی هەڵدڕی. مەلا ژن چوو پوور زێنەبی هێنا، مەلا هەرخەریکی کفتە خواردن بوو، کفتەی لە دەمدا بوو پوور زێنەب هات خەریک بوو نەشتەری لێدا، مەلا کفتەی فرێدایە دەرەوە و هاواری کرد و گوتی: داد لە مەکری ژنان.

*****

دەڵێن: پیرەژنێک سێ کوڕی هەبوو. دووانیان ژنیان هێنابوو، بەڵام کوڕە چوکەلەکەی ژنی نەهێنابوو. دوو بووکەکەی هەر ڕۆژە یەکیان خەسوەکەیان لە کۆڵ دەکرد و کاری مالیشیان پێوە دەکرد، چونکە دەیانگوت ئەگەر لە کۆڵی نەکەین و ئاگامان لێی نەبێ لەبەر پیربوونی نارەحەت دەبێ و دڵی مێردەکانمان دێشێ. دوو براکە هەرچەند لەبەر برا چوکەکەیان دەپاڕانەوە ژن بێنێ تا ژنەکەی یارمەتی ژنەکانیان بدا بەقسەی نەدەکردن. چونکە پێی ڕەوا نەبوو ژن بێنێ و وەک براژنەکانی تووشی نارەحەتی ببێ یان ئەگەر وەک ئەوان نەکا دایکی دڵی بێشێ. بە ڕێکەوت ڕۆژێک بە کۆلانێکدا دەڕۆی، چاوی بە کچێکی قژ بلاوی، حاڵ پەرێشان کەوت لە کەلاوەیەک دانیشتبوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: واچاکە ئەو کچە بخوازم. لە چەند لاوە قازانجە. یەکیان ئەوەیە کچە لەو بەدبەختیە ڕزگار دەکەم. دووەم دوو براژنەکانم تۆزێک ئاسودە دەبن و کاریان ئاسانتر دەبێ و بە سێ ڕۆژ جارێک نۆرەی لە کۆڵ کردنی دایکمیان وەبەر دەکەوێ. خولاسە هاتەوە ماڵێ و بە براژنەکانی گوت بچن فلان کچەم بۆ بخوازن. براژنەکانی زۆریان پێ خۆشبوو، فەوری چون بۆیان خواست و گواستیانەوە. براژنەکانیشی لە براکانیان خۆشحاڵتر بوون کە یارمەتی دەریان بۆ پەیدا بووە. بووک کە تەماشای کرد ئەوە کارێکی زۆر زەحمەتە ئەو پیرێژنەش لەکۆڵ بکا و کاری ماڵەوەش بکا. ڕۆژێک کوڕەکان لە ماڵ نەبوون و پیرێژنیش نوستبو. بە ژنی هێوەرەکانی گوت ئەگەر شتێکم بدەنێ، ئەو پیرێژنە لەکۆڵ خۆمان دەکەمەوە.

گوتیان چ دەڵێی قەبووڵە. گوتی هیچم لە ئێوە ناوێ، تەنیا گەردن بەند و دەست

بەند و گوارە و ئەنگوستیلەی خەسووم دەوێ. گوتیان زۆرباشە. بووکی تازە گوتی ئەمڕۆ نۆرەی منە، نانیش بکەم و لە کۆلیشی بکەم، بەلام دەبێ کاتێ لەکۆلم کرد و خەریکی نانکردن بووم یەکتان بچیتە دەرەوە و بەغار بێتەوە ژور و بەمن بلێ جەنازەی باوکتیا ن بەسەر پشتی وەلاغێک لە سەحرا هێنایەوە. گوتی ئیتر حەقتان نەبێ بەسەرییەوە. بۆخۆ م دەزانم چ دەکەم. پیرێژن ومخەبەر هات و نانی خوارد و گوتی: ئەمڕۆ نۆرەی هەرکەسە بابێ لەکۆلم کا. تازە بووک گورج هات لەکۆلی کرد. لەوکاتەدا تەندور لە گڕەپێچان دا بوو دەستی کرد بە نان کردن. یەک لە ژنی هێوەرەکانی چووە دەرەوە و هاتەوە ژور و بەگریانەوە گوتی دەک خوشکێ لال و کەڕ بم، خۆ ئەوە جەنازەی باوکتیان هێنایەوە. بووکی تازە هەر ڕاست بۆوە و دەستی کرد بە لەخۆدان و خۆ بەملا و ئەولادا خستن و خۆ بە دیوار دادان، هەرچەند پیرێژن هاواری دەکرد من دانێ گوێی نەدەدایە. ئەوەندەی بە دیواران دادا هەموو بەدەنی شین ببۆوە و زمانی شکا و لەکۆلی کەوتە خوارێ. بردیان لە جێیان خست و دەستیان کرد بە ئیشوکاری خۆیان ئێوارێ کە کوڕەکان هاتنەوە و تەماشایان کرد دایکیان بە کۆلی هیچیانەوە نیە گوتیان: ئەوە کوا دایکما ن؟ ژنەکان گوتیان ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ لەخۆوە زمانی شکا و قسەی بۆ نەکران و خەواندومانە. کوڕەکان چوونە لای و تەماشایان کرد دایکیان لە سەرەمەرگ دایە و چاوەڕوانی چاو پێکەوتنیانە. گوتیان: دایە قسە بکە ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟ پیرێژن کە نەیدەتوانی قسە بکا، سینگی نیشانی کوڕەکانی دا و ئیشارەی دەکرد بۆ بووکی تازە، یانی ئەو وای لێکردووە. فەوری بووکی تازە گوتی ئەوە دایکی مێردەخۆشەوستەکەم ئیشارە بۆمن دەکا کە زۆری خۆش دەوێم و دەڵێ: ئەگەر مردم گەردنبەندەکەم بدەن بەو. لەپاشان ڕووی کردە براژنەکانی و گوتی: وا نیە؟ گوتیان بەڵێ وایە. کاتێ زمانی هەبوو بە ئێمەی گوت کە بیدەن بەو. خولاسە پیرێژن دەستی بۆ هەر ئەندامێکی دەبرد و نیشانی دەدا کە ئەو بووکە تازە وای لێکردووە، ئەو بە قازانجی خۆی مانای دەکردەوە و دوو ژنەکانی دیکەش دەیانگوت ڕاست دەکا و پیرێژن گیانی دا و کوڕەکان دەستیان کرد بە گریان و ژنەکانیش لەبەر ئەوەی مێردەکانیان شک نەکەن، دەستیان کرد بە لەخۆدان و بوکی تازە بە ئالتونەکانی شاد بوو.

*****

بەرگ درووێک عادەتی وابوو هەر پارچەیەک دەمایەوە هەڵی دەگرت و نەیدەدایەوە بە خاوەنەکەی. شەوێک لە خەویدا ڕۆژی قیامەت بوو، بانگیان کرد بۆ ژێر ئالای عەدالەت و خاوەن پارچە قووماشەکان هاتن، بە مەقاستی ئاگرین گۆشت و

ئیسقانیان بڕی و بردیان. کاتێ لەترسان وەخەبەر هات عەهدی کرد جارێکی دی هەڵیان نەگری و بیانداتەوە بە خاوەنەکانیان. بەیانی بە شاگردەکەی گوت: هەرکاتێ چاوت لێ بوو کە پارچە قووماشێکم هەڵگرت، بڵێ ئوستاد ئالاکە. ئەزقەزا ڕۆژێک قووماشێکی زۆر بەنرخیان هێنا. کە بڕی، پارچەیەکی لەبەر مایەوە، هەرچەند کردی دڵی نەهات بیداتەوە بە خاوەنەکەی و هەڵیگرت. شاگردەکەی چاوی لێ بوو گوتی: ئوستاد ئالاکە! خەیاتەکە گوتی: ڕۆڵە قەڵەم بە سەر ئەوەیاندا بێنە.

*****

دەڵێن: ئەو مەزرایەی کە ناوی ژێر پردە و کەوتۆتە دە کیلۆمیتری باشووری قەڵاتی(سە) و بەشی چەند خاوەن ملکانە و چەند جووتبەندە دەیکێڵن، قەلایەکی تێدایە، دیوارەکانی زۆر بەرزن. ئەو جێگایە ئەوەندە ساردە، کە خەڵک بە نموونە باسی سەرماکەی دەکەن. لە یەکێ لە شەوەکانی پایزدا یەکێک لە ئاغاکان دەچێتە وێ و کاتێ نوستن بە خاوەن ماڵەکە دەڵێ: وەختی نوستنە، دەستێک لیفە و دۆشەک بێنە، خەوم دێ. خاون ماڵەکە لە وەلامدا دەڵێ: ئاغا لیفە و دۆشەکمان نیە، تەنیا سەرجلی وەلاغمان هەیە. ئاغا زۆر تورە دەبێ و دەڵێ: هەی ناپیاوی بێ قیمەت، ئەمن جلی وەلاغان بەخۆ دادەم؟ کابرا دەڵێ: ئاغا چ هەبێ و میوان کێ بێ هەر ئەوەیە. ئاغا قەڵس دەبێ و دەڕوا بۆ وەتاغێکی دی و دەستور دەدا هێندێک دار دێنن و ئاگر دەکەنەوە. بە لێکدانەوەی خۆی ئیتر پێویستی بە پێخەف نابێ، بەڵام لە نیوەشەودا سەرما تینی بۆ دێنی و زۆر نارەحەت دەبێ و دێتە دەرێ بانگی خاوەن ماڵەکە دەکا و دەڵێ: هۆی عەولا! عەولا وەلام دەداتەوە دەڵێ ئاغا چ دەفەرمووی فەرمایشتێکت هەیە؟ ئاغا دەڵێ: کوڕە ئەوەی گوتت بیبێنە، بەڵام ناوی مەبە.

*****

ڕۆژێک، شێرێک لەبەر دەمی ئەشکەوتێک نوستبو، کەلاکی مەڕێکی لەبەر دەم بوو نیوەی لێ خوارد بوو، نیوەی مابوو. ڕێوییەک لە دوورەوە دێ هێندێکی لێ بخوا شێرەکە کە چاوی لێ بوو خەوی لەخۆ خست و گوتی: ئێستا کە من تێرم خواردوو با ئەویش بێ بخوا. ڕێوی بۆ ئەوەی خاترجەم بێ، لە نووستنی شێر، (ڕیخۆڵە)یەک هەڵگرت و دەست و پێی شێرەکەی پێ بەست و دەستی کرد بە خواردن. کە تێر خوارد ڕۆیشت شێرەکە ویستی هەستێ، بەڵام گەرمای نیوەڕۆ ڕیخۆڵەکەی وش کردبۆوە. شێرەکە هەرچەند کردی نەیتوانی هەستێ، تورە بوو گوتی: پیاوەتیم کر کەچی تووشی ناپیاوی بووم. ناچار خۆی مات کرد تا مشکێک لە کونێک هاتەدەر ڕیخۆڵەکەی لەت لەت کرد و چوو لە کونەکەیەوە. شێرەکە هەستا بڕوا، شێرێکی د

هات و گوتی: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ گوتی، دەڕۆم لەو وڵاتە دور دەکەومەوە. شێرەکە گوتی: بۆ دەڕۆیی؟ چ خەراپەیەکت لە ئێمە دیوە، لە وەڵامدا گوتی: لە جێگایەک ڕێوی بێ دەست و قاچی من ببەستی و مشک بێ وەمکا، ئیتر لەو وڵاتەدا ژیان بۆ من هیچ مانای نیە.

*****

دەڵێن: کابرایەکی تاجری دەوڵەمەند ئێستریکی هەبوو، نۆکەرەکانی ئەوەندەیان خزمەت کرد بوو، قەڵەو و جوان ببوو، بەتایبەتی هەرکە تاجرەکە سواری دەبوو بۆ سەفەریکی دوور. زین و لەغاوی لە مەخمەر و ئاوریشم بۆ دروست کردبوو. هەرجارێ دەچوو بۆ سەفەر پێشتر دەیبرد نالی دەکرد جا دەڕۆیی. بە ڕێکەوت جارێک بەو هەموو خزمەت و ناز و نەوازشەی کە دەیدی نەیهێشت نالی بکەن و چەند نۆکەری تاجرباشی بە جووتە بەلادا خست. تاجر کە ئێسترەکەی زۆر خۆش دەویست لای دۆستێکی باسی کرد. دۆستەکەی گوتی: هیچ نارەحەت مەبە، ئاسانە. تاجرەکەی لەگەڵ خۆی برد و چوونە سەرگوێلکێک، کە کەرێکی پیری پەککەوتەی لێ بوو، لە سەر دەمی یەوە هەتادەگاتە سەرسمی بریندا بوو و، خەریک بوو لە برسان بمرێ. بە دەستوری دۆستی تاجرەکە، نۆکەرەکان چوون هێنایان بۆ دوکانی نالبەندەکە کە ئێسترەکەی لێ بوو. دۆستە دنیا دیدەکەی تاجر چۆ پێشەوە و لەپێش چاوی ئێسترەکە، کە لەبەر فیزو دەماری خۆ بەزل زانین خەریک بوو پەڕ و باڵ دەرکا، گوێی کەرەکەی گرت و ڕووی کردە ئێسترەکە و گوتی: بێدەنگ ڕاوەستە بۆ نالکردن، بەسە مەگەر تۆ باوکی خۆت ناناسی؟ خۆ نەناسین و بێ ئەخلاقی بەسە. ئێسترەکە بەچاوپێکەوتنی باوکی و ناسینی زۆر خەجاڵەت و شەرمەندە بۆوە و زۆر لەسەرەخۆ ڕاوەستا نالی بکەن. ئەوە بۆ ئەو کەسانە دەگوترێ کە لەخۆیان بایی دەبن و ئەسڵی خۆیان ناناسن.

*****

دەڵێن: ڕۆژێک پیاوێک بە کۆڵانیکدا دەڕوا. چاوی بە ئافرەتێک دەکەوێ لەبن دیوارێک ڕاوەستاوە دەگری. کابرا پێی دەڵێ: خوشکم ئەوە بۆ دەگری؟ ئافرەتەکە دەستی هێنا و داوێنی کابرای گرت و گوتی: ئەی پیاو زۆر داماوم بە موقەدەساتی عالەم و بە مەردانەگی خۆت سوێندت دەدەم یارمەتیم بدە. کابرا بەزەیی پێدا هاتەوە و گوتی: ئەوەی لە دەستم بێ تەقسیری ناکەم. ژنە، کە توند داوێنی گرتبوو گوتی: تۆ فریشتەی خوای گەورە و میهرەبان لە ئاسمانەوە بۆ منی داماوی ناردووی. ئەمن مێردێکم بوو زۆر بەدئەخلاق بوو، زۆر ڕەزیل و پیسکە بوو، چەند ساڵ جوانی خۆم

لەگەڵ بردە سەر، ئاخری توانام نەما و تەلاقم لێ وەرگرت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئافرەتێکی گەنج و جوانم، هەتا ئێستا چەندین کەس هاتوونە خوازبێنیم و بۆ حیفزی ئابڕوم و ژیانم دەبێ شوو بە یەکێک بکەم. بەڵام، دەبێ لە وەختی مارەکردندا، تەلاقنامەی مێردەکەی پێشووم پێ بێ تا داواکار و قازی وا نەزانن کە من ئافرەتێکی نانەجیبم. لەبەر چارەڕەشی و بەدبەختی خۆم، تەلاقنامەکەم ون کردووە و زۆر گەڕام نەمدیەوە، دوو ڕۆژ لەمەوبەر چومەوە بەر دەرگای ماڵی مێردەکەم بەڵکو تەلاقنامەیەکی دیم بۆ بنوسی، کەچی گوتیان: مانگێکە مردووە. ئێستاش کە دەبینم چارەم نەماوە لە داخان دەگریم. جا دەستم بە داوێنت هەروەک بەڵێنت دا، مەحزی ڕەزای خوا لەگەڵم وەرە بۆلای قازی و بڵێ: ژنی منە و لەلای قازی تەلاقم بدە، تا تەلاقنامەم بەدەستەوە بێ و لەو بەدبەختی و موسیبەتە ڕزگارم بێ. لە پاداشتی ئەو پیاوەتیەدا هەتا ماوم دوعای بەخێرت بۆ دەکەم، چونکە ئابڕوم دەکڕیەوە، هەروەها ئەو پیاوەتیەی تۆش لەلای خواوەندی گەورە بێ پاداش نابێ.

کابرا دڵی پێ سوتاو لەگەڵی چوو بۆ لای قازی. ئافرەتەکە لای قازی شکایەتی کرد کە ئەو مێردەی من ناتوانی بەخێوم بکا، هاتووم تەلاقی لێ وەرگرم. منیش گوتم، جەنابی قازی من کابرایەکی کارگەرم، هەرچەند شەو و ڕۆژ زەحمەت دەکێشم، لەگەڵ ئەوەشدا لە توانای خەرج و مخاریجی ئەو ژنە دەرنایەم. ماندوو مردو ئێواران دێمەوە تووشی پرتە و بۆڵەی ئەو ژنە دەبم و لەو ژیانە بێزارم و ناچارم تەلاقی بدەم. قازی زۆری ئامۆژگاری کردن فایدەی نەبوو، ناچار تەلاقی دا و تەلاقنامەی بۆ نوسی و دایان بە ژنەکە. ئافرەتەکە دەڵێ: جەنابی قازی منیش ئەوە لە حەقی مارەی و مەسرەف و خەرجی زەمانی لە عیددا بوونم پێبەخشی و گەردنی ئازاد بێ و تەنانەت پارەی جەنابیشت دەدەم. دەست دەبا پارەی قازیش دەدا، بەڵام هەر لە دوای ئەوە دەست دەبا منداڵێکی ساوای پێچراوە لە باخەڵی دەردێنی و لەپێش کابرای دادەنێ و دەڵێ جەنابی قازی ئەوەش منداڵەکەی، ئێتر من توانای بەخێو کردنیم نیە. ژنە ئەوە دەڵێ و گورج بۆی دەردەچێ. کابرای بێچارە کە تازە ناتوانی هیچ ئینکاری بکا، ناچار منداڵەکە هەڵدەگری و دەچێتە ماڵی دۆستێکی و داوای چارەیەکی لێ دەکا. دۆستەکەی دەڵێ: چارە ئەوەیە ئێستا دوو سەعاتی ماوە بۆ نوێژی نیوەڕۆ، تا مزگەوت چۆڵە بیبە لە میحرابی مزگەوتی دانێ و گورج وەرە دەرێ، موسوڵمانێک بۆخۆی دەیباتەوە. بەقسەی دۆستەکەی، منداڵەکە دەبا لە میحرابی مزگەوتی دادەنێ، کەچی منداڵەکە وەخەبەر دێ و دەگری. لەوکاتەدا مجێوری مزگەوت وەژوور دەکەوی، ئێخەی کابرا دەگری و دەیبا بۆلای منداڵەکە و

دەڵێ: مەلعوونی پیسی کافر؛ میحرابی مزگەوت جێگای ئەومیە. زۆڵ و حەرامزادەی لێ دانێی؟ ئەوە دووەم منداڵە لە دوێنێوە هێناوتە بۆ ئەو مزگەوتە.

مجێور منداڵەکە و منداڵێکی دیکەی شیرەخۆرەی دیکەش دێنی و دەیاندا بە کابرا و دەڵێ تا زووە لە مزگەوت برۆ دەرەوە دەنا بانگی موسوڵمانان دەکەم، بێن بەردەبارانت بکەن. کابرای بێچارە لە ترسی روح و ئابرووی خۆی هەردوو منالەکان هەڵدەگری و دێتەوە بۆ ماڵی دۆستەکەی و رووداوەکەی بۆ دەگێڕیتەوە. ژنی دۆستەکەی کە بەو بەسەرهاتەی زانی، گوتی: ژنی یەکێک لە پیاوە دەوڵەمەندەکانی ئەو گەڕەکە دە رۆژ لەمەو بەر زاوە و دوو منداڵی بە زگێک بووە و ئێستا نەچۆتە حەمام. هەستە هەر ئێستا ئەو دوو منداڵە بەرە بۆ حەمامی ژنان و بە سوغڕا خانمی دەلاک بڵێ: ئەوە دوو منداڵەکەی فلانە ژنەن بۆ لای تۆی ناردون و ئێستاش خانم بۆ خۆی دێ. کابرا دەچێ و ئاوا بە سوغڕا خانم دەڵێ: سوغڕا خانم بە تەمای ئینعامێکی زۆر، گورج منداڵەکانی لێ وەردەگری و دەیانبا بۆ حەمام و کابرا ڕزگاری دەبێ و سوغڕاخانم تووش دەبێ.

*****

دەڵێن: (بالووڵ) زۆر لە کردەوەی هارونەڕەشید ناڕازی بوو، لەبەر ئەوە قەت پێنەدەکەنی. رۆژێک هارونەڕەشید لە بالوڵی پرسی: ئەوە بۆ قەت پێناکەنی؟ بالووڵ وەڵامی نەدایەوە. هارونەڕەشید بە پیاوێکی گوت، تۆ هەمیشە بە دوای بالووڵەوە بە، بەبێ ئەوەی پێت بزانی و بت بینی، ئەگەر چاوت لێبوو خەندەی هاتێ، وەرە پێم بڵێ، خەلاتێکی باشت دەکەم. ئەو کابرایە چەند رۆژ بە دوای بالووڵەوە بوو، خەندە و پێکەنینی لێ نەدی، تا رۆژێک بالووڵ چوو لەبەر دەمی دوکانی قەسابێک ڕاوەستا و دەژوری دوکانی قەسابەکە ڕاما و لەکاتی تەماشا کردنەکەدا زەردە خەندێکی هاتە سەرلێوان. کابرا بەپەلە هاتەوە لای هارونەڕەشید و ئەوەی دیبووی بۆی گێڕایەوە. هارونەڕەشید ناردی بەدوای بالووڵ دا و گوتی: ئەی بالووڵ، پێم بڵێ، هۆی چ بوو کاتێ تەماشای دوکانی کابرای قەسابت کرد، زەردەخەنەت هاتێ؟ لە وەلامدا گوتی: ئەمن زۆر لەوە دەترسام کە بەهۆی کارە ناڕەواکانت، من بە ئاگری خۆتەوە بسووتێنی، بەڵام کە چاوم بە دوکانی کابرای قەساب کەوت، زانیم مەڕ بە قاچی خۆی و بزن بە قاچی خۆی هەڵداوەسن و هەرکەس حیسابی خۆی بۆ دەکەن، جا ئەوە بوو لە خۆشیان پێکەنیم.

*****

کابرایەکی (سوێسنی) دەچێتە سەر سپی دارێک هەڵی پەردێوی، سپیدارەکە زۆر

بەرز دەبێ، کاتێ دەگاتە تۆقەسەری دارەکە، بایەکی زۆر تووند هەڵدەکا و کابرا زۆر دەترسێ، لەترسان ڕوو دەکاتە ئاسمان و دەڵێ: ئەی خوای گەورە! ئەگەر ئەمجارە ڕزگارم بکەی شەرت بێ هەموو مەڕەکانم بکەم بە خێر. بە ئەمری خوا، بایەکە هێندێک ئارام دەبێتەوە و کابرا تۆزێک دێتەخوارێ و کەمێک ئومێد پەیدا دەکاتەوە. دەڵێ: خوایە! مەڕەکان نا، خوریەکەیان. هێندێکی دی دێتەخوارێ و ترسی کەمتر دەبێ، دەڵێ: خوریەکەیان نا، کەشکەکەیان. کاتێ بەتەواوی دەگاتە خوارێ، بە پێکەنینەوە دەڵێ: بابە تازە مەڕی چی وخوری چی و کەشکی چی.

*****

جارێک ئاغایەک چەند ڕەئیس عەشیرەت و ئاغا بانگهێشتن دەکا و لە ڕۆژی دیاریکراودا هەر ئاغایەی لەگەڵ نۆکەری تایبەتی خۆی دەچێ بۆ ماڵی ئاغا و زۆر بەڕێزەوە وەریان دەگرن. لە وەختی نان خواردندا ئاغا دەست دەکەن بە نان خواردن و نۆکەرەکانیش دەست لەسەر سینگ ڕادەوەستن. ئاغایەکیان کاتی پلاو خواردن چەند دەنکە برینجی بە سمێڵانەوە دەنووسێ و بەخۆی نازانی. نۆکەرەکەی لە دوورەوە چاوی لێ دەبێ و بانگی دەکا. ئاغاکان دەنگی نۆکەرەکانی خۆیان دەناسنەوە، ئاغا کە سەری بەرز کردەوە پرسی: ها چیە؟ نۆکەرەکەی دەڵێ: ئاغا (بولبول) بە لەقی گوڵەوە نیشتووە، ئاغا و نۆکەر زۆر زیرەک بوون، ئاغا حاڵی دەبێ و دەنکە برینجەکان لە سمێڵی دەکاتەوە. ئاغاکان زۆریان بەلاوە سەیر بوو کە ئەو نۆکەرە چۆن بەو قسە جوانە ئاغاکەی خۆی حاڵی کرد. پاش چەند دەقیقەیەک یەک لە ئاغاکان دەچێتە سەر ئاودەست و نۆکەرەکەی ئافتاوەی بۆ هەڵدەگرێ و ئاغا دەڵێ: دیتت ئەمڕۆ ئەو نۆکەرەی فلان ئاغا لەو مەجلیسەدا چ قسەیەکی جوانی کرد؟ چەندە نۆکەری چاکە، بەڕاستی نۆکەر ئاوا دەبێ و ئاغاکەی سەربەرز کرد.

ئاغا گوتی: باش گوێم بۆ ڕاگرە دەڵێم چی، حەفتەی داهاتوو ئەمن دەعوەتیان دەکەم، هەموویان دێنە ماڵی ئێمە، منیش لەکاتی خواردندا وادەکەم چەند دەنکە برینج بە سمێڵمەوە بنووسێن، زۆر چاکت ئاگا لێ بێ، تۆش ئەو قسەی ئەمڕۆ نۆکەری ئاغا کردی بیڵێ تا منیش لەو مەجلیسەدا سەربەرز بم. بۆ بەیانی نۆکەرەکە ئەو قسەی لەبیر چۆوە. ڕۆژی دەعوەتەکە، ئاغاکان هەموویان هاتن و نان دانراو دەست کرا بە نان خواردن و ئاغا بە ئانقەست وایکرد چەند دەنکە برینجی بە سمێڵەوە بنووسێن. ئاغا هەر چاوەڕوانی دەکرد نۆکەرەکەی قسە بکا، بەڵام نۆکەرەکەی هەرچەندەی کرد وەبیری نەدەهاتەوە. ئاغاش بە دزیەوە، پەیتا پەیتا ئامـاژەی بە نۆکەرەکەی دەکرد، کە بیڵێ. نۆکەرەکە گوتی: ئاغا ئەو قسەی کە

حەفتەی رابردو لەسەر ئاودەست پێت گوتم: بە سمێلتەوەیە لێی وەکە. ئاغا زۆر خەجالەت بۆوە، بەلام تازە چ دەکرا.

*****

دەڵێن: لە دێیەکی دوور لە مەلا و فەقێ، کابرایەک مردبوو. بردیان بۆ سەرقەبران. کەس نەبوو نوێژی لەسەر بکا. لەوکاتەدا پیاوێکی پیر لە گوندێکی دیکە بەوێدا دەڕوا، کابرا پیرە عادەتی وا دەبێ هەمیشە پەڕۆیەکی سپی لەسەر دەهاڵێنێ. بانگی دەکەن و دەڵێن: مامۆستا وەرە نوێژمان بۆ لەسەر ئەو مردووە بکە و تەلقینی دادە. کابرا دەڵێ: کاکە ئەمن مەلا نیم نازانم نوێژی مردوو چۆنە و چۆنی تەلقین دادەدەن. خەڵکەکە لە کابرا تورە دەبن و دەڵێن مامۆستا خۆ بەخۆڕایی زەحمەتت نادەین، سەد تمەن و کەرێکت دەدەینێ سواری بی. لەوکاتەدا دۆستێکی کابرا پیرە بەوێدا دێ، ئەو دەزانی کە پیرە هیچ نازانی. پیرە ئیشارەی بۆ دەکات، کە دەنگ نەکا. دەچێتە سەر قەبری مردووەکە و دەڵێ: (لە دوورەوە هاتووی دەنگ مەکە، کارەکەی من خەراپ مەکە. سەد تمەن و کەرێکی دەدەن اَلْفَاتِحَةْ مَعَ الصَّلَوَاتْ. خەڵکەکە، کە لە زمانی حاڵی نابن دەست دەکەن بە سلاوات لێدان و مردووەکە دەنێژن و پیرە و دۆستەکەشی پارەکە بەش دەکەن و پیرە لێی سواری کەرەکە دەبێ و دێنەوە.

*****

حاکمی شاری(بروجیرد)ی ئێران جارێک عەبایەکی پێستی مەڕ خەلاتی سەرۆک عەشیرەتێکی لوڕ دەکا. ڕۆژی دوایی لەکاتێکدا حاکم لەگەڵ چەند پیاو ماقوڵی شار لە مەحکەمە دانیشتبوو، سەرۆک عەشیرەتەکە هاتە لای و عەباکەی بەراوەژو بە شانی دادابوو، واتە بە دیوی چەرمەکەیدا دەبەری کردبوو. ئەوجۆرە عەبایانە دەبێ بە دیوی خورییەکەیدا دەبەر بکرێن. دوای سلاو و وەلام حاکم گوتی: ئاغا ئەوە بۆ بەراوەژووت دەبەر کردووە؟ کابرا بە لەهجە و زمانی لوڕی گوتی: (تو بیبەتەر زانی یا بەڕرە) یانی تۆ باشتر دەزانی یان مەڕ؟

*****

گورگێکی پیر لە دەورانی ژیانیدا زۆری گیاندار خواردبوون، زەرەری بە زۆران گەیاندبوو. ڕۆژێک بڕیاریدا بۆ ئەوەی خوا لێی ڕازی بێ و عەفووی بکا بچێ بۆ حەج و تۆبە بکا. بەنیازی حەج وەڕێ دەکەوێ و زۆری پێناچی برسییەتی تینی بۆ دەێنی. تەماشا دەکا ئێسترێک لە مەزرایەکدا دەلەوەڕێ. دەچێ بۆلای و دەڵێ: دەمەوێ بچم بۆ حەج و تۆبە بکەم، ئێستاش زۆرم برسییە و پێمخۆشە تۆش لە

سەوابی ئەو حەجەدا شەریکم بی. ئێسترەکە دەڵێ: جا ئەمن چیم لە دەست دێ؟ گورگەکە دەڵێ: ئەگەر تۆ خۆت بکەیە قوربانی ئەو ڕێگایە، منیش و چەندی تریش لە گۆشتەکەت دەخۆین و پاداشتی زۆرە و خواش لە گوناحت خۆش دەبێ. ئێسترەکە بۆ ڕزگاری خۆی ڕوو دەکاتە گورگەکە و دەڵێ: مام گورگ من ئامادەم لەوکارە خێرەدا بەشداریی بکەم، بەڵام تووشی دەردێک بووم و ئەوە چەند ساڵە ئازارم دەدا، ئەگەر تۆ چارەم بکەی ئامادەم سەرم ببڕی بۆ قوربانی. گورگ دەڵێ: چ دەردێکت هەیە چارەی دەکەم، ئەگەر منیش بۆم چارە نەکرا دەچم بۆلای مام ڕێوی ئەو چارەی دەکا.

ئێسترەکە ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی: چ بڵێم، چەند ساڵ لەمەوبەر چوومە لای ناڵبەندێکی نەزان ناڵم بکا، بەڵام ئەو ناڵبەندە نەزانە ناڵەکەی لە گۆشتم دا و ئەوە چەند ساڵە ئازارم دەدا، جا وەرە بۆ خاتری خوا لە نزیکەوە چاوێک لە برینەکەی بکە. گورگەکە گوتی: بێنە با تەماشای کەم. ئێسترەکە پاشووی بڵند کردن و لەوکاتەدا کە مام گورگ دەیەویست تەماشا برینەکەی بکا، بەفرسەتی زانی و بەهەموو هێز و توانایەوە جووتەیەکی لە سەری دا و مێشکی هێنایەدەر. لەکاتی گیاندادا گورگەکە بەخۆی دەگوت: ئاخر گورگی بێ قیمەت، باوکت ناڵبەند بوو، دایکت ناڵبەند بوو، تۆ و ناڵبەندی؟ ئێسترەکەش لەخۆشیان نەیدەزانی چ بکا، هەردەڕۆی و جووتەی داویشتن و دەیگوت: تۆبەی گورگ مەرگە.

*****

لە زەمانی قەدیمدا پیاوێکی (کۆسە) ناوی (نەسوح) دەبێ، لەبەر ئەوەی کە ڕیش و سمێڵی نەبووە ویستوویەتی سود لە کۆسە بوونی وەرگری. دەڕوا بۆ ناوچەیەکی تر و دەبێ بە کیسەکێشی حەمامی ژنان. ڕۆژێک کچی حاکمی شار دێتە حەمام و کاتی خۆشتن ئەنگوستیلەیەکی زۆر بەنرخی لێ ون دەبێ، زۆری بۆ دەگەڕێ نایبینێتەوە، دەستور دەدا هەموو ژنەکان خۆیان ڕوت وەکەن و بیان پشکنن. لەوکاتەدا نەسوح دەڵێ: خۆ ئەگەر ژنەکان و بەتایبەتی کچی حاکم بزانی من ئافرەت نیم، خۆم دەزانم تووشی چ بەلایەک دەبم. لەوکاتەدا نەسوح لەبەر خوا دەپاڕێتەوە و بە دڵ تۆبە دەکا، کە ئەگەر لەو بەلایە ڕزگاری بێ هەتا ماوە لەو کارە دەست هەڵگری و خەریکی خواپەرستی بێ. بە ئەمری خوا لەوکاتەدا بانگ دەکەن دەڵێن: ئەنگوستیلەکەمان دیەوە و دەست لە پشکنینی ژنەکان هەڵدەگرن و نەسوح ڕزگاری دەبێ و لە حەمام دێتە دەرێ و دەچێتە ئەشکەوتێکەوە بۆ خواپەرستی ڕۆژێک لە غەیبەوە بانگی دەکەن و دەڵێن ئەی نەسوح تۆبەت قەبووڵە. نەسوح زۆر

کەیف خۆش دەبێ و تا وەفات دەکا، بێ ئەمری خوا ناکا. جا ئەوەیە کە دەڵێن تۆبەی نەسوحی.

*****

کابرایەک ژنێکی زۆر بەد خـولق و ناشـیـرینی بوو، بەڵام کـاتێ دەچۆ دەرەوە ئەوەندەی لیباسی جوان دەبەر دەکرد و خۆی دەڕازاندەوە، خەڵک کە چاویان پێی دەکەوت بەیەکتریان نیشان دەدا. ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی زستان کۆمەڵێک لە خەڵکی دێیەکەیان لەبەر هەتاو خۆیان هەڵخستبوو، قسەیان دەکرد و سەبیلەیان دەکێشا و مێردی ژنەکەشیان لەگەڵ بوو. لەوکاتەدا ئافرەتەکە خۆی ڕازاندبۆوە و بەوێدا تێپەڕی. خەڵکەکە نەیاندەزانی کە ئەوە ژنی ئەو پیاوەیە، هەموویان تەماشایان دەکرد و بە یەکتریان نیشان دەدا و دەیانگوت: خۆزگە بەحاڵی ئەو کەسەی کە ئەو ژنەی دەماڵێ دایە. کابرا گوێی لە قسەی خەڵکەکە بوو بانگی ژنەکەی کرد. هات و مێردەکەی چارشێوەکەی لەسەر هەڵدایەوە و گوتی: خەڵکینە تەماشای بکەن لە بنەوە منی کوشتووە و لە دەرەوەشڕا ئێوە. خەڵکەکە زۆریان بەلاوە سەیر بوو، چونکە زۆر ناشیرین بوو.

*****

ڕۆژێک کابرایەکی فەقیر بە ژنەکەی دەڵێ: ئافرەت ئەمساڵ هیچمان نیە، با دیارییەک بۆ مام کوێخا بەرم بەڵکو پارە یان شتێکمان بداتێ. ژنەکەی دەڵێ: زۆرباشە، چەوەندەرانی بۆ بەرە. پیاوەکە دەڵێ: نا ئافرەت پیواز باشترە. خولاسە کابرا (پێپێچێک) پڕ دەکا لە پیواز و دەچێ بۆ ماڵی کوێخا. کوێخا کە دەزانێ کابرا پیوازی بەدیاری بۆ هێناوە زۆر نارەحەت دەبێ و دەستور دەدا هەموو پیوازەکانی بە سەر و گوێلاکی دادەن. پیاوی کوێخا دەستی کرد بە پیواز پێدادانی و پیاوەکە کە پیوازەکانی لێ دەکەوت، دەیگوت: چەوەندەر تا پیواز، خوایە زۆر شوکر. پیاوی کوێخا دەڵێ: ئەرێ کابرا ئەوە دەڵێی چی، کوا ئەوە جێی شوکرانەیە؟ کابرای فەقیر دەڵێ: ئەتۆ نازانی، ئەرێ وەڵڵا زۆر جێی شوکرانەیە، چونکە ئەگەر لەجیاتی پیواز بەقسەی ژنەکەم چەوەندەرم هێنابایە ئێستا هەر مردبووم.

*****

ڕۆژێک مێرولەیەکی گەورە دەچێ بۆلای مێرووێکی بچووک و دەڵێ هاتووم هێندێکم ئارد بەقەرز بدەیتێ، تا گەنم پێدەگا و ئەوکاتە دەتدەمەوە. مێروە چووکەکە دەڵێ: وەرە وەپێشم کەوە تا بچین بتدەمێ. مێروە گەورەکە وەپێش دەکەوێ و ئەویش لە دوایەوە دەڕوا. مێروە چووکە تەماشا دەکا مێروە گەورەکە زۆری لێ دوور کەوتۆتەوە

له ڕۆیندا. بانگی دەکا و دەڵێ: ئێستا ئاردەکەم بەقەرز نەداوێیی ناتگەمێ، وای بەو
ڕۆژەی کە قەرزدارم بی، ئەوکاتە چۆنت دەگەمێ، گەڕایەوە و ئاردەکەی نەدایە.

*****

باوکێک وەسیەتی بۆ کوڕەکەی کرد و گوتی: ڕۆڵە وەسیەت بێ ئەو سێ کارە بکە.
یەکەم قەت ڕازی دڵی خۆت بە ژنەکەت مەڵێ. دووەم لەگەڵ تازە دەوڵەمەندان سەودا
و مامەڵە مەکە. سێیەم مەبە بە هاوڕێی پیاوی بێعەقل. کاتێ کوڕە باوکی مرد،
ویستی بزانێ بۆچی باوکی ئەو وەسیەتەی کردووە؟ ژنی هێنا و قەرزی لەگەڵ پیاوی
تازە دەوڵەمەند کرد و بوو بە هاوڕێی پیاوی بێعەقل. ڕۆژێک ژنەکەی چووە دەرێ،
کوڕەکە فەوری مەڕێکی سەر بڕی و خوێنەکەی بلاو بۆوە و کەلاکەکەی لە چاڵێکدا
شاردەوە. کاتێ ژنەکەی هاتەوە گوتی: پیاوەکە ئەو خوێنە چیە؟ مێردەکەی گوتی:
ئافرەت لەسەرەخۆ قسەبکە. پیاوێکی دوژمنم کوشتووە، قسە بکەی و خەڵک بزانێ،
تۆش وەک ئەو سەر دەبڕم، چونکە جیا لە من و تۆ کەس بەو ڕازە نازانێ، ئەگەر
یەکێک بزانێ مانای وایە تۆ باست کردووە. کە پیاوەکە چووە دەرەوە ژنەکەی لای
ژنی گەڕەک گوتی: قسەی خۆمان بێ پیاوەکەم زەلامێکی کوشتووە و خەریک بوو
منیش سەر بڕێ. خەڵکی ئاوایی هاتنە مالیان و کوێخاکەیان هەرچەند زۆر دۆستی
کابرا بوو لە هەموان خەراپتر، بەپەلە کابرای گرت و بردی بۆلای قازی. لە ڕێگادا
تووشی تازە دەوڵەمەندەکە بوو، کە بە ڕووداوەکەی زانی ئێخەی کابرای گرت و
گوتی: پارەکەم بدەوە، چونکە لەوانەیە تۆ بکوژن و پارەکەی من تێدابچێ. جا کابرا
بەسەرهاتەکەی بۆ قازی و خەڵکەکە گێڕایەوە و ڕزگاری بوو.

*****

دەڵێن: لە زەمانی حەزرەتی نووح دا دروودی خوای لێ بێ بە ئەمری خوا قەرار
بوو تۆفان هەستێ. حەزرەتی نووح کەشتی یەکی گەورەی دروست کرد و لەهەر نێر
و مێ یەک جوتێکی تێ هاویشت و فەرمووی: نابێ لە ناو کەشتیدا هیچ نێرو مێ
یەک لێک نزیک وەبن، دەنا کەشتی یەکە غەرق دەبێ.
ڕۆژێک لەناکاو کەشتی کەوتە لارە لار و جۆلانەوە، ئەوانەی لە ناویدا بوون
گوتیان: وادیارە نێر و مێ یەک لە یەکتر نزیک بوونەتەوە و شکیان چووە سەر
دەروێشێک)و ژنەکەی. دەروێش هەرچەند پاڕایەوە و سوێندی خوارد، کە ئەو نیە،
باوەڕیان پێ نەکرد. هەتا شەودا هات و دەروێش کێشکی لە خەڵکەکە گرت.
تەماشای کرد دوو سەگی نێر و مێ پێکەوە جووت بوون. دەروێش بیورێکی دەست
دایە و سەگە نێرەکەی کوشت، دوای ماوەیەک سەگە مێیەکە ترەکی. ڕۆژێک

تولەکانی گوتیان: دایە ئەوە ئێمە باوکمان نیە؟ دایکیان گوتی: باوکتان هەبوو، بەڵام دەرویش بە بیور کوشتی. تولەکان گوتیان: ئەی باوکمان وەسیەتی نەکردووە؟ دایکیان گوتی: بەڵێ وەسیەتی کرد و گوتی بە بەچکەکانم بڵێ: لەهەر جێیەک دەرویشیان دی تۆڵەی خوێنی منی لێ بکەنەوە. جا ئێستا بەهۆی ئەو وەسیەتەوەیە کە دەرویش بەهەر جێیەکدا بڕوا سەگ پەلاماری دەدەن.

*****

منداڵێک میزەچرکێی لەگەڵ بوو، هەموو شەو لەخۆی دەمیزت. ڕۆژێک دایکی گوتی: ڕۆڵە تۆ گەورە بووی، تاکەی من دەرپێی میزاوی تۆ وەشۆم ؟ کوڕە کە هیچ چارەی نەبوو گوتی: دایە چ بڵێم، خۆ بەدەست خۆم نیە، هەموو شەوێ شەیتان بەسەهووم دەبا و لە کۆڵم نابێتەوە. دایکی گوتی: ئەم شەو کە شەیتان هات لە زمان منەوە پێی بڵێ: تۆ هەر دە توانی زەرەرمان لێ بدەی؟ ئەگەر ڕاست دەکەی سابوونیشم بدەیە تا دایکم دەرپێکەمی پێ بشوا. کوڕە ئەو قسەی لە یادبوو هەتا نووست، لە خەودا بینی لەگەڵ شەیتان لەسەر ئاوێک بوون و شەیتان گوتی: وەرە بامەلە بکەین، کوڕە لە وەڵامدا گوتی: ناتوانم مەلە بکەم. نازانم. شەیتان گوتی: دەبا میزی تێکەین. کوڕەکە قسەکەی دایکی وەبیر هاتەوە و داوای سابوونی لێکرد. شەیتان گوتی: جا ئەوە زۆر ئاسانە، خەفەتی ناوێ، وەرە چەندت سابوون دەوێ بۆ دایکتی بەرەوە. دەستی کوڕەکەی گرت و بردی لە سەربانی دوکانی بەقاڵێک بە گوریس دایهێشتە خوار و گوتی: تا دەتوانی سابوون هەڵگرە. لەوکاتەدا بەقاڵ لە دوکانەکەدا نووستبو، وەخەبەر هات و زانی دز هاتۆتە سەری. پەلاماری دا، کوڕەکە هاواری کرد و داوای یارمەتی لە شەیتان کرد. شەیتان زوو بە گوریسەکە هەڵی کێشایەوە و گوتی: زووکە بەسەر بەقاڵی دا هەڵەڕی خێراکە، کوڕە لەترسان لەخۆی ڕی، کە وەخەبەر هات، تەماشای کرد کار لە کار ترازاوە، لە شەوەکانی تری خەراپتر بەسەر هاتووە. کاتێ دایکی ئاوای دی گوتی: دەک ڕاست نەبیەوە، خۆ سەرەڕای میز، ئەم شەو لە خۆشتریوە. کوڕە گوتی: دایە بەخوا ئەوەیان خەتای ئامۆژگاریەکەی تۆ بوو.

*****

جارێک پیاوێکی لوڕستانی دەچێ بۆ شار و چاوی بە هەنجیرە ڕەشە دەکەوێ، هێندێکان دەکڕێ و دەیانخوا، زۆری پێخۆش دەبن. ساڵی دوایی دوبارە ڕێگای دەکەوێتەوە ئەو شارە، هێندێک هەڵوجە ڕەشە دەکڕێ و دەیانخوا، تەماشا دەکا وەک ئەوانی پار شیرین نین. ترش و مەزەدارن. ساڵی سێیەم دێتەوە چاوی بە

باینجانەڕەشە دەکەوی و وەدەزانی هەر هەنجیرن گەورە بوون، یەک دوانێک دەکڕێ و دەیانخـــوا، زۆر تـاڵ دەبن، تووڕە دەبێ و بەزمـــانی لوڕی دەڵێ: (گـــەبتـــەرئەوا گیتەرئەوا ) یانی هەنجیری سەگباب، هەتا گەورەتر دەبێ تاڵتر دەبێ.

*****

کابرایەک چۆ مەزرایەک بۆ کاڵەک دزین. تەلیسێکی لێ پڕ کـردن و خـەریک بوو زارکی تەلیسەکەی ببەستی، خاوەن مەزرا گەیشتە سەری و گوتی: ئەوە لێرە چ دەکەی؟ دزە بەترسەوە گوتی: واللاهی بە ڕێگادا دەڕۆیشتم بایەکی زۆر توندی هەڵکرد و هەڵی دامە ناو ئەو بێستانەوە. کابرای خاوەن بێستان گوتی: دەی باشە، ئەی کێ ئەو کـاڵەکـانەی لێکردوونەوە؟ دزە گـوتی: کـە با و تۆفـانەکـە دەیانویست هەڵمگرن دەستم تێگرتن و بە دەستمەوە هاتن. خاوەن بێستانەکە گوتی: ئەی باشە کێ خستنیە ناو تەلیسەکەوە؟ دزە تۆزێک ڕاما و گوتی: ئاخر منیش هەر سەرم لەوە سوڕماوە بۆیە هەرلەو فکرەدا بووم تابزانم .

*****

کابرایەکی جووتبەندە هەمبانەیەک گەنم و جووتە گایەکی برد و چوو دەستی کرد بە تۆو چاندن و جـووت کـردن. لەوکـاتـەدا سـوالکەرێکی لێ پەیدابوو. دوای خـوا بەقەوەتە دەستی کرد بە دوعا کردن بۆ جووتیارەکە و گوتی: خوا بەرەکەت بخاتە جووتەکەتەوە مستێکم گەنم دەیە لەلای خوا ون نابێ.

کـابرای جـووتیـار لە وەڵامدا گـوتی: بابە ئەو گـەنمە بەو زەحـمـەتە دەچێندرێ و حەوت هەشت مـانگ ئاو وەخوا و ئەو سەرما و گەرمایە بچێژین و مـاڵ و منداڵ و ئاغا و کوێخـا و مـەلا و فەقێ و شوان و مـجێور و باڵندە و حـەشەرات لێی دەخۆن. ئێمە مـانان کارگەرین. تۆ بۆ ناچی کارێک بکەی، زۆر لە گەدایی باشـترە. ئێنجا ئەوەش بزانە، کە ئەو گەنمە هی تۆوە و ماڵی خاوەن مڵکە و من خیانەتی پێ ناکەم، بێ بەرەکـەت دەبێ. گـەداکـە ڕازی بوو و گـوتی: باشـە، بەڵام لە دوورەوە هـاتووم با تۆزێک لەبن ئەو دارە وەحەسێم، تورەکەی سوالکردنەکەی دانا و پاڵی دایەوە و لێی نووسـت. جـووتیـارەکـەش درێژەی بە جـووتکردن دا، تا کـارەکـەی تەواوکـرد و جـووتەکـەی بەردا، بچن ئاو وەخـۆن و بلەوەڕێن و بۆ خـۆشی چوو لە کـۆشـەیەک دانیشت وەحەسێ.

یەکێک لە گایەکان چوو خـۆی گەیاندە هەمبـانەی گەداکە و بەدەمیەوە گرت و ڕایوەشاند. تا گەدا و جووتیار پێیان زانی نانی گەداکەی خوارد. جووتیارەکە چوو دەسـتی کرد بە لێدانی گـایەکەی. گـەداکە گوتی: بابە لێی مەدە، نەت بیسـتوو

گوتویانه: فەقیر چ نانی بخۆی و چ نانی بدەیتێ هەروەک یەکە. گایەکە ڕایکرد بەر دەستی خاوەنەکەیدا و کابرا لەداخان لەسەری خۆی ڕادەکێشا. گەداکە گوتی: بابە من دەنگ ناکەم تۆ بۆ ئاوا دەکەی؟ وەرە لە من بدە، گوتی: وای بەحاڵی ئەو حەیوانە بەستەزمانە کە لە داوی تۆ کەوتووە، تۆ کە ڕازی نابی گایەک نانی یەکی دی بخوا، چۆن ڕازی دەبی ژن و منداڵەکانت نانی تۆ بخۆن؟ کابرای جووتیار گوتی: ڕاست دەکەی بەڵام وانیە، تۆ دەچێ بۆ ئاوایی و دەست دەکەیەوە بە گەدایی و نان پەیداکردن، بەڵام گایەکەی من نانی گەدایی خوارد تازە بە کاری کاسبی نایەتەوە.

*****

دەڵێن: دەروێشێکی وەک سەید مەجیدی سەردەشتێ هەموو ڕۆژی جوومعان بە بازاڕ و کوچاندا دەگەڕا و دەفەی لێدەدا و بە فارسی دەیگوت:

هەرچە کنی باخود کنی      گر همە نیک و بد کنی

یانی هەرچی لە دنیادا دەیکەی لەگەڵ خۆتی دەکەی. جا کردەوەکەت چاک بێ، یان خەراپ. ژنێکی مەکرباز گوتی: چارەی ئەو دەروێشە دەکەم، ئەوە چیە دەیڵێ؟ لە ماڵەوە کولیچەی دروست کرد و ژاری ماری بەسەردا ڕژاند و بۆ دەروێشی برد و بە دراوسێکانی گوت: ئەمن بەو دەروێشەی دەسەلمێنم کە ئەوەی ئەو دەیڵێ وانیە. (ئەز قەزا) ئەو ئافرەتە کوڕێکی حەوت ساڵانەی ون ببوو، ئەو ڕۆژە هاتەوە و لە ڕێگادا تووشی دەروێشەکە بوو. سڵاوی لێکرد و گوتی: مامە دەروێش لە دورەوە هاتووم، زۆرم برسیە. دەروێش فەوری کولیچەی بۆ دەرهێنا و دای بە کوڕە و خواردی. کوڕە بە خواردنی تێکچو و گوتی: ئەرێ دەروێش ئەوە چ بوو دات بەمن؟ دەروێش گوتی: ئەوە ئافرەتێک بەخێرا خۆی دانی بەمن. دەرۆێش چوو ئەو خەبەرەی دا بە ئافرەتەکە. ئەو بە غاردان هات، تەماشای کرد ئەوە کوڕەکەی خۆیەتی، دەستی کرد بە لەخۆدان و گوتنی دەروێشی دووپات کردەوە کە دەیگوت: هەرچە کنی با خود کنی- گر همە نیک و بد کنی. ئینجا دەیگوت: ئەی خاک بە سەرم ئەوەی کردم لەگەڵ خۆم کرد.

*****

کابرایەک ژنێکی زۆر خوڵق ناخۆشی دەبێ و لەسەرهەموو شتێک دەیکا بە (قڕە) لەگەڵ مێردەکەیدا. کابرا زۆری لێ وەڕەز دەبێ، ژنە بە (فاتە قڕقڕە) ناوبانگ دەر دەکا. پیاوەکە بۆ لەناو بردنی فەڕشێک دەبا لەسەر بیرەئاوێکی ڕادەخا و دێتەوە بە ژنەکەی دەڵێ: ئافرەت ئەمڕۆ زۆرم ئارەزو لە گەڕانە، هەستەبچین سەیاحەتێک

بکەین. ژنە دەڵێ: زۆرباشە. دەڕۆن تا دەگەنە لای فەڕشەکە و بە ژنەکەی دەڵێ: بەخوا شتی چاکە وەرە تاوێک لەسەر ئەو فەڕشە وەحەسێ. ژنە دەچێ پێ دەخاتە سەر فەڕشەکە و دەکەوێتە ناو بیرەکەوە و کابرا دەگەڕێتەوە. دوای چەندڕۆژان کابرا دەڵێ: بابچم بزانم چی لێ بەسەرهاتووە؟ کاتێ دەچێ گوێ هەڵدەخا، مارێک هاوار دەکا و دەڵێ: ئەی ئادەمیزاد مەرد بە و لە دەست قرەقرِی ئەو ئافرەتە ڕزگارم بکە پارەیەکی باشت دەدەمێ. کابرا دەچێ گوریسێک و سەتڵێک دێنی و دای دێڵێتە ناو بیرەکە و مارەکە دەچێتە ناویەوە و هەڵی دەکێشێتە دەر. مارە دەڵێ: کاکە خۆت دەزانی کە من پارەم نیە، بەڵام سەبر بگرە دەچم لە گەردنی کچی حاکمی شار دالێم کە هاتی بەقسەی تۆ لێی دەبمەوە و پارەیەکی باشیان لێ وەرگرە. کابرا ڕازی دەبێ و دەڵێ زۆر باشە. لە خورپەی خەودا مار دەچێ لە ملی کچی حاکم دالێ و کەس ناوێرێ بەلایەوە بچێ، تا کابرا دەچێ و دەڵێ: ئەگەر سەد تمەنم بدەنێ من ڕزگاری دەکەم. دەڵێن زۆر باشە. کابرا دەچێ دەڵێ: ئەی مار لە گەردنی کچی حاکم وەبە. مارەکە دەڵێ زۆرباشە، بەڵام دەبێ ئیتر کارت بەسەر منەوە نەبێ. مار لە گەردنی کچی حاکم دەبێتەوە و دەڕوا و دەچێ لە شارێکی دی لە ملی کچی حاکمی ئەو شارەش دالێ، دوبارە کەس ناوێرێ بەلایەوە بچێ تا دەچن مێردی فاتە قرقرِ دێنن. مارەکە دەڵێ، نەمگوت کارت پێم نەبێ، بۆچی هاتیەوە؟ کابرا دەڵێ: هاتم پێتراگەیەنم کە فاتمی ژنم دەیەوێ بێ بۆ ئێرە. مار کە گوێی لە ناوی فاتە بوو بەپەلە لە گەردنی کچی حاکم بۆوە و کەس نەیزانی بۆ کوێ چوو. خەڵکەکە زۆریان پێ سەیر بوو تا کابرا بەسەرهاتی خۆی و ژنەکەی و مارەکەی بۆ گێڕانەوە و ئەوەندەی دیکە سەریان سوڕما.

*****

دەڵێن: جارێک پاشایەک بە وەزیرەکەی دەڵێ: وەزیر شار بە شار و دێ بە دێ بگەڕێ، پیاوێکی قسە خۆشی زیرەکم بۆ پەیدا بکە، یەک دوو پرسیاری لێ دەکەم. وەزیر زۆر دەگەڕێ هەتا ڕێی دەکەوێتە قوتابخانەی مەلایەک. تەماشا دەکا چەند قوتابی بە دەورە بە چۆکدا هاتوون و سەریان بەرداوەتەوە و تەماشای بەر دەمی خۆیان دەکەن و دەخوێنن. وەزیر سڵاویان لێ دەکا و دادەنیشی. کە دەڕوانی دارێکی درێژ لە پاش ملیانەوە ڕاهەنگێراوە. وەزیر لە مەلا دەپرسێ: مامۆستا ئەو دارە چیە؟ مامۆستا دەڵێ: ئەوە بۆ ئەوەیە کە ئەگەر یەکێ لە قوتابیەکان سەری لە سەر دەرسەکەی هەڵگرت پێ بزانم، دەبێ تا لە دەرس دەبنەوە ئاوا بێ. وەزیر کە سەر بەرز دەکاتەوە دەبینێ پەتکێک لەسەر بانێکەوە هاتۆتە خواری بۆلای

مامۆستا، وەزیر گوتی: ئەی ئەو پەتکە چیە؟ مامۆستا گوتی: هەرزنمان لە سەربانی هەڵخستووە و زەنگوڵەیەکم بەو پەتەوە هەڵاوەسیوە، جارجار ڕایدەوەشێنم و چوێلەکەی پێ لە هەرزنەکە دەر دەکەم. وەزیر کە ڕوانی پشیلەیەک لە هەیوانی بەستراوەتەوە و سەری بەنەکە لای شاقەلی مەلایە، گوتی ئەی ئەوە بۆوایە؟ مامۆستا گوتی کە ئیشم بەماڵ و منداڵ بوو، ئەو بەنە ڕایدەکێشم و پشیلەکە دەمیاوێنی و لە ماڵەوە حاڵی دەبن کە کارم پێن و دێن بۆلام. وەزیر گوتی: مامۆستا پاشا منی بۆلای جەنابت ناردووە هەستە بچین بۆلای. مەلا گوتی فەرموو. کاتێ چوونە لای پاشا و سڵاویان کرد، پاشا گوتی: مامۆستا ناوت چیە؟ گوتی قوربان ناوم (نیومەن بوقە). پاشا گوتی کوڕی کێی: گوتی: کوڕی (پەشم پازدە)م. پاشا گوتی: ئەوە چ ناوێکە؟ مەلا گوتی: قوربان لە ئەسڵدا خۆم ناوم (منصور)ە، بیرم کردەوە کە مەنسور دوو بەشە (مەن) و (صور). گوتم:(مەن)ێک نیم نیو(مەنم) و (صور) نیم کە (شەیپور)ێکی بچووکە و بومە(نیوبوق) و باوکیشم ناوی (موسی)یە. گوتم باوکم (مو) نیە، (پەشم)ە و (سی) نیە و ( پازدە)یە. پاشا زۆری بەلاوە سەیر بوو گوتی:

مامۆستا چەند ئەستێرە بە ئاسمانەوەن؟ مەلا گوتی: بەقەد تووکی سەرو بە دەنی ئینسان. پاشا گوتی: وانیە درۆیە. مەلا گوتی: دە ئەگەر باوەڕ ناکەی بیانژمێرە. پاشا گوتی: ئەی لە ئەرزەوە تا ئاسمان چەند ساڵ ڕێگایە؟ مەلا گوتی: بە ئەندازەی گەڕان بە دەوری دنیادا. جا ئەگەر ئەوەشت پێ ڕاست نیە، تاقی کەوە. پاشا ئافەرینی کرد و مەلای خەڵات کرد.

*****

دەڵێن: پیاوێک ژنی گوازتەوە و بردی سواری قەتار بوون و ڕۆیشتن بۆ (شەهرو لعەسەل). کابرا کتێبی پێ بوو لەناو قەتارەکەدا دەستی کرد بە موتالەعە. زۆری پێنەچوو(جابی) قەتارەکە هات داوای (بیطاقە)ی لێکرد. زاوا گورج دەستی دەگێرفانێ ناو زەرقێکی دەرهێنا و دای بە کابرای جابی. کابرا کە تەماشای کرد وەرەقەی مارەکردنی ژنەکەی بوو. جابیەکە لەسەرەخۆ گوتی: کاکە بەو وەرەقە لێرە سوارنابی، لە ماڵەوە پێی سوار دەبی. زاوا زۆر خەجاڵەت بۆوە کە بەسەهو ئەوەی داوەتێ.

*****

کورد دەڵێ: نەقڵی کفر ، کفر نیە. لەو ساڵانەی دواییدا کابرایەکی عێراقی دەچێ بۆ حەج. کابرا دەستی ڕاست و لاقی چەپ و چاوێکی نابێ. دەچێ بۆ ڕەجمی

شـەیتـان، هەرچەند دەکـا بەدەسـتی چەپ بەردەکان ناگەنە ناو ئەو جێگایەی تـە بەردەکانی بۆ هەڵدەن. حاجی لە ڕەجمی شەیتان دەبنەوە، ئەو هەرخـەریک دەبێ. ئاخری شەیتان تورە دەبێ و دێ دەڵێ. ئەرێ کاکە ئەوە هەرخەلاس نەبووی؟ ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟ حـاجی لە وەڵامـدا دەڵێ: جـا بڵێم چی؟ دەسـتی ڕاسـتم لە شـەڕی عێراق و ئێراندا پەڕیوە و لاقی چەپم لە شەڕی کوردستاندا بە (ئەلغام) پەڕیوە و بە قەزا و قەدەری خـواش کوێر بووم. شـەیتـان دەڵێ: دەی ماڵ نەوێران چکارت بەسەر منەوەیە، بۆ ناچی ئەوانە ڕەجم بکەی کە بەو دەردەیان بردووی.

*****

ڕۆژێک شـاعـیرێک قـەسیدەیەک لە مـەدحی حـەزرەتی حـەسـەنی کوڕی حـەزرەتی عـەلی دادەنێ و دەچێ بۆی دەخـوێنێـتـەوە. حـەزرەتی حـەسـەن پارەیەکی باشی دەداتێ. خەڵک دەڵێن ئەرێ قوربان ئەو پارە زۆرەت بۆ دایە؟ خۆ ئەو شاعیرە زۆر بێ ئەمری خوا دەکا و بەقسەی شەیتان هەزار درۆ لە شیعرەکانیدا دەڵێ. حەزرەتی حـەسـەن دەفـەرمـووێ: ئەی ئێـوە نازانن کە باشـترین پارە و مـاڵی دنیـا ئەوەیە کە شەرەف و ناموسی خۆتی پێ بپارێزی؟ ئەگەر ڕازیم نەکردایە، دەهۆنی بۆ لێدەدام و لای خـەڵک دەیگوت هـیـچی وەک باب و باپیـری خـۆی ناچێ و ئەو قـسـەیان لە کتێباندا دەنوسییەوە و دەبوو بە ماڵ بە سەرمەوە تا ڕۆژی قیامەت.

*****

هەر لەو بابەتە کابرایەک بە لۆتیە ڕەشە ناویان دەبرد. هات بۆ گوندی (شلماش و لە سـەربانی مـاڵی حـاجی وەهاب (سـیـحـر)ی دەکـردن و ورچ و مـەیمون هەڵدەپەڕاندن و خـەڵک پارەیان دەدایە. باوکم کە باش مەلای ئەو ناوچە بوو، لەپێش خەڵکدا پارەی بۆ دەنارد. ڕۆژێک گوتیان: مامۆستا ئەوە چۆنە جەنابت پارە دەدە بەو لۆتی یە؟ لە وەڵامـدا گـوتی: لەبەر حـەیا و ئابڕووی خـۆم. ئەی ئـەوە نیە جنێو بە مەلا و کوێخـای فلان دێ دەدا، چونکە هیچیان نەداوەتێ!

*****

لە باسی زەکـاوەت وزیرەکی (ئەبو عـەلای مـەعـەڕی)دا دەڵێن: ئەوەندە زیرەک بووە، جارێک بۆ تاقیکردنەوەی، چوار درهەم دەخەنە ژێر چوار پێچکەی کورسییە کە ئـەو لەسـەری دادەنیـشت، کاتێ دەچێ لـەسەری دانیـشی فـەوری دەڵێ: کوڕێ ئەوە عەرزە کەمێک بەرز بۆتەوە یان ئاسمان تۆزێک نزم بۆتەوە و هاتۆتە خوارێ؟

*****

دوبارە دەڵێن: ئەوەندە بەزەین بووە کاتێ لە وڵاتی شامەوە بە سواری وشتر چۆ

بەغدا، لە ڕێگادا لە جێگایەک پێی دەڵێن: سەرت دانەوێنە با سەرت لە لەقی ئەو دارە نەکەوێ. چونکە (ئەبو عەلا) کوێر بووە. دوای ماوەیەکی زۆر کە دەگەڕێتەوە لە ئاستی جێگای دارەکە سەر دادەنەوێنێ، ئەوانەی لەگەڵی دەبن زۆریان بەلاوە سەیر دەبێ، دەڵێن: ئەوە بۆ سەرت دانەواند؟ لە وەڵامدا دەڵێ: ئاخر کاتێ بێرەدا هاتم دارێکی لێ بوو گوتم با سەرم وێی نەکەوێ. گوتیان کوا خۆ داری لێ نیە؟ کاتێ بۆ تەجرەبە هەڵیانکەند بنکی دارەکە دەرکەوت کە بڕی بویان.

*****

(ئەبو دولامەی) شاعیری زەمانی عەباسییەکان زۆر ناشیرین دەبێ و ژنێکی زۆرناشیرینیشی دەبێ. جارێک لە کاتێکدا کە(خەیزەران)ی ژنی (مەهدی) خەلیفەی عەباسی خۆی ئامادە دەکا بچی بۆ حەج. ئەبو دولامە دەچێتە سەر ڕێگای و دەڵێ: ژنەکەم پەکی کەوتووە، ناتوانێ خزمەتم بکا، دەبێ لە جارییەکانت، جارییەکم بدەیتێ. خەیزەران دەڵێ باشە، بەڵام دوای گەڕانەوەم. کاتێ لە حەج دەگەڕێتەوە ئەبو دولامە قەسیدەیەکی زۆر جوانی بۆ دەنوسێ و بۆی دەنێرێ. خەیزەران کە دەیخوێنێتەوە زۆر پێدەکەنێ و بە پیاوێکی دا جارییەکەی بۆ دەنێرێ. لەوکاتەدا ئەبو دولامە لە ماڵ نابێ. ژنەکەی ئەبو دولامە بە کوڕەکەی دەڵێ: ئەگەر دەتەوێ منت لێ ڕازی بم و خواشت لێ ڕازی بێ، بچۆ لەگەڵ ئەو جارییە بنوو، دەنا گەردنت ئازاد ناکەم. کوڕەکە بەقسەی دایکی دەکا و دەچێ کاری وای لەگەڵ دەکا. کاتێ ئەبو دولامە خەبەر دەزانێ کە خەیزەران جاریەی بۆ ناردووە، بەپەلە دێتەوە و دەچێ بۆ لای و دەستێکی بۆ دەبا. جاریەکە تووڕە دەبێ و دەڵێ: ئەی پیری بەدفەڕی بێ ئەخلاق، هەستە وەدەرکەوە دەنا مستێکت لێ دەدەم و لوتت پڕ دەکەم لە خوێن، خۆ منیان بۆ تۆ نەناردووە، بۆ کوڕێکی گەنجی لەو حاڵە و لەو ڕەنگەیان ناردووم. سەعاتێک لەمەوبەر هات بۆلام و کاری وای لەگەڵ کردم. ئەبو دولامە دەزانێ کە ئەوە کوڕەکەی خۆی بووە. هەڵدەستێ دەچێ بۆلای مەهدی خەلیفە و ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. خەلیفە زۆر پێدەکەنێ و دەنێرێ بەدوای کوڕەکەیدا. کاتێ کوڕە دێ، خەلیفە زۆری لێ تووڕە دەبێ، دەڵێ: بێنن دارکاری بکەن. کوڕە دەڵێ: قوربان ئەوە چل ساڵە باوکم لەگەڵ دایکمدا کاری وا دەکا ئەمن دەنگ ناکەم و پێم ناخۆش نیە، کەچی من جارێکم جارییەکەی وا لێکردووە، ئەو خۆی ڕانەگرت و هاتووە شکایەتی لێکردووم! مەهدی ئەوەندە پێدەکەنی بە سەرپشتدا دەکەوێ و لەپاشان بە ئەبو دولامە دەڵێ دەنگ مەکە، جارییەکی دیکەت بۆ دەنێرم. ئەبو دولامە گوتی: قوربان جا مەگەر لە بەینی عەرز و ئاسماندا وەی شارم دەنا ئەو حەرامزادەیە خۆی دەگەیەنێتێ. خەلیفە

ئەوەندەی تر پێکەنی و ئینجا بە کوڕەکەی دەڵێ: جارێکی دی کاری وا بکەی خۆم دەزانم چیت لێ دەکەم.

*****

ڕۆژێک (ئەبودولامە) دەچێ بۆلای (مەهدی) باوکی (هارونەڕەشید) و دەست دەکا بە گریان و دەڵێ: قوربان لەگەڵ ژنەکەم وەکو دوو کۆتر لە هێلانەیەکدا زۆر بەخۆشی ژیانمان دەبردە سەر، بەلام بە ناشکوری نالێم مەرگ لێکی جیا کردینەوە و ئێستا بە تەنیا ژیان دەبەمە سەر، کە بەڕاستی ژیانی تەنیایی زۆر ناخۆشە و سەرەڕای ئەوەش هیچم نیە و ژیانم زۆرناخۆشە. مەهدی دڵخۆشی دەداتەوە و شتێکی دەداتێ. لەملاشەوە ژنەکەی دەچێ بۆلای خەیزەرانی خێزانی مەهدی دایکی هارونەڕەشید و بە گریانەوە دەڵێ ئەبو دولامە مردووە و بە تەنیا ماوەمەوە و هیچم دەماڵی دا نیە و نازانم لێرە بە دواوە چۆن ژیان بەرمە سەر و بەچ بژیم؟ ئەویش شتێکی دەداتێ. کاتێ مەهدی و خەیزەرانی خێزانی بە پیلانەکەیان دەزانن زۆر پێ پێدەکەنن.

*****

(ئەبو عەتاهیە) زۆر شاعیرێکی گەورە و بەناوبانگ بوو. بەلام دەڵێن زۆر بەخیل و ڕژد بووە. بۆ نموونە دەربارەی بەخیلیەکەی دەڵێن ڕۆژێک ئەمەو دراوسێکانی لە دەوری دەبن، لەوکاتەدا سوالکەرێک دێ داوای شتێکی لێ دەکا و ئەویش لە وەلامیدا دەڵێ خوا بتداتێ. تا سێ جار سوالکەرەکە لێی دووپات دەکاتەوە و ئەویش هەر دەڵێ خوا بتداتێ، ئاخر جار سوالکەرەکە دەڵێ: تۆ ئەو شاعیرە نی کە گوتوتە. (كُلُّ حَيٍّ عِنْدَ مَيْتَتِهِ حَظُّهُ مِنْ مالِهِ الْكَفَنُ) یانی هەر گیانلەبەرێکی زیندوو لە بەرەی ئادەمیزاد لەکاتی مردنیدا ئەوەندەی لە سەروەت و سامانەکەی پێ دەبڕێ کە بۆی بکەن بە کفن. دەڵێ بەڵێ ئەوە شیعری منە. سوالکەرەکە دەڵێ: بۆ ئەتۆ هەموو ماڵەکەت بۆ کڕینی کفنەکەت داناوە؟ ئەبو عەتاهیە دەڵێ: نەخێر . سوالکەرەکە دەڵێ: ئەی چەندت بۆ کفنەکەت داناوە؟ دەڵێ: پێنج درهەم. سوالکەرەکە دەڵێ: جا کەوایە وەک خۆت لە شیعرەکەتدا گوتوتە، بەشی تۆ لە هەموو سەروەتەکەتدا ئەو پێنج درهەمەیە. ئەبو عەتاهیە دەڵێ: بەڵێ. سوالکەرەکە دەڵێ: دە لە باقیەکەی شتێکم بدیە، ئەگەر هەر نامدەیتێ شتێکی دیکەم لەگەڵ بکە. ئەبو عەتاهیە دەڵێ چت لەگەڵ بکەم؟ کابرا دەڵێ: قەبر هەلکەنەکان بە سێ درهەم گۆڕ هەڵدەکەنن، تۆ ئێستا درهەمێکم بدیە کە مردی ئەمن قەبرەکەت بۆ هەڵدەکەنم و لە ئێستاوە تۆ لە گۆڕەکەشت دوو درهەم قازانج دەکەی. ئەبو عەتاهیە زۆر

خەجاڵەت دەبێ و دەڵێ: دە برۆ خوا غەزەبت لێگرێ، ئاخر لەبەر دوو سواڵکەری وەک تۆ سەدەقە و خێریش حەرام بووە. خەڵکەکە دەست دەکەن بە پێکەنین و دەڵێن جا کوا سەدەقە و خێر کردن حەرام کراوە؟

*****

(خواجە نەصیرالدینی طوسی) ئاخوندێکی زۆر زانای شیعە بووە. خۆی لە (هۆلاکۆ) خانی مەغول نزیک دەکاتەوە و دەبێ بە وەزیری. یەکێک لۆمەی دەکا و نامەیەکی بۆ دەنوسی و دەڵێ: تۆ خۆت کردووە بە سەگی هۆلاکۆ. ئەویش لە وەڵامدا بۆی دەنوسیتەوە و دەڵێ: بە چوار بەڵگە پێت دەسەلمێنم کەوا نیە. یەکەم سەگ لە دەرەوەی ماڵ دەژی ئەمن لە ژورەوە. دووەم سەگ بەرماوی خاوەنەکەی دەخوا، ئەمن سەرگوڵەکەی. سێیەم سەگ تووکنە و من بێ تووک. چوارەم سەگ نانی هەر کەسێک بخوا پاسی ئەو کەسە دەکا، بەڵام من نانی خەڵک دەخۆم و پاسی هۆلاکۆ دەکەم.

*****

بۆ شۆخی و نووکتە دەڵێن: جارێک شێخ (نورالدین) ناوێک تووشی کابرایەک دەبێ، کە دوو ئافرەتی جوانی لەگەڵ دەبن. دوا سڵاو و وەڵام، شێخ بە کابرا دەڵێ: کاکە ناوت چیە؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان ناوم (عبدالواحد)ە. شێخ دەڵێ: دە کاکە ئەو دووانە بۆ من بەجێ هێڵە، چونکە ئەمن (عەبد)ی دووانم.

*****

جارێک لە (ئەبو عەتاهیە) دەپرسن و دەڵێن: لە ناو شیعرەکانتدا کامەت لە هەموان خۆشتر دەوێ؟ لە وەڵامدا دەڵێ: ئەو چوارخشتەکیە کە دەڵێم :

لَيْتَ شِعْرِي فَإِنَّنِي لَسْتُ أَدْرِي
أَيّ يَوْمٍ يَكُونُ آخِرَ عُمْرِي
وَ بِأَيِّ الْبِلادِ يُقْبَضُ رُوحِي
وَ بِأَيِّ الْبِقاعِ يُحْضَرُ قَبْرِي.

یانی زۆر بەداخەوە نازانم چ رۆژێک رۆژی ئاخری ژیانم دەبێ و لە چ وڵاتێک روحم دەکێشن و لەچ شوێنێک گۆرم بۆ حازردەکەن؟

*****

دوبارە ئەوچوار خشتەکیەی شێخ (محەمەد عەبدە)ش زۆرخۆشە کە دەڵێ:

إنْ يَمُوتُ مِنْ مَشايِخِ الدّينِ شَيْخُ
تَنْبُتَ وَرْدَةٌ مَكانَ الفَقيدِ

وَقياساً فَإنْ يموتوا جَميعاً
تَغدو ايرانَ جَنَّةً مِنْ وُرودِ
یانی ئەگەر یەکێک لە مەلا و ئاخوند و شێخەکان بمری، لە جێگای ئەو خوا لێخۆش بووە گوڵێک دەڕوێ. جا بەو قیاسە، ئەگەر هەموویان بمرن (ئێران) دەبێتە بەهەشتێکی پڕ لە گوڵ.

*****

هەروەها دەڵێن: جارێک لە مەجلیسی (ئەبو عەلی) فارسیدا باسی شیعر دەکەن. یەکێک عەرزی دەکا و دەڵێ: ئەرێ قوربان جەنابت قەت شیعرت گوتووە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: ئەو سێ شیعرە نەبێ نەمگوتووە کە دەڵێم :
خَضَبْتُ الشّيبَ لَمّا كانَ عَيْباً
وَخَضْبُ الشّيبِ أَوْلى أنْ يُعابا
وَلَمْ أخْضُبْ مَخافةَ هَجْرِخِلٍّ
وَلاعيباً خَشيتُ وَلا عِتابا
وَلكنَّ الْمَشيبَ بدا ذَميماً
فَصيّرْتُ الْخضابَ لهُ عِقابا)
یانی ئەمن مووە سپیەکانم (بۆیە) کردۆتەوە، چونکە دەڵێن: مووی سپی نیشانەی پیریە و عەیبە. هەرچەند باشتر وایە کە عەیبە لە (بۆیە) کردنەوە بگیرێ، لەترسی دۆستەکەشم (بۆیە)م نەکردۆتەوە، کە بڵێم: ئەگەر مووە سپیەکانم ببینێ لێم دور دەکەوێتەوە و نە لە عەیب و لۆمەش ترساوم، بەڵام پیری و مووی سپی ناشیرین هاتنە بەرچاوم و منیش بە ڕەنگ کردنی موویەکانی تۆڵەی خۆم لێکردنەوە.

*****

سەبارەت بە ئازایی و گەورەیی حەزرەتی عەلی، شێخ (تەنوحی) لە کتێبی (المستجاد)دا دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (دخ)ی لەسەر بێ ویستی کۆچ بکا و حەزرەتی عەلی چوو لە جێگاکەیدا بنوێ، خوای گەورە بە (جوبرائیل) و (میکائیل)ی گوت: ئێوەم کردە برای یەکتر، بەڵام بڕیارمداوە کە تەمەنی یەکتان درێژتر بێ، ئەو تەمەن درێژییە بۆ کامەتانی دا نێم؟ لە وەڵامدا هەردوو داوای تەمەنە درێژەکەیان کرد. خوای گەورە عیتابی لێگرتن و فەرمووی: ئەی بۆ وەک عەلی کوڕی ئەبوتالیب تان نەکرد. کاتێ لەگەڵ پێغەمبەردا کردمن بەبرا، عەلی گیانی خۆی فیدای کرد و ئەو ئەمشەو چووە لە جێگای ئەودا بنوێ، تا پێغەمبەر بەسەلامەتی کۆچ بکا. خوای گەورە فەرمووی: ئەم شەو بچن ئاگاتان لە عەلی بێ، هەتا دوژمن زەفەری پێ نەبەن

جوبرائیل و میکائیل هاتن بۆلای و له کاتێکدا که جوبرائیل لەلای سەری و میکائیل لەلای لاقانی وەستابوون، جوبرائیل دەیگوت: بەخ بەخ کێ وەکو تۆیە ئەی کوڕی ئەبو تالیب که خوای گەورە لەلای مەلائیکە تاریفت بکا. جا بە ڕیوایەتێک دەڵێن: ئەو ئایەتەی سوورەی (بەقەرە) لە وکاتەدا دەرحەق بە حەزرەتی عەلی هاتۆتە خوارەوە که دەفە رمووێ:

وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاةِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَؤُوفٌ بِالْعِبَادِ

یانی لەناو خەڵکدا جۆرە کەسانێک هەن وەک عەلی کوڕی ئەبوتالیب که ژیان و حەیاتی خۆیان بۆ وەدەست هێنانی ڕەزای خواوەندی گەورەی خۆیان دەفرۆشن. جا بەڕاستی برایەتی ڕاستەقینە ئاوا دەبێ، کە لەکاتی تەنگانەدا فریای دۆست و برادەری خۆت بکەوی، وەک حەزرەتی عەلی که ڕوحی خۆی فیدای حەزرەت کرد و چوو لە جێگاکەیدا نووست.

*****

پیاوێکی بەسرەیی دەڵێ: ئەمن دوو کوڕ و دوو کچ و ژنێک و ژمارە مریشکێکی زۆرم هەبوو. ڕۆژێک پیاوێکی (بەدوی) بوو بە میوانمان. بە ژنەکەم گوت: ئافرەت زوو مریشکێک سەر ببڕە با نیوەڕۆ بیخۆین. کاتێ نان دانرا، بە گاڵتە بە میوانەکەم گوت: ئەتۆ دەبێ مریشکەکە بەش بکەی. کابرا گوتی: باشە، بەڵام بە دابەشکردنی من ڕازی دەبن؟ گوتم بەڵێ. کابرا قۆڵی لێ هەڵماڵی و دەستی کرد بە بەشکردنی مریشکەکە. سەرەکەی لێکردەوە و گوتی: (ها) با سەرەکەی بۆتۆ بێ. چونکە ئەتۆ سەرەی ماڵەکەی. دوو باڵەکەشی دان بە دوو کوڕەکان و گوتی: با ئەو دوو باڵەش بۆ دوو باڵی ماڵەکە بن. دوو قاچەکانیشی دان بە دوو کچەکان و پشت قوونەکەشی دا بە ژنەکەم و سینگەکەشی هەڵگرت و گوتی: با ئەو پارچەش بۆ میوانەکەتان بێ. ڕۆژی دوایی بە ژنەکەم گوت: ئەمڕۆ پێنجان لێنێ. کاتێ نان دانرا گوتم: وەرە بەشیان بکە. کابرا گوتی: باشە تاق تاق بەشیان کەم یان جووت جووت؟ گوتم تاق تاق، گوتی دەباشە. بگرە تۆ و ژنەکەت و ئەو مریشکە تاقێک. یەکێکیشی دا بە دوو کوڕەکە و گوتی: ئەوەش تاقێک. یەکێکیشی دا بە دوو کچەکە و گوتی: ئەوەش تاقێک و دووشی بۆخۆی هەڵگرت و گوتی: ئەمەش تاقێک. ئێمە تەماشای یەکترمان دەکرد، گوتی: وا دیارە بەمجۆرە ڕازی نین. باجووت جووت بەشیان کەم. گوتمان باشە. گوتی هانێ، ئەوە تۆ و دوو کوڕ و مریشکێک ئەوە دوو جووت. ژنەکەت و دوو کچەکان و ئەو مریشکەش ئەوە دوو جووتی تر و من و ئەو سێ مریشکەش ئەوە دوو جووت. ڕووی کردە ئاسما ن و گوتی: خوایە زۆر شوکر، چونکە تۆ فێری ئەو

دابەشکردنەت کردم.

*****

دەڵێن: عەرەبێک لەبەر خوا دەپاڕایەوە و دەیگوت: ئەی خوای گەورە تۆ زۆرحەقت بەسەر منەوە هەیە، تکات لێ دەکەم ئەو حەقانەم پێ ببەخشە. ئەی خوای گەورە بەخوای حەقی خەڵکیشم زۆر لە سەرە، تو خوا بەگەورەیی خۆت ئەوانیشم بۆ بدەوە. ئەی خوای گەورە بۆ هەموو میوانێک شتێکت واجب کردووە، ئەم شەو میوانی تۆم بەهەشتم بە نسیبکە.

*****

دەڵێن: کابرایەکی عەرەب دەیگوت: دوعای ددان هێشان دەزانم: هەر کەسێک ددانی بێشی، ئەو دوعایەی منی پێ بێ ژانی ددانی دەشکێ، بەڵام کاتێ یەکێک دەچو بۆلای و دوعاکەی بۆ دەنوسی دەیگوت: ئاگادار بە، ئەو دوعایە بەو شەرتە کار دەکا کە چوویە سەر جێگا یادی (مەیمون) نەکەی، چونکە دوعاکە بەتاڵ دەکاتەوە. بەلام کاتێ دان هێشەکە دەچووە سەر جێگا، قسەی دوعا نوسەکەی وەبیر دەهاتەوە و هەتا بەیانی لەبەر ئێشی ددانی خەوی لێ نەدەکەوت و بەیانی کە دوعانوسەکە تووشی دەبوو دەیگوت. چۆن بووی؟ کابرا دەیگوت: هەتا بەیانی لە تاوی ژانی ددانەکەم خەوم لێ نەکەوتووە. دوعانوس دەیگوت: ڕەنگە مەیمونت وەبیر هاتبێتەوە؟ کابرا دەیگوت: بەڵێ. دوعانوسەکە دەیگوت: ئاخر بۆیە ئەو نوشتەوە کاری نەکردووە.

*****

پیاوێکی(عوتەبە)ی کوڕی ئەبی سوفیان زوڵم لە عەرەبێکی خەڵکی شاری (طایف) دەکا. کابرا دەچێ بۆلای عوتەبە و زۆر بەبێ ئەدەبی شکایەتی لێ دەکا. عوتەبە بەتوڕەییەوە دەڵێ: کابرا وادیارە تۆ زۆر نەزان و نەفامی، لام وایە نازانی کە لە شەو و ڕۆژدا چەند نوێژیش واجبن. کابرا دەڵێ: بۆ ئەگەر زانیم ئیجازە دەدەی پرسیارێکت لێ بکەم؟ عوتەبە دەڵێ ئا. کابرا دەڵێ:

إِنَّ الصَّلاةَ أَرْبَعٌ وَ أَرْبَعٌ
ثُمَّ ثلاثٌ بَعْدَهُنَّ أَرْبَعٌ
ثُمَّ صَلاةُ الْفَجْرِ لا يُضَيَّعُ

یانی نوێژی واجب لە شەو و ڕۆژێکدا دووجاری چوار ڕکاتی و لەپاشان سێ ڕکاتێک و ئینجا چوار ڕکاتیەکی دی و دوای نوێژی بەیانی کە نابێ بفەوتێ. عوتەبە دەڵێ: وایە، پرسیارەکەت بکە. کابرا دەڵێ: فەقەڕاتی پشتت چەند گرێن؟ عوتەبە دەڵێ: نازانم، کابرا دەڵێ جا تۆ کەشتی پشتی خۆت نەزانی چۆن دەزانی قەزاوەت

و حوکم بەسەر خەلکدا بکەی؟ عوتەبە دەڵێ: بابە زوو شتەکەی بدەنەوە و با بڕواو لە کۆڵمان وەبێ.

*****

(سەهلی) کوڕی هارون دەڵێ: کابرایەکی بەخیل زۆر دەچوو بۆ مەجلیسی (ابن المقفع) و ابن المقفع دەیگوت: دەبێ دەعوەتێکم بۆ بکەی، کابراش لە وەلامدا دەیگوت: پێت وایە پلاو و گۆشتت بۆ ساز دەکەم؟ چ بوو ئەوەت بۆ دادەنێم. خولاسە ڕۆژێک لەگەڵی چووە، کاتێ خواردنەکەی هێنا، نانەڕەقێک و دوو سێ کلۆ خوێ بوون. لەوکاتەدا سوالکەرێک لە دەرگای دا و هاواری کرد خاوەن ماڵ خێرێکم پێ بکە، ڕەحمەتی خواتان لێ بێ. چەندجار هاواری کرد، ئاخری خاوەن ماڵی بەخیل گوتی: دە بڕۆ بەس هاوارکە، بێم هەر دوو قاچت دەشکێنم. ابن المقفع گوتی: کاکی سوالکەر زوو بڕۆ و خۆت ڕزگار بکە، چونکە ئەگەر وەک من دەزانم وەعدەی چەند ڕاستە، تۆش ئاوات بزانیایە هەڕەشەی چەند ڕاستە گورج دەڕۆیشتی.

*****

دەڵێن: ڕێوی زۆر فێڵبازە و زۆر زیرەکە. یەکێک لە نیشانەی زیرەکی ئەوەیە کە هەرکاتێ (کێچی) زۆری پێوە بوو، هێندێک (تووک) بە دەمەوە دەگری و دەچێتە ناو ئاوێکەوە و وردە وردە خۆی نەوی دەکا. کێچەکان کە ئاویان لێ نزیک بۆوە دەچن لەسەر ئەو تووکە کۆدەبنەوە کە بەدەمیەوە گرتووە. ئەویش کە زانی هەموویان کۆبوونەوە بە ئاسپای تووکەکە هەڵدەداتە ناو ئاوەکەوە و بۆخۆی لە ئاوەکە دێتەدەر.

*****

دەڵێن: بۆ ئەوەی گورگ بەچکەکانی نەخوا، کە بەچکەی بوون گورج دەچێ (کالەکەمارە)ی زۆر بە برکەوە دێنی و لە زارک و دەوروبەری کونەکەی بلاودەکاتەوە، چونکە دەزانی کە هەرکاتێ گورگ بە سەر کالەکەمارەدا بڕوا فەوری دەمری، بەو فێڵە بەچکەکانی دەپارێزی.

*****

دەڵێن: پیاوێکی (خوراسانی) هەموو ساڵێک دەهاتە نەجەف و کەربەلا و دەبوو بە میوانی عەرەبێک. زۆرجار بە عەرەبەکەی دەگوت خۆزگە جارێک دەبوویە میوانم، جا دەمزانی چۆنت پاداشی ئەو هەمووە خزمەتە بدەمەوە. دوای ماوەیەک عەرەبە ڕێگای دەکەوێتە شاری (مەروە) و دەچێ بۆ ماڵی دۆستەکەی. کاتێ دەچێ، دەبینێ دۆستەکەی لەگەڵ چەند کەسێک دانیشتووە. سلاو دەکا، بەلام کابرا خۆی گێل دەکا و یانی نایناسێ. کابرای عەرەب زۆری بەلاوە سەیر دەبێ و دەڵێ: ئەوە دەمم

هەڵداوە بۆیە نامناسیتەوە. پەڕۆکەی لە دەمی دەکاتەوە و دەڵێ: هەرنامناسی؟ کابرا دەڵێ: ناتناسم عەرەب لەبەرخۆیەوە دەڵێ: ئەوە لەبەر چەتفە و عەگالەکەمە لێی تێکچووە. ئەوانیش فڕێدەدا و دەڵێ: دەمناسیەوە؟ خوراسانی دەڵێ: نا. عەرەب فەروەکەی دادەنێ و دەڵێ: ئێستاش نامناسی؟ دەڵێ: ناوەڵڵە ئەگەر پێستەکەشت لەخۆت داڕنی هەر ناتناسم.

*****

یەکێک لە ئەسحابەکانی پێغەمبەر(دخ) بە ناوی (نوعەیمان) بە کەسێکی گاڵتەباز ناسرابوو، یەکێک بوو لەو ئەسحابانەی کە لە غەزای (بەدر)دا بەشداری کردبوو. بۆ نموونە یەکێک لە گاڵتەکانی ئەوەیە، کە دەڵێن: لە خزمەت حەزرەتی ئەبوبەکر و چەند ئەسحابەدا دەچن بۆ شاری (بوصرا). ئەسحابەیەکیان لەگەڵ بوو ناوی (سووەیبیط) بوو. ئەویش بەشداری غەزای (بەرد) ببوو. لەو سەفەرەدا خواردن بەدەست ئەو بوو. لە کاتێکدا کە حەزرەتی ئەبوبەکر لەوێ نەبوو، (نوعەیمان) چوو بۆلای و گوتی برسیمە. (سووەیبیط) لە وەڵامدا گوتی: سەبر بگرە با حەزرەتی ئەبوبەکر بێتەوە. نوعەیمان گوتی: وەڵلاهی دەبێ تووڕەت بکەم. هات بۆلای چەند کەسێک و گوتی: غولامێکی عەرەبم لێ بکڕن کە گورج و گۆڵە، بەڵام زۆرزان و بە زمانە. لەوانەیە بڵێ، عەبد نیم. باوەڕی پێ مەکەن. گوتیان: باشە و لێیان کڕی بە دە وشتر و هێنانی بۆلای ئەسحابەکان و گوتی: ئەوەیە، گوتیان: هەستە وەپێشمان کەوە کڕیومانی. گوتی: بابە ئەمن عەبد نیم. هەرچەند هاواری کرد فایدەی نەبوو گوتیان: دەزانین چەند زمان درێژی. گوریسێکیان لە ملی خست و لەگەڵ خۆیان برد. کاتێ حەزرەتی ئەبوبەکر هاتەوە و پێی زانی، لەگەڵ ئەسحابەکان چوو پارەکەیان دانەوە و هێنایانەوە. پێغەمبەر(دخ) کە بەو گاڵتەیەی زانی تا ساڵێک کە وەبیری دەهاتەوە زەردەخەنەی دەهاتێ.

*****

جارێکی دی کریەیەک هەنگوین لە عەرەبێک دەکڕێ و بەدیاری دەیبا بۆ پێغەمبە و عەرەبەکەش لەگەڵ خۆی دەبا بۆ بەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر و دەڵێ: کاکە پارەکەی لێرە وەرگرە. حەزرەت دەست دەکا بە دابەشکردنی هەنگوینەکە لەوکاتەدا کابرای عەرەب هاوار دەکات و دەڵێ: کوا پارەی هەنگوینەکە؟ حەزرەت بە گاڵتەوە دەفەرمووێ: لا گوونێکی نوعەیمانە و دەفەرمووێ: نوعەیمان ئەوە بۆ واتکردووە ؟ نوعەیمان دەڵێ: قوربان بۆ ئەوەی خێرت پێ بگا و شۆشم هیچ پێنەبوو. حەزرەت پێدەکەنی و پارەی کابرا دەدا.

*****

یەکی دی لە گاڵتەکانی ئەوەیە، ڕۆژێک کوێرێک بە ناوی (مەخرەمە) دەڵێ: دەستم بگرە با بچم میز بکەم، دەستی دەگری و دەیباتە گۆشەیەکی مزگەوت و دەڵێ: لێرە دانیشە. کوێرە دادەنیشی و خەریک دەبێ میز بکا. خەڵک چاویان لێ دەبێ و هاوار دەکەن و دەڵێن نەکەی ئێرە مزگەوتە! کوێرە دەڵێ: ئەوەی دەستی گرتم کێ بوو؟ گوتیان نوعەیمان بوو. دەڵێ وەڵڵاهی دەبێ بەو گۆچانە دارکاری بکەم. نوعەیمان دەزانی کە کوێرە وای گوتووە. ڕۆژێک دێ بۆلای دەڵێ: کارت بە نوعەیمان هەیە؟ کوێرە دەڵێ: بەڵێ. لە کوێیە؟ نوعەیمان دەڵێ: وەرە بابچین نیشانت بدەم ئەوە نوێژ دەکا. دەیبا بۆ لای حەزرەتی عوسمان. لەکاتی نوێژکردندا و دەڵێ: ئەوە نوعەیمانە. کوێرە گۆچان ڕاست دەکاتەوە لێی ڕاکێشی، چاویان لێ بوو هاواریان کرد نەکەی ئەوە حەزرەتی عوسمانە کوێرە گوتی: بۆ ئەوە کێ بوو ئەوی بەمن نیشاندا؟ گوتیان: نوعەیمان بوو. کوێرە گوتی: وادیارە کە قەت تۆڵەم بۆ لێ ناکرێتەوە.

*****

هەروەها دەڵێن: عبداللای کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی حەزرەتی ئەبوبەکریش زۆر گاڵتەباز و قسەخۆش بووە. دەڵێن: شەوێک لەگەڵ پیاوێکی مەدینەیی دانیشتبوو نانی دەخوارد. بەردێک هاویشرایە ماڵەکەیانەوە. زۆری پێنەچوو دوو بەردی دیکەشیان هاویشتن. عبداللا بە کارەکەرەکەی گوت: بچۆ دەرەوە بزانە بانگی مەغریبی داوە؟ کارەکەرەکە چۆ دەرەوە و دوای سەعاتێک هاتەوە گوتی: بەڵێ بانگی داوە و جەماعەتیشیان کردووە. کابرای مەدینەیی گوتی: چۆن لەپێش ئەوەیدا کارەکەرەکە بێتەوە ژووری نوێژمان نەکرد؟ عبداللا گوتی: بەڵێ، بەڵام ئەگەر نەمناردایە دەرەوە بۆ ئەو پرسیارە، تا بەیانی بەردەبارانیان دەکردین، دەزانی؟ کابرای مەدینەیی حاڵی بوو زۆر پێکەنی و گوتی: حاڵی بووم.

*****

دەڵێن. کابرایەکی ڕەنگ و ڕوو ناشیرین ئاوێنەیەکی دیتەوە و فووی لێکرد و تێی ڕوانی و تەمشای خۆی کرد زۆر ناشیرین بوو. بە توڕەییەوە فڕێی دا و گوتی: دایکی ساحەبت دەگێم، ئەگەر خەراپ نەبویتایە فڕێیان نەدەدای.

*****

دەڵێن: عەرەبێکی دەشتەکی نانێکی بەدەستەوە بوو. تووشی پیاوێک بوو شیرێکی بەدەستەوە بوو. عەرەبەکە گوتی: کاکە ئەو شیرەم بەو نانە پێ بفرۆشە. کابراگوتی:

کابرا ئەوە شێت بووی؟ چۆن شێرێک بە نانێک دەدەن؟ عەرەبەکە گوتی: بۆ شێت بووم؟ بۆ کامەیان قازانجی بۆ زگ زۆرترە؟

*****

جارێک هارونەڕەشید زانای بەناوبانگ شێخی (ئەوزاعی) و ئیمام (ئەبو یوسف)ی لەلا دەبن. بۆ خۆشی و نوکتە ڕوو دەکاتە ئەوزاعی و دەڵێ: تۆ لیباسی ڕەشت پێ چۆنە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: بەلامەوە حەرام نیە، بەڵام ناخۆشم دەوێ. هارونەڕەشید دەڵێ: بۆ ناخۆشت دەوێ؟ دەڵێ: چونکە قەت بووک لەبەری ناکەن و حاجی نایکەن بە ئیحرام و لەبەی کەی پێوە بڵێن و ناکرێ بە کفنی مردووش. ئینجا ڕوو دەکاتە ئەبو یوسف و دەڵێ: ئەی بەلای تۆوە چۆنە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: ئەی ئەمیری موسوڵمانان ڕەشی بەلای منەوە زۆر پیرۆزە، چونکە خۆشەویسترین شت بەلای منەوە ڕەشایی چاوە و نوور هەر لە تاریکایی و ڕەشاییدا دەر دەکەوێ و تەنانەت قورئانی پیرۆزیش بە ڕەشی نوسراوەتەوە. هارونەڕەشید زۆری پێخۆش دەبێ و ئافەرینی هەر دووویان دەکا.

*****

دەڵێن: کابرایەک دەیگوت: ئەمن (مووسای) کوڕی (عیمران)م. گرتیان و بردیان بۆلای خەلیفەی موسوڵمانان. خەلیفە گوتی: ئەتۆ کێی؟ گوتی: مووسای کوڕی عیمرانی کەلیم، عەسایەکی بەدەستەوە بوو. خەلیفە گوتی: ئەوەش عەساکەتە کە بووە بە ئەژدیها؟ گوتی بەڵێ. خەلیفە گوتی: دەیفڕێنە و پێی بڵێ با وەک عەساکەی مووسا ببێ بە ئەژدیها. کابرا گوتی: جارێ لەپێشدا ئەتۆ وەک فیرعەون بڵێ (أَنَارَبُّكُمُ الأَعْلَىٰ) یانی ئەمن خوای گەورەتانم، تا منیش عەساکەم بکەم بە مار وەک هی حەزرەتی مووسا. خەلیفە زۆر پێکەنی و قسەکەی پێخۆش بوو، لەوکاتەدا نانیان هێنا. بە کابرایان گوت: هیچت خواردووە؟ گوتی: بەخوا عەقڵ شتێکی باشە، جا ئەگەر شتم بوایە و بم خواردایە بۆ لێرە دەبووم. خەلیفە زۆری پێ سەیر بوو، کابرای خەڵات کرد و ناردیەوە.

*****

هەروەها دەڵێن: ئافرەتێک دەیگوت: ئەمن پێغەمبەرم گرتیان و بردیان بۆلای مەئموونی کوڕی هارونەڕەشید. مەئموون لێی پرسی ئەتۆ کێی؟ گوتی: ئەمن (فاتمە)ی نەبیم. مەئموون گوتی: تۆ ئیمانت بە محەممەد هەیە؟ گوتی: بەڵێ هەرچی فەرموویەتی ڕاستە و ئیمانم پێیەتی. مەئموون گوتی: جاخۆ حەزرەت فەرموویەتی: (لانَبِيَّ بَعْدِي) واتە لەپاش من پێغەمبەر نابن. ئافرەتەکە گوتی: ڕاستی فەرمووە،

بەلام ئەیفەرمووە (لانَبِیَّةَ بَعْدِی) فەرموویەتی: پیاوی پێغەمبەر نابێ، ئەیفەرمووە ژنی پێغەمبەر نابێ؟ مەئموون پێکەنی و گوتی: ئەمن بەلگەم نەما. ڕووی کردە خەلکەکە و گوتی: ئەوەی بەلگەی لایە با بیلێ.

*****

دوبارە دەلێن: یەکی دەیگوتی: ئەمن پێغەمبەرم بردیان بۆلای مەئموون و گوتی: تۆ پێغەمبەری؟ گوتی بەلێ. گوتی: موعجیزەت چیە؟ گوتی: چ دەلێی ئەوەیە. مەئموون گوتی: دە کالەکێکمان لەو عەرزە بۆ بێنەدەرێ گوتی: سێ ڕۆژم مۆلەت بدەن. مەئموون گوتی: هەر ئێستا دەمەوێ. کابرا گوتی: ئەی ئەمیری موسولمانان ئینسافت هەبێ تۆ دەزانی کە خوای گەورە بەو هەمووە دەسەلاتەیەوە بە سێ مانگ پێی دەگەیەنێ، چۆن تۆ بە سێ ڕۆژی لەمنی قەبوول ناکەی؟ مەئموون پێکەنی و زانی فێلبازە و تۆبەی پێکرد و بەریدا.

*****

دوبارە دەلێن: هەرلە زەمانی مەئموون دا پیاوێک دەیگوت ئەمن پێغەمبەرم، هێنایان بۆلای و گوتی: تۆ پێغەمبەری؟ گوتی: بەلێ. گوتی: موعجیزەت چیە؟ گوتی: بەردێک دەخەمە ناو ئاوە و دەیتوێنمەوە و لەگەل ئاوەکە تێکەلی دەکەم. مەئموون و خەلکەکە گوتیان: باشە. کابرا بەردێکی لە باخەل دەرهێنا و خستیە ناو ئاو، فەوری توایەوە. گوتیان: ئەوە فێل و حیلە بوو کردت، ئێمە بەردێکت بۆ دێنین وەیتوێنە. لە وەلامدا گوتی: ئەوەندە شێلگیر مەبن، خۆ ئێوە لە فیرعەون گومڕاتر نین و منیش لە حەزرەتی مووسا گەورەتر نیم، خۆ فیرعەون بە مووسای نەگو ت: عەساکەی خۆ ت نابێ، ئێمە عەسات بۆ دێنین بیکەی بە مار. مەئموون زۆر پێکەنی و ئازادی کرد.

*****

دەلێن: دوو (جاریە)یان برد بۆ ئەبو جەعفەری مەنسور. زۆری بەلاوە جوان و وریا بوون. ئەوەی لە پێشدا چووە ژورێ گوتی: ئەی ئەمیری موسولمانان خواوەندی گەورە منی بە گەورەتر داناوە لە هاوڕێکەم، بەگوێرەی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: (وَالسَّابِقُونَ الأَوَّلُونَ) یانی ئەوەی لەپێشدا. ئەوی دیکە گوتی: جەنابی خەلیفە وانیە، من لەو گەورەترم، بەپێی ئەو ئایەتە کە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: (وَلَلآخِرَةُ خَیْرٌ لَکَ مِنَ الأُولَی). ئەبو جەعفەر هەر دووی خەلات کردن.

*****

لە باسی لەتیفە و نوکتەی عولەمای عیلمی (نەحو)دا دەلێن: جارێک (هارون)ی کوڕی (عبدالملک) لە مەجلیسی(موەفق)دا مەست ببوو. لە ئاخری مەستیەکەیدا

هەستا بڕوا، بەڵام نەیتوانی و لە خێوەتەکەدا نووست. کاتێ خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد و ڕۆیشتن، (ڕاشیدی) دەرکەوان هات چاوی پێکەوت و گوتی: یا (هارون انصرف)، واتە هەستە بڕۆوە. هارون گوتی: (لاینصرف هارون)، یانی هارون مونسەریف نابێ. ڕاشید قسەکەی دووپات کردەوە و هارون گوتی: لە ئاغاکەت بپرسە ئەو دەزانی. (مووەفەق) گوێی لێ بوو گوتی: (هارون لا ینصرف) ڕاشید لێی گەڕا و دەستی لێ هەڵگرت. بەیانی کە (مووەفەق) هات و تەماشای کرد هارون لەوێ نووستووە، لە ڕاشید تووڕە بوو و گوتی: تۆ چۆن دێڵی یەکێک لە خێوەتەکەی مندا بنووی و من نەزانم؟ ڕاشید گوتی: قوربان خۆت ئەمرت کرد لێی گەڕێم و گوتت هارون لاینصرف. مووەفەق زانی کە ڕاشید بە هەڵە تێگەیوە، زۆر پێکەنی و گوتی: ئەمن مەبەستم ئیعراب بووە، تۆ بە جۆرێکی دی حاڵی بووی.

*****

دوبارە دەڵێن: بەقاڵێک باینجانی دەفرۆشتن. زانایەکی (نەحو) زان گوتی: (کیف تبیع)، یانی چۆنیان دەفرۆشی؟ کابرا گوتی: (عیشرین بدانق) واتە بیستی بە دانگێک. زاناکە گوتی: ئەی بۆ نالێی (عشرون بدانق). بەقاڵەکە وەیزانی دەڵێ بیست بە دانگێک گرانن، گوتی: (سلاسین بدانق) یانی سی بە دانگێک. زاناکە گوتی: ئەی بۆ ناڵێی، (سلاسون)؟ بە کورتی هەتا هاتە سەر(سبعین)، حەفتا. زاناکە گوتی: ئەی بۆ ناڵێی (سبعون). کابرای بەقاڵ گوتی: وادیارە دەتەوێ بۆت بکەم بە هەشتا، بەخوا لیچی لێ نادەی.

*****

دەڵێن سواڵکەرێک چووە بەردەرگای ماڵێک داوای شتێک بکا، لەوکاتەدا خاوەن ماڵەکە لە ئاودەست بوو و میزی دەکرد. سواڵکەرەکە گوێی لە دەنگی میزەکەی بوو، قوڵتەی دەهات گوتی: ڕەحمەتی خواتان لێ بێ لەوەی دەکوڵی هێندێکم بۆ تێکەن. خاوەن ماڵەکە، کە ئافرەت بوو، تڕێکی بەردا و گوتی: دارەکانمان تەڕن نایسێن، نەکولیوە، کابرای سواڵکەر بە ناچاری ڕۆیشت.

*****

دەڵێن: خەڵکی ئیسفەهان زۆر ڕژدو سەقیل و بەخیلن. جارێک کابرایەک دەچێتە ئیسفەهان، ڕۆژێک کاتی نان خواردەن، کوێرێک بەلای دادەڕوا و کابرا کولێرەیەکی دەداتێ. کوێرەکە دوعای بۆ دەکا و دەڵێ: یاخوا خوا ڕەحم بە غەریبیت بکا. کابرا دەڵێ، چوزانی غەریبم؟ کوێر دەڵێ: بەوەڕا دەزانم چونکە ئەوە(٣٠) ساڵە تا ئێستا کەس کولێرەیەکی نەداومێ و دیارە کە تۆ غەریبی دەنا تۆش وەک ئەوان دەبووی.

*****

له(ئەشعەب)ی کوڕی (جوبەیر) دەگێڕنەوە کە زۆر قسەخۆش و نوکتەباز بووە. دەڵێن: ڕۆژێک گوتیان تۆ ئەسحابی پێغەمبەرت زۆر دیوە، ئەگەر حەدیسی پێغەمبەرت ئاگالێن، بۆمان وەگێڕە. لە وەلامدا دەڵێ: ئەمن لە هەموو کەس زیاتر ئاگام لە حەدیسە. دەڵێن : دەحەدیسێکمان بۆ وەگێڕە. دەڵێ: عیکرەمە لە کوڕی عەباسەوە بۆی گێڕامەوە و گوتی دوو خەسڵەت هەن، ئەگەر لە موسولماناندا هەبن دەچنە بەهەشت. گوتیان: دە بیانڵێ بزانین ئەو دوو خەسڵەتە چین. گوتی: ئاخر عیکرەمە یەکیانی لەبیر چۆتەوە و خۆشم ئەوی دیم لەبیر نەماوە.

*****

دەڵێن : ئەو (ئەشعەبە) عادەتی وابوو هەمیشە دەچو لە مالی (سالمی) کوڕی عبداللای کوڕی حەزرەتی عومەر نانی دەخوارد. ڕۆژێک سالم بە منداڵەکانی دەڵێ: هەستن با ئەمرۆ بچین لە ناو باغەکەماندا نان بخۆین. ئەوان دەڕۆن بۆ ناو باغ و ئەشعەب دێ بۆ مالیان، تەماشا دەکا کەسیان لە مال نیە. دەپرسێ و دراوسێکەیان دەڵێ: چوون بۆ ناو باغ. ئەشعەب گورج وشترێک بە درهەمێک بەکرێ دەگرێ بەرەو باغەکەیان دەڕوا. کاتێ دەگاتە ڕاستی دیواری باغەکە، خۆی فڕێدەداتە سەر دیوارەکە و دیوار بەسەریدا دەڕوخێ. سالم لەودیو دیوارەکەوە گورج عەباکەی بەکچەکانی دا دەدا و دەڵێ: کچەکانم کچەکانم. ئەشعەب لەسەرەخۆ دەڵێ: (لَقَدْ عَلِمْتَ مالَنا فی بَنا تِکَ مِنْ حَقٍ وَاَنَّکَ لَتَعْلَمْ ما نُرِیدُ). یانی تۆ دەزانی کە ئێمە هیچ حەقێکمان بەسەر کچەکانتەوە نیە و خۆت دەزانی چمان دەوێ. جا ئەو ئەشعەبە دەڵێ: جارێک ئافرەتێک هاتەلام و گوتی: با ئەو دینارەت بە ئامانەتی لابێ. گوتم باشە و لێم وەرگرت و وەبن سوچی فەرشەکەمدا. دوای چەند ڕۆژان هاتەوە و گوتی: بە سەدەقەت بم دینارەکەم بدەوە. دەڵێ: لەسەرەخۆ گوتم لێوی ئەو فەرشە هەڵدەوە و بەچکەکەی دینارەکە بەرەوە. دینارەکەت زاوە. دەڵێ: چونکە لەپێشدا درهەمێکم لە تەنیشتی دینارەکە دانابوو. دەڵێ: ئافرەتەکە کە سوچی فەرشەکەی هەڵدایەوە، تەماشای کرد ڕاست دەکەم، درهەمەکەی هەڵگرت و دینارەکەی بەجێهێشت و ڕۆی. دەڵێ: خولاسە تا سێ جار بەمجۆرە دەدات و دەمناردەوە. سەری چوار جاردی کە هاتەوە دەستم کرد بە گریان، گوتی: ئەوە بۆ دەگری؟ گوتم زۆر بەداخەوە دینارەکەت ئەوەندەی خوێنی پاش منداڵ بوون لەبەرچوو، کە مرد. ئافرەتەکە گوتی: جا باشە، دینار چۆن خوێنی پێدادێ؟ گوتم: هەی بێ دین، باوەڕم پێدەکەی کە منداڵی دەبێ، بەلام باوەڕم پێناکەی کە خوێنی پێدابێ؟ دەڵێ: بەوەی لە

کۆڵ خۆم کردووە و باقی دینارەکەم خوارد.

*****

(مەدائینی) دەڵێ: (ئەشعەب) دەڵێ: جارێک چووم بۆ ماڵی (کەعبە) و دەستم بە پەردەی (کابە) گرت و گوتم ئەی خوای گەورە بەسە ئەو حیرس و تەماعە و سواڵکردنەم لەکۆڵ بکەوە. بە ئەمری خوا کە گەڕامەوە، ڕوم لە هەرلایەک دەکرد و بەلای هەر کەسێکدا دەچووم وەک جاران نەبوو، هیچیان نەدەدامێ. هاتمەوە لای دایکم. گوتی: ئەوە بۆ بەدەستی بەتاڵ هاتیەوە؟ باسی دوعاکەم بۆ گێڕایەوە. دایکم تووڕە بوو گوتی: وەڵڵاهی پێ ناخەیتە ئەو ماڵەوە تا نەچیەوە (مەکە) و دوعایەکەت لە خوا وەرنەگریتەوە. ناچار هاتمەوە بۆ مەکە و چوومەوە ماڵی کەبا و گوتم: ئەی خوای گەورە دوعاکەم بدەوە بەسەردا و گەڕامەوە. بە ئەمری خوا، بەلای هەرکەسێکدا دەڕۆیشتم شتێکی دەدامێ و تەنانەت غولامێکیشیان دامێ و هاتمەوە بۆلای دایکم. کە چاوی بەو هەموو شتە کەوت و غولامەکەی دی گوتی: ئەوە چییە؟ منیش لەترسی ئەوەی کە بڵێم ئەوە غولامە داویانمێ لە خۆشیان دەمری گوتم: ئەوە (غەینە)، گوتی: (غەین) چییە؟ گوتم: (لام)، گوتی: لام چییە؟ گوتم (ئەلف)، گوتی: ئەلف چییە؟ گوتم (میم)، گوتی: میم چییە؟ گوتم (غولام). بە دیتنی لەخۆشیان بێ هۆش بوو. دەڵێ: ئەگەر حەرفەکانم بە جیا جیا نەگوتبایە ئەو فاسقە لەخۆشیان دەمرد.

*****

(مەدائینی) دەڵێ: جارێک لە مەجلیسی (مەڕوان)ی کوڕی (ئیبان)ی کوڕی (عوسمان)دا لە تەنیشت مەڕوان دادەنیشی و لەناکاو مەروان بایەکی لێ دەبێتەوە. ئەشعەب گورج خۆی تێکدەنێ و وانیشان دەدا کە ئەو تڕەکەی لێ بەربووە. کاتێ مەروان لە مەجلیسەکە هەڵدەستێ و دەڕواتەوە بۆ ماڵ، ئەشعەب وەدوای دەکەوێ و دەڵێ: حەق و خوێنەکەم بدە. دەڵێ خوێنی چی؟ ئەشعەب دەڵێ حەق و خوێنی ئەو تڕەی کە بۆم هەڵگرتی و بەسەر خۆمدا هێنا، ئەگەر وام نەکردایە بەسەر تۆدا دەبڕا. لە کۆڵی نابێتەوە تا پارێکی لێ دەستێنێ.

*****

محەممەدی کوڕی (قەبیلە) دەڵێ: ئەشعەب شیری دەدا بە (گیسکەڵە)یەک تا تۆزێک وەسەر خۆی کەوت. ڕۆژێک بە دایکی (وەردانی) کوڕی گوت: زۆر حەز دەکەم لە شیری مەمکی خۆت هێندێکی بدەیتێ. ژنەکەی چەندجار شیری دا بە گیسکەکە، لەپاشان ڕۆژێک ئەشعەب گیسکەکەی هێنا بۆ لای ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری

کوڕی محەممەد و گوتی: بەخوا ئەوە کوڕمە و شیری خێزانمی خواردووە و بۆ تۆم هێناوە و بە لایقی تۆم زانی. ئیسماعیل تەماشای دەکا و دەڵێ: سەری ببڕن و لێی نێن. ئەشعەب ڕوو دەکاتە ئیسماعیل و دەڵێ: قوربان پاداشتەکەم بدەیە. ئیسماعیل دەڵێ: بەخوا ئەمڕۆ هیچم بەدەستەوە نیە، تۆ ئێمە دەناسی، حەقی تۆ نافەوتێ. کاتێ زانی هیچی ناداتێ هەستا هات بۆلای جەعفەری باوکی و ڕووی خۆی گرژ کرد و خۆی وێک نا و هاواری کرد و گوتی: ڕزگارم بکە. جەعفەر گوتی کەس لێرە نیە بڵێ بزانم چیت لێ قەوماوە؟ گوتی: ئیسماعیلی کوڕت لەبەرچاوی خۆم پەلاماری کوڕەکەمی دا و سەری بڕی. جەعفەر هەموو گیانی لەرزی و هاواری کرد و گوتی: ئەی ماڵ نەوێران چیت دەوێ؟ ئەشعەب گوتی: بەخوا کارم بەسەر ئیسماعیلەوە نیە و لای کەسیش باسی ناکەم. جەعفەر دوو سەت دیناری دایە و گوتی: چیت پێویست بوو حازرین. دەڵێ. جەعفەر بەپەلە ڕایکرد بۆلای ئیسماعیلی کوڕی و ئەوەندە بەپەلە دەڕۆیی بەر پێی خۆی نەدەدی، بەتوڕەییەوە گوتی: ئەی ئیسماعیل بۆ ئەو کارەت لەگەڵ ئەشعەب کردووە؟ ئەشعەب خەبەری بە ئیسماعیل دابوو، کە لەلای باوکی چی کردووە. ئیسماعیل دەستیکرد بە پێکەنین و ڕووداوەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە و هاتەوە سەرمخۆ، کاتێ تووشی ئەشعەب دەبوو دەیگوت: یاخوا خوا بت ترسێنی وەک منت ترساند، ئەشعەب لە وەڵامدا دەیگوت: غەم و ترس و پەرۆشی ئێمە بۆ گیسکەکە زیاتر بوو لە پەرۆشی تۆ بۆ دوو سەت دینارەکە و جەعفەر دەستی دەکرد بە پێکەنین.

*****

(ئەشعەب) جارێک گوێی لە ((حەبای) مەدینەیی دەبێ کە لەبەر خوا دەپاڕێتەوە و دەڵێ: (اَللّهُمّ لاتُمُتْنِی حَتّی تَغْفِرَلِی مِنْ ذُنُوبِی) یانی ئەی خوای گەورە مەم مرێنە تا لە گوناحانم خۆش دەبی. ئەشعەب چوو بەلایەوە و گوتی: ئەی (فاسیقە) جاخۆ تۆ لەبەر خوا ناپاڕێیەوە لێت خۆش بێ، بەڵکو داوای تەمەنی ئەبەدی لێ دەکەی، چونکە خوا قەت لێت خۆش نابێ، مانای وایە ئەگەر دوعاکەت گیرابکا دەبێ قەت نەمری.

*****

(زوبەیری) کوڕی (بەکار) دەڵێ: مامم بۆی گێڕامەوە و گوتی: جارێک دۆستێکی بابی ئەشعەب تووشی ئەشعەب دەبێ و دەڵێ: ماڵ نەوێران خۆ باوکت ڕیشی هەبوو، زۆر تووکن بوو، ئەوە بۆ ئەتۆ وابێ تووکی؟ چویتەوە سەر کێ؟ لە وەڵامدا دەڵێ: قوربان چوومەوە سەر دایکم.

*****

(مەدائینی) دەڵێ: پیاوێکی پیری (مەدینەیی) بۆی گێڕامەوە گوتی: لێرە ئافرەتێک هەبوو چاوی زۆر پیس بوو، تەماشا هەرشتێکی بکردایە و بەلایەوە باش بوایە لە چاوی دەبرد. ئەو ئافرەتە لەکاتی سەرەمەرگدا دەچێ بۆلای ئەشعەب، کە گوێ رادەگری ئەشعەب بە کچەکەی دەڵێ: رۆڵە کچم هەرکاتێ مردم نەچی دەست بکەی بەگریان و هاوار بکەی ئەی بابەڕۆ بۆ ئەو نوێژ و رۆژو و زانیاری و قورئان خوێندنەت، چونکە خەڵک بە درۆت دەکەنەوە و لەعنەت لە من دەکەن. ئەو ئافرەتە دەڵێ: لەپاشان ئاوڕی دایەوە و چاوی بەمن کەوت، کە منی دی بە فەقیانەکەی رووی خۆی داپۆشی و گوتی: ئەی فلان کەس بۆخاتری خوا، ئەگەر لەو حاڵەدا کە من ئێستا تێیدام شتێکت پێ باشە، سڵاوەتێک لە پێغەمبەر بدە و بە هیلاکم مەبە. ئافرەتەکە دەڵێ: خوا کوێرت بکا لەوکاتەدا کە تۆ لە گیانداندا بی چ شتێکی باشت دەبینم تا چاوێنیت پێ بەرم؟ ئەشعەب دەڵێ: دەزانم، بەڵام گوتم: مەبادا چاوت لێ بێ کە بەئاسانی گیان دەدەم و گیان کێشانەکەم لەسەر گران بکەی. دەڵێ دوو سێ جنێوم پێدا و هاتمەدەر. ئەوانەی لە دەورەی بوون دەستیان کرد بە پێکەنین و لەوکاتەدا ئەشعەب تەواو بوو.

*****

(عبدالله)ی کوری سالح دەڵێ: (دولامە)ی کوری (ئەبو دولامە)، رۆژێک هات بۆلای باوکی، لەوکاتەدا باوکی لەگەڵ چەند کەس لە جیران و دراوسێکانید دانیشتبو، هات لەبەر دەمی باوکی دانیشت و رووی کردە خەڵکەکە و گوتی خزمینە ؛ خۆتان دەبینن کە باوکم پیر بووە و پێستی تەنک و ئێسقانی زەعیفی ماو و ئێمەش زۆرمان پێویستی بە مانەوەی هەیە، زۆری لەگەڵ خەریکم شتێکی پ دەڵێم بەقسەم ناکا، تکاتان لێ دەکەم ئێوە یارمەتیم بدەن و هەوڵی لەگەڵ بدەن ب بەقسەم بکا قازانجی خۆیەتی. گوتیان زۆر باشە، لەپاشان روویان کردە ئەب دولامە و زۆری بەسەردا هاتن و لۆمەیان کرد. ئەبو دولامە گوتی: بابە (ئەلحو کم لله) پێی بڵێن. بەو هەتیوە پیسە داخوا دەڵێ چی؟ ئاخری دەزانن کە شتێکی زۆ قوڕ داوا دەکا. بە کوڕەکەیان گوت: بڵێ بزانین چیت لە باوکت دەوێ؟

کوڕەکەی گوتی: باوکم جیماعی زۆر کوشتویەتی، یارمەتیم بدەن با بیخەسێنی بەوە نەبێ چاری ناکرێ و بۆ جیسمیشی باشترە و تەمەنیشی درێژتر دەبێ خەڵکەکە سەریان سوڕما لە قسەی کوڕەکە و دەستیان کرد بە پێکەنین، لەپاشا روویان کردە ئەبو دولامە و گوتیان: گوێت لێ بوو کوڕەکەت چی گوت وەڵامی بدەو ئەبو دولامە گوتی زانیتان کە قسەی باشی بە دەمدا نایە! گوتیان ئەی وەڵامت چیە

گوتی: ئەوە دایکیم کرد بە حەکەم لە بەینی من و ئەودا، هەستن با بچین بۆلای، هەموویان هەستان و چوون بۆلای خێزانەکەی. ئەبو دولامە و باسەکەیان بۆ گێرایەوە. ئافرەتەکە ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: ئەو کوڕەم خوا تەمەنی درێژ بکا و بۆمان وەهێڵی ئامۆژگاری باوکی کردووە و درێغی نەکردووە، خۆ خۆتان دەزانن کە من زیاتر پێویستیم بەمانەوەی باوکی هەیە لەو ئەوەی ئەویش دەیڵێ، تا ئێستا لە ناو ئێمەدا تەجرەبە نەکراوە و نەبووە بەعادەت. ئەو لەپێشدا خۆی بخەسێنی، جا ئەگەر زانیمان ئەو ئیستیفادەی لێکردووە، با لەپاشان باوکیشی بخەسێنی. دەڵێ خەڵکەکە دەستیان کرد بە پێکەنین و هەستان بڵاوەیان لێکرد و سەریان لە پیسی ئەو کوڕ و باوک و دایکە سوڕمابوو.

*****

(ئەبو فەرەجی) ئیسفەهانی دەڵێ: کابرایەک لە (مەدینە) بەناوی (ئەبو سەدەقە)، زۆر ناسراو و دەنگ خۆش و زۆریش ڕووح سوک و هەروەها زۆر بە تەماح بوو. یەکێک لەو دەنگ خۆشانە بوو، کە هارونەڕەشید هێنانی بۆ بەغدا. دەڵێن: جارێک لۆمەی ئەو کابرایەیان کرد و گوتیان زۆر داوا لە خەڵک دەکەی، بۆتۆ زۆر عەیبە. لە وەڵامدا گوتی: هیچ عەیب نیە، چونکە ناوی ئەسڵیم (مسکینە) و شورەتم (ئەبو سەدەقە)یە و کچەکەم ناوی (فاقە)یە و کوڕەکەم ناوی (سەدەقە)یە. جا کێ وەک من شایانی ئەوەیە داوا لە خەڵک بکا؟

*****

دەڵێن: (موطیعی) کوڕی (ئیلیاس) زۆر قسەخۆش بووە. جارێک دیواری ماڵەوەیان دەڕوخێ. یەکێک لە دۆست و برادەرەکانی دەچێ بۆلای و دەڵێ: غەم مەخۆ، بۆخۆت سەلامەت بی، سوپاسی خوا بکە، بەس نیە بۆخۆت سەلامەت بووی؟ موطیع ڕوو دەکاتە دۆستەکەی و دەڵێ کاکە دەبێ ئەتۆ شوکر و سوپاسی خوا بکەی، چونکە دیوار ڕو خاندن دڵی تۆی ڕانەچڵەکاندووە و تۆزەکەی بە سەر تۆدا نەهاتووە و تۆ پارەی دروست کردنەوەی نادەی.

*****

لە گیلە پیاوێکیان پرسی: کەی لە دایک بووی؟ لە وەڵامدا تۆزێک ڕاما و گوتی: ڕۆژی سەری مانگ، نیوەی مانگی ڕەمەزانێ. سێ ڕۆژ پاش جێژنێ، جا چۆنی حیساب دەکەن و دەکاتە چەند ئەوە بۆ خۆتان دەزانن.

*****

کابرایەکی ئارەقخۆری عەرەب چووە مەیخانەیەک و هەموو پارەکەی دا بە ئارەق

و خواردیەوە. لەپاشان دزداشەکەی داکەند و دای بە ئارەق و بە ڕوتی مایەوە. (جۆخینێک) لە نزیک وێ بوو، لە سەرمان چووە ناو کایەکەوە. لەوکاتەدا پیاوێک بانگی دەکرد و دەیگوت ڕەحمەتی خواتان لێ بێ گایەکەمان دیار نیە، ئەتان دیوە؟ ئارەقخۆرەکە لە ناو کایەکەدا سەری دەرهێنا و ملی قووت کردەوە و گوتی: ئەی خوای گەورە یاخوا ئەو وەی بینی و بە منیشی بێڵێ و لێم نەستێننەوە. مەیخانەچیەکە گوتی: کوێرایت دایە، جا خوا چ بەتۆ بێڵێ؟ گوتی: ئەو کایە، چونکە ئەگەر خاوەنەکەی بێ و بیباتەوە لە سەرمان ڕەق دەبمەوە.

*****

مەلا مستەفای زورانی گوتی: ماڵمان چوو بووە (چیانە)ی لاجانێ و باوکم کە کۆلکە مەلا بوو، لە چیانە بوو بە مەلا و دەستی وەستاییشی هەبوو، مەشکەی داری دروست دەکرد. بەو مەشکەیان دەگوت (نیرە). گوتی: ڕۆژێک لەبەر دەرگا ڕاوەستابووم، کابرایەک هات. سڵاوی کرد و گوتی: ئەرێ کاکە ماڵی مەلا نیرەکەر کامەیە؟ مەلا مستەفا گوتی زانیم بە بابم دەڵێ، وەسەرخۆم نەهێنا و گوتم ئەوە ماڵەکەیانە.

*****

مەلا ئەحمەدی (گوزەڵ) لە دێیەکی ناو مەنگوڕان دەبێتە مەلا. ژنەکەی خەڵکی دێیەکی نزیک ئەو دێیە دەبێ، مەلا هەڵدەپێچی و دەڵێ: دەبێ بچین لەوێ مەلایەتی بکەی. خۆشتان دەزانن کە زوربەی مەلایان زۆر ژن خۆشەویستن. بەقسەی ژنەکەی بار دەکا و دەچێ لەوێ دەبێ بەمەلا. تەماشا دەکا زۆر لە دێیەکەی دی خەراپترە و پەشیمان دەبێتەوە. بەهاری داهاتوو، ڕۆژێک هەڵدەستی دەچێتەوە دێی پێشو. کاتێ دەگاتە ناو ئاوایی ئاغای دێ لەگەڵ چەند کەس لەسەر بانێک دەبن. مەلا ئەحمەد سڵاویان لێ دەکا و دەڵێ: ئاغا بە کەمتر لە پار. ئاغا مەنگوڕەکەش نایکاتە نامەردی و دەڵێ: دەڵێم مەلا تەڵاقم کەوێ زیاترت دەدەمێ، دەڵێم دابچن ماڵی مەلام بۆ بێننەوە. دەچن ماڵی مەلا بار دەکەن و دەیهێننەوە.

*****

کابرایەک ژنی بەسەر ژنەکەی هێنا. ژنە تازەکەی، کە بەلای ژووری ژنە کۆنەکەیدا دەڕۆیی دەیگوت:

وَما يَسْتَوِي الرِّجْلانِ رِجلٌ صَحيحَةٌ
وَأُخْرىٰ رَمىٰ فِيها الزَّمانُ فَشَلَّتِ
وَما يَسْتَوِي الثَّوْبانِ ثَوْبٌ بِهِ الْبِلىٰ

وَ ثَوبُ بِأَيدِ البا ئِعِينَ جَدِيدُ

یانی هەرگیز قاچێکی ساغ و قاچێکی شەل وەک یەک نین، یان لیباسێکی ڕزیو وەک ئەو پارچە قووماشە نیە کە بەدەست موشتەریانەوە بێ بە تازەیی. ژنە کۆنەکەش کە بەلای ژووری ژنە تازەکەدا دەڕۆیی، دەیگوت:

نَقِّل فُؤادَکَ ما استَطَعتَ مِنَ الهَویٰ
ما الحُبُّ إلاّ لِلحَبِیبِ الأَوَّلِ
کَم مَنزِلٍ فی الأَرضِ یَألَفُهُ الفَتیٰ
وَحَنِینُهُ أَبَداً لِأَوَّلِ مَنزِلِ

واتە دڵی خۆت بەو قسانە پڕ بکە لەخۆشی، ئەمن دەربەست نیم، چونکە پێت خۆش بێ یان ناخۆش، خۆشەویستی هەر بۆ خۆشەویستی یەکەمجارە و زۆر جێگا و مەنزڵ دەبنە دڵخۆشکەری ئینسانی گەنج، بەلام دڵ هەر بۆ یەکەم جێژوان لێ دەدا.

*****

یەک دوو ساڵ کە دەچووین بۆ حەج، پیاوێکی قەرەداغیمان لەگەڵ دەهات ناوی (حەمە زێدان) بوو، زۆر کوڕی چاک بوو. ساڵێک لەگەڵ قافڵەی حاجی شێخ ئەڵڵەی قەلادزەیی هات. لە مەدینە چاوم پێکەوت، دوای چاک و چۆنی گوتم حەمە چۆنی؟ لە وەلامدا گوتی: کوڕە مامۆستا بەدەست ئەو قەلادزەییانەوە گیرم خواردووە. قسەکانیان هەمووی جنێوە، گوتم چۆن جنێون؟ گوتی: دیتم یەکیان نوێژێ دابەست و ڕووی کردە ئەولایە، کەچی یەکیان گوتی: (عەمە) ئەوە قیبلە نیە، ڕوو بکە (کن) من، ڕوو بکە کن من، (کنگی) خۆی کرد بە قیبلە.

*****

(حەسەن ئەفەندی)ش لە گەڕەکی ئیسکان لە شاری سلێمانی دەیگوت: مامۆستا! ئەمن چەند ساڵ لە قەلادزێ مەئموری مالیە بووم، زمانەکەیان زۆرسەیرە. گوتم چۆن؟ گوتی بۆ نموونە ئەگەر یەکیان لە یەکێک بپرسی چەندی مانگە؟ دەڵێ: چەندی دەمانگێن؟ ئەو (حەسەنە فەندی)یە دەیگوت: بەلام مامۆستا، قەلادزەیی زۆر پیاو و نانخۆش و ئاقڵن. پیاوێکی عاقڵیان زۆرجار بەمنی دەگوت: حەسەنە فەندی؛ خوا عەقڵ بدا بە ئەولا دەکانت. دەیگوت مامۆستا تۆ دەزانی دوعاکەی گیرابووە، کوڕەکانم زۆر عاقڵن؟

*****

(حافظ)ێکی (گن) دەرسی بە منداڵێک دەگوت. دەیگوت: دەی ڕۆڵە بڵێ: (ئەنف)

سەر ئا، منداڵەکەش وەک مامۆستاکەی دەیگوت (ئەنف) سەر ئا. مەلا تورە دەبوو دەیگوت: هەتیوە زۆڵە مەڵێ (ئەنف) سەر ئا، بڵێ (ئەنف) سەر ئا. منداڵەکە دوبارە وەک مامۆستاکەی دەیگوت (ئەنف) سەر ئا. دیسان مەلا تورە دەبووە و دەیگوت: زۆڵە وەک من مەڵێ، (ئەنف) سەر ئا وەک خەڵک بڵێ (ئەنف) سەر ئا. مەلا لەباتی بڵێ: (ئەلف) سەر ئا، بەهۆی لووت گنییەکەیەوە دەیگوت (ئەنف) سەر ئا و منداڵەکەش وەک ئەوی دەگوتەوە.

*****

جارێک کابرایەکی میسری دەچێتە ولاتی مەغریب و دەچێ لە دوکانێک سێو بکڕێ، دەڵێ: (هَلْ عِنْدَكُمْ خَدُّ الْيُوسَفَ) ؟ ئایا ڕومەتی یوسفتان هەیە؟ گوایە لە میسر بە سێو دەڵێن: (خدالیوسف) کابرای دوکاندار لە وەلامدا دەڵێ: (ما عِنْدَنا خَدُّاليوسفِ، عِنْدنا خَصِيّ الْبِلالِ الْحَبَشى ) یانی (خدالیوسف)مان نیە، بەلام ( گونی) بیلالی حەبەشیمان هەیە. لە مەغریب بە باینجان دەڵێن گونی بیلالی حەبەشی.

*****

لە گەڕەکی ئیسکانی سلێمانی پیاوێک مەشهور بوو بە (ئەحە قومار). ناوی ئەسڵی ئەحمەد بوو. گوتی: مامۆستا لە زەمانی مەلیک دا باشچاوەشی پۆلیس بووم. ڕۆژێک پیاوێکی ئێرانی گیرابوو، گوتیان: دەبێ بیبەی لە پێنجوێن تەسلیم بە ئێرانی بکەنەوە. بردم، بەلام کابرا لە ڕێگادا زۆر پاڕایەوە و گوتی. کاکە مەردی چاک بە و پیاوەتیم لەگەڵ بکە، بەخوا بمدەنەوە بە ئێران ئیعدامم دەکەن. گەیشتینە خوار (ملەکەوە) و تەماشام کرد هەورامیەکی چوار گوێی تەشی بە کوڵ بە گۆرانی گوتن دەهاتە خوارێ. بە کابرای ئێرانیم گوت: خۆت فڕێدە خوارەوە و ڕاکە و مەترسە، کابرا ڕاکرد. هەورامی هات، گرتم و سوارم کرد بۆ پێنجوێن هەرچەند هاواری کرد گوێم نەدایە. کاتێ بردم بۆ مەرکەزی پێنجوێن زۆری هاوارکرد و دەیگوت: ئەوە ناوی من نیە و دەمگوت: درۆ دەکا ئەوە لە سلێمانیەوە تا ئێرە چەندجار ناوی خۆی گۆڕیوە. مامۆستا هەورامیمان تەسلیم بە ئێران کردەوە و کابرام ڕزگار کرد. جا قوربان خێرم نەگەیوە؟ گوتم کارێکی زۆر چاکت کردووە، چونکە هیچ لە هەورامیەکە ناکەن، بەلام بەداخەوە، ئەگەر ئێستا بوایە بە پارە دەیان فرۆشتەوە پۆلیسەکان.

*****

دەڵێن: کاتێ لەشکری ئیسلام هاتە سەر (خوسرەوی پەرویز) و لەوبەری دیجلە

هەڵیاندا، لە (تاقی کیسرا)وە ڕۆستەم بە دزیەوە یەک دوو جاسوسی نارد تا بزانن (ئەسحابە) چۆنن و چ دەکەن؟ کاتێ هاتنەوە گوتیان: ئەوانە کەسیان دەرەقەت نایە، چونکە بەیانی زوو کە هەڵدەستن لەپێش هەموو شتێکدا دەست دەکەن بە دار خواردن. تومەز بەیانی کە هەڵستاون (سیواک)یان کردووە و ئەوان وەیان زانیوە دار دەخۆن. جا دەڵێن: ئەوە تەسیری زۆر بووە بۆ شکانی سوپای ئێران و گرتنی تاقی کیسرا و بەدیل گرتنی خوسرەوی پەروێز.

*****

حاجی مەلا محەممەدی (چرچە قەلایی) پیاوێکی زۆر قسەخۆش بوو لە سلێمانی. فەقێ دەبێ لە خزمەت مامۆستا شێخ مستەفای قەرەداغی لە قەرەداغ. جارێک لە خزمەت شێخ مستەفا و جەنابی شێخ عبدالکریمی کرپچنەدا دەبێ. شێخ عبدالکریم دەزانی کە مەلا محەممەد زۆر قسەخۆشە، دەڵێ: باشە مەلا محەممەد ئەوە مامۆستا شێخ مستەفا مەلای چاکە و زۆر بەدینە و ئیجازەی چەندین مەلا و فەقێیی داوە و بەو هۆیەوە خوا ڕەحمی پێدەکا. خۆشت دەزانی کە ئەمن سەید و ئەولادی پێغەمبەرم و شێخی ئیرشادم و چەندین دەروێش و موریدم هەیە و ئومێدەوارم بەو هۆیەوە خوا عەفووم بکا. بەلام نازانم تۆ چ ئومێدێکت هەیە؟ لە وەلامدا دەڵێ قوربان تەنیا ئومێدی من ئەوەیە کە شێخم زۆر ناخۆش دەوێن، زۆرم ئومێد بە خوایە کە بەو هۆیەوە عەفووم بکا. مامۆستا شێخ مستەفا و شێخ عبدالکریم قسەکەیان زۆر پێخۆش دەبێ و زۆر پێدەکەنن.

هەرئەو مامۆستا مەلا محەممەدە گوتی: فەقێ بووم چووینە (سەنگاو) بۆ جومعانە و ڕاتبەی فەقێیان. ئێوارە بووینە میوانی ماڵێک و لە دوای ئێمەش دەستێک لۆتی هاتن و بوون بەمیوانی ماڵەکە. ماڵەکە ڕادیۆیان هەبوو. ڕادیۆکەیان کردەوە قورئانی دەخوێند و لەپاشان دەستی کرد بە گۆرانی. لۆتیەکە گوتی: مامۆستا، لەوەتی ئەو ڕادیۆ شکاوە پەیدابووە، نانی ئێمە و ئێوە براوە.

*****

دەڵێن: ڕێوییەک لە شێرێک دەترسا. ڕۆژێک گوتی: وەچاکە بە فێڵێک لە ناوی بەرم. تەماشای کرد بەردێک لەناو قەڵشتە شاخێکدا دیاربوو، وەک پارچە گۆشت دەچوو. هات بۆلای شێر و گوتی: گەورەم پارچە گۆشتێکی زۆر جوانم دیوەتەوە حەز دەکەم جەنابت دەری بێنی، گوتی زۆرباشە. ڕێوی وەپێشی کەوت و هاتن بۆلای قەڵشتە شاخەکە و گوتی گەورەم ئەوەتا. شێر خۆی بە کەلێنەکەدا کرد زۆر تەسک بوو، دەوێدا یاخی بوو، هەرچەند کردی خۆی بۆ ڕزگار نەکرا. ڕێوی گوتی: گەورەم

سەر بەرز وەکە، شێر سەری بەرز کردەوە توند لەبەینی کەلێنە شاخەکە گیرا. ڕێوی کە زانی تازە ڕزگاری نابێ، لە پاشەوەڕا دەستی کرد بە گۆشت پچڕینی سمتانی. شێر گوتی: ئەوە چ دەکەی؟ گوتی: خەریکم ڕزگارت دەکەم. شێر گوتی: جا خۆ دواوەم گیری نەکردووە ئەگەر ڕزگارم دەکەی لای سەرم ڕزگار بکە، گوتی ئاخر حەز ناکەم دەم و چاوی هاوڕێی خۆم ناشیرین بکەم.

*****

محەممەدی کوڕی سلێمانی عەباسی والی (بەسرە)، کوڕە مامێکی مرد بوو. قازی بەسرە و تەواوی گەورە پیاو و خەڵکی بەسرەی لەگەڵ بوو، دەچوونە سەر قەبران. لە نیوەی ڕێگادا شێتێک هاتە بەردەمی و گوتی: ئەوە عەداڵەتە تۆ ڕۆژی هەزار درهەمت هەبێ و منیش نیو درهەم دەست نەکەوێ؟ ڕووی کردە قازی و گوتی: جەنابی قازی ئەگەر ئەوە دادپەروەری بێ ئەمن ئیمانم پێ نیە. ڕۆیشتن گوێیان نەدایە. لە گەڕانەوەدا هاتەوە بەر دەم ئەسپەکەی والی و گوتی. ئومێدەوارم خێرت بەو ناوچاوانە جوانەوە بێ. قازی چووە پێشەوە و گوتی: ئەی پیسی بێعەقڵ بۆ لەپێشدا ئاوات نەگوت؟ شێتە ڕووی کردە قازی و گوتی بەخواو بە والیت سوێند دەدەم، پێم بڵێ ئەو ئایەتە لە چ سورەتێک دایە کە دەڵێ: (وَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ)؟ قازی گوتی: لە سورەی (برادت) دایە. شێتە گوتی: ڕاستە خوا و پێغەمبەر لەتۆ بەرین. والی ئەوەندە پێکەنی خەریک بوو لە ئەسپەکەی بەروە بێ.

*****

حاجی مەلا ئەحمەدی قازی پێنجوێنی دەیگوت: کوێرێک لە پێنجوێن بوو، پارشێوان دەیگوت چەندی شەو ماوە؟ دەیانگوت: چارەگێک، دەستی دەکرد بەخواردنەوە، لەپاش ماوەیەک دەیگوت: چەندی ماوە؟ دەیانگوت دە دەقیقە هەر دەیخواردەوە، تۆزێکی دی پێدەچوو دەیگوت: سەعات بۆتە چەند؟ دەیانگوت: پێنج دەقیقەی ماوە. دەیگوت پەرداخێکم ئاو بۆ بێنن. ئاوەکەی دەخواردەوە. دوبارە دەیگوت چەندی ماوە؟ دەیانگوت دوو دەقیقەی ماوە بەسە مەخۆوە.

لە وەڵامدا دەیگوت باشە، هەر لە ئێوە دەپرسم ئەگەر ئێواران دوو دەقیقەی ڕۆژ بمێنی و ئاو وەخۆم دەشکێ؟ دەیانگوت بەڵێ دەشکێ. دەیگوت جا باشە، خوا بەو هەمووە گەورەییەی خۆی لە دوو دەقیقەی خۆی خۆش نەبێ و ڕۆژوەکەم بشکێ، ئەی ئەمن دوو دەقیقەی بەیانی خۆمی بۆ دەدەمێ. تا مەلا دەڵێ (ئەڵڵە ئەکبەر) هەر دەخۆمەوە.

*****

حاجی مەلا ئەحمەدی قازی زۆر ئەدیب و شاعیر بوو. ڕۆژێک عەرزم کرد و گوتم مامۆستا خوا نەخواستە ئەوە ڕۆژێک جەنابت وەفاتی کرد ئەمن یادگارێکی تۆم لە لا نەبێ؟ پێکەنی و گوتی: جا چیت بدەمێ؟ گوتم دە وێنەیەکی خۆتم بۆ بگرە و یادگارێکی لەبن بنوسە. لەپاش دوو سێ ڕۆژ هاتەوە وێنەیەکی خۆی پێبوو، ئەی چوار خشتەکیەی لەبن نوسیبوو کە دەڵێ:

گەلا سەوزەکەی درەختی ژینم

زەرد بووە بۆیە خەریکی شینم

چەمیەوە بالای نەمامی باغم

بە بەفری پیری داخم سەت داخم

سبحانەللە دوای ماوەیەکی کەم وەفاتی کرد

*****

(مفتی زەهاوی) و والی بەغدا جارێک پێکەوە دادەنیشن و سەنیرێکیان لە بەیندا دەبێ. لە کاتێکا بە یەکەوە قسە دەکەن یەکێک لە ئاغا کوردەکانی لای سلێمانی دەچێ بۆلای والی و دەست دەکا بە قسە، والی تورە دەبێ و ڕوو دەکاتە مفتی زەهاوی و دەڵێ: فەرقی کورد و کەر چیە؟ والی هیچ بیر لەوە ناکاتەوە کە مفتی زەهاویش کوردە. مفتی زەهاوی لە وەڵامیدا دەڵێ: فەرقی بەینی کورد و کەر ئەی سەنیرەیە. والی تێدەگا و لە قسەکەی پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێ: قوربان عەفووم بکە ئەوەندە تورە بووم ئاگام لەخۆم نەمابوو.

*****

یەکێک لە ئاغا تورکەکانی لای نەشەدە، جارێک بە سواری دەچێ بۆ جێیەک. لە ڕێگادا زۆری سەرما دەبێ، نۆکەرێکی کوردی لەگەڵ دەبێ، پێی دەڵێ: دابچۆ سێ چوار (سۆفی) کۆ وەکە با ئاگرێک بکەینەوە، بە زمانی (ئازەری) بە (تەپاڵە) دەڵێن: سۆفی. کوردە زۆر زیرەک دەبێ، دەچێ زۆر دەگەڕێ و یەک دوو سلە گوی وشک پەیدا دەکا و دێتەوە دەڵێ: ئاغا زۆر گەڕام سۆفیم دەست نەکەوت، ناچار بووم ئەی یەک دوو مەشەدییەم هێنان. ئاغا تورە دەبێ و دەڵێ کەپێولی کورد.

*****

شێخ مەحمودی نەمر زۆر شۆخی باز بووە. جارێک فەقێیەک دەچێتە خزمەتی و دەڵێ قوربان هاتووم بمکەی بە مەلای ڕەمەزانی یەکێک لە دێیەکانت. شێخ بە گاڵتە دەفەرمووێ زۆرباشە، لەسەر قولە سورێت دادەنێم. فەقێ زۆر بێشەرم دەبێ و دەڵێ:

ئەی باشە قوربان بۆ لەسەر قولەڕەشت دامنانیی؟ شێخ زۆر پێدەکەنی و دەیکا بە مەلای سانگی ڕەمەزان. بۆ ئاگاداری قوولە سور و قولەڕەش ناوی دوو دێی شێخ دەبن.

*****

مەلا هیدایەتی قەرەداغی زۆر سۆحبەت چیە و خەلک زۆری خۆش دەوێ. جارێک زۆر حەزی لە (پەڕشە) دەبێ و بە پیاوێکی گالتەبازی دۆستی پێنجوێنی دەڵێ: هێندێکم پەڕشە بۆ بنێرە، پارەکەت بۆ دەنێرم. کابرا پەڕشەی بۆ دەنێرێ. زۆری پێدەچێ مەلا هیدایەت پارەکەی بۆ نانێرێ. کابرا وەلامی دەداتێ پارەی پەڕشەکەی بۆ بنێرێ. مەلا هیدایەت لە وەلامدا بۆی دەنوسی و دەڵێ:

پەڕشەت بۆ ناردم خستمە سەر کیرم    گەر پارەم نەبێ گووت بۆ بنێرم؟

کابراش لە وەلامدا بۆی دەنوسی و دەڵێ:

ئەوەڵلە، بۆم ناردی بیخە سەر قنگت

بیکە بە دەمتا بە هەردوو چنگت

*****

حەزرەتی عومەر خوای لێ ڕازی بێ نەهی کرد بوو لەوەی کە ئاو لەگەڵ شیر تێکەڵ بکەن و بیفرۆشن. شەوێک لەناو شاری مەدینەدا دەگەڕا، گوێی لە ئافرەتێک بوو بە کچەکەی دەگوت: ئەوە بۆ ئاو دەشیرەکە ناکەی ئەوە ڕۆژ بۆوە؟ کچەکە گوتی: ئاخر دایە گیان حەزرەتی عومەر نەهی لێکردووە چۆن ئاوی تێکەم؟ دایکەکەی گوتی: ڕۆلە هەموو کەس ئاوی تێدەکا، ئەتۆش وەک ئەو خەلکە، حەزرەتی عومەر چیزانی. کچە گوتی: دایە خۆ ئەگەر حەزرەتی عومەریش نەزانی، خوای گەورە دەزانی. مادام نەهی لێکرابێ قەتی تێناکەم.

حەزرەتی عومەر قسەی کچەکەی زۆر وەبەر دلی دەکەوێ. بەیانی بە (عاصمی) کوڕی دەڵێ: کوڕم بچۆ فلان گەڕەک و فلان مال و پرسیار لە کچی مانخە بکە و بزانە کچی کێ یە، کاتێ عاصم چوو پرسیاری کرد گوتیان ئەوە لە تایفەی بەنی هیلالیانە. هاتەوە عەرزی باوکی کرد. حەزرەتی عومەر فەرمووی: کوڕم ئەو کچە بخوازە، لە ئەولادی وی کوڕێک دەبێ لەناو عەرەباندا ناوبانگ دەردەکا و زۆر پیاوچاک دەبێ. عاسم کچەکەی مارە کرد و دوای نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ کچێکی بوو. کاتێ گەورە بوو، عەبدولعەزیزی کوڕی مەڕوان داوای کرد و دایانێ و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لەو کچە لە دایکە بوو.

*****

دەڵێن: ئەمڕۆژەی کە ئەبو جەعفەری مەنسور بوو بە خەلیفە، (موقاتیل)ی کوڕی سەلمان چووە مەجلیسەکەی، ئەبو جەعفەر گوتی: قوربان ئامۆژگاریم بکە. لە وەڵامدا گوتی: ئامۆژگاریت بەو شتانە بکەم کە لە ژیانی خۆمدا دیومن یان بیستومن؟ مەنسور گوتی: بەوانەی دیوتن. موقاتیل گوتی: ئەی ئەمیری موسوڵمانان عومەری کوڕی عەبدولعەزیز یازدە ئەولادی لەپاش بەجێ مابوو. کاتێ وەفاتی کرد هەژدە دیناری لەپاش بەجێ ما. پێنجیان دان بە کفن و چواریان بە قەبر و حەوت دیناریان بوونە میرات بۆ واریسان. بەڵام کاتێ هیشامی کوڕی عەبدولمەلیک وەفاتی کرد، بەشە میراتی یەکێک لە چوار ژنەکانی هەشتا هەزار دیناری نەغد بوو، بەبێ بەشە میراتی لەناو ماڵ و باغ و باغاتدا. سوێند بەخوا، کوڕێکی عومەری عەبدولعەزیزم دی لە یەک ڕۆژێکدا سەت وشتری بار کردبوو بۆ غەزا و کوڕێکی هیشامیشم دی لەسەر ڕێگایەک سواڵی دەکرد، ئەوەیە عاقیبەتی دنیا، ئاگات لە خۆت بێ.

*****

لەو ساڵانەی شۆڕشی گەلانی ئێراندا مامۆستا مەلا ڕەحیمی عەباسی ڕۆژێک لە گوندی (قوزلوێ) دەچێ دەستنوێژ هەڵگرێ. بە شەپۆلی مەلا ڕەسوڵی پێشنماز دەڵێ دابزانە ئاودەستی چۆڵ هەیە. شەپۆل پێیاندا دەڕوا هەموو ئاودەستەکان پڕ دەبن. دەڵێ: مامۆستا هیچیان خاڵی نین. مامۆستا بۆخۆی پێیانەوە دەڕوا لە هەر ئاودەستێک دەدا کابرا دەڵێ: ئەح. ئاودەستی ئاخریان لەگەڵ ئەحەکەشدا تڕێک بەردەدا. مامۆستا دەڕوا و دەڵێ: جا کاکە بۆوا قەڵسی؟

*****

دەڵێن: کابرایەکی عەرەب ئەو ئایەتەی سورەی (الذاريات)یان لەلا خوێندەوە کە دەفەرمووێ: (فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنْطِقُونَ) یانی سوێند بە خوای عەرز و ئاسمان ئەوە حەقە، هەر وەک ئێوە قسە دەکەن. کابرای عەرەب گوتی. (سبحانَ اللّه) دەبێ کێ خوای ئەوەندە تووڕە کردبێ تا مەجبوور بێ سوێند بخوا.

*****

ڕۆژێک قوتابییەک دەچێتە لای کتێبفرۆشێک کتێب بکڕێ بۆ سەعی تێداکردن. کتێبفرۆشەکە کتێبێکی دەداتێ و دەڵێ: کاکە ئەو نووسخە کتێبە بکڕی نیوەی ئیمتیحانەکەت بۆ ئاسان دەکا. قوتابییەکە دەڵێ: دە مامۆستا دوو نووسخەم بدەیێ با هەموو ئیمتیحانەکەم بۆ ئاسان بکا.

*****

پێشینیان گوتویانە: دەبێ لە قەدەر بەرەی خۆت پێ ڕاکێشی. دەڵێن لە شاری بەغدا پیاوێک بە (ئەبو عبداللەی ڕیش) بەناوبانگ بوو، سەر و سیمایەکی زۆر جوانی هەبوو، بەڵام عەوام و نەزان بوو. ڕۆژێک تەماشا ئاوێنە دەکا و لەبەر خۆیەوە دەڵێ: ئەو سەر و سیمایەی من بۆ مەلایەتی باشە. دێتە بەردەرگایماڵەکەی و حەسیرێک ڕادەخا و لەسەری دادەنیشێ. زۆری پێناچی دراوسێکانی لێ کۆدەبنەوە. لەوکاتەدا پیاوێک بەوێدا دێ، چاوی بەو سەر و سیمایە دەکەوێ وەدەزانی مەلایە، دێ دەڵێ: مامۆستا ئەگەر یەکێک بەڕۆژو بێ و دەست بە کونە لووتی دابکا و خوێنی ڕاسێ، دەبێ چی بکا؟ لە وەڵامدا دەڵێ: کەڵە شاخ بگری. کابرا زۆری بەلاوە سەیر دەبێ و دەڵێ: بۆ جەنابت دوکتۆری لێرە دانیشتووی یان مەلای؟

*****

(حەجاجی سەقەفی) ڕۆژێک لە مەجلیسێکدا دەڵێ: بەخوا بە گوێرەی ئایەتی قورئان ئیطاعەی من لە ئیطاعەی خوا فەرزترە. چونکە خوا لە ئایەتێکدا دەڵێ: (إِتَّقُوا اللّٰهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ) یانی لەقەدەر تواناتان تەقوای خوا بکەن، بەڵام سەبارەت بە ئیطاعەی وەلی ئەمر فەرموویەتی: (وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا) واتە گوێ بگرن و ببیەن و ئیطاعە بکەن. کە وایە ئەگەر بە کەسێکم گوت لەو دەرگایە بچووە ددر و بەقسەی نەکردم دروستە بیکوژم. بەڵام ئەو لەبەر مەغروریانی ئایەتەکەی بەهەڵە مانا کردووە، چونکە ئایەتی دووهەم وا نالێ، دەڵێ: گوێ لە ئامۆژگاری بگرن و بێ ئەمری خوا مەکەن یان بەمانایەکی دی، یانی فەرمانی خوا و پێغەمبەر وەرگرن و لە قسەیان دەرمەچن.

*****

هەر لە شاری بەغدا پیاوێک مەشهور بوو بە (ئەبو کەعب)ی حیکایەت خوان. ئەو پیاوە حیکایەت و نەزیلە و قسەی خۆشی زۆر دەزانی، بەڵام زانا نەبوو. ڕۆژان عادەتی وابوو لە دوای نوێژی جەماعەت دەچووە مزگەوت و لە گۆشەیەکی (میحراب دەستی دەکرد بە حیکایەت و قسەی خۆش و خەڵک دەورەی دەدا. ڕۆژێک (نۆکێنە)ی زۆر خوارد بوو، چوو بۆ مزگەوت. مەلای مزگەوتەکە پیاوێکی پیری کز لاواز بوو، لە دوای سلاوی نوێژ، مامۆستا عەباکەی بەسەر سەری خۆی دادا و چو لە لایەکی میحرابە کە دەستی کرد بە تەسبیحات لەبەر خۆیەوە. کابرای حیکایە خوان پیاوێکی چوار شانەی سەر و سیما جوانی قەڵەوی عەبا بەشان بوو، چ میحرابەکەوە و پشتی کردە بەردەمی مەلا و دەستی کرد بە حیکایەتان. زۆر

نەخـایاند سگی (بای) کـرد ویسـتی هەرچۆنێک بێ بایەکـە لە سگی خـۆی دەرکـا و دەنگی لێوە نەیە. لە ناوەڕاستی حیکایەتدا گوتی: ڕەحمەتی خواتان لێ بێ لێک ڕا بڵێن (لاالەالاللە) بە دەنگی بەرز. خەڵکەکە بە توونـد گوتیـان: (لاالەالاللە) و ئەو بە سپاوی فسێکی کەند و میحرابەکەی پڕکرد لە بۆگەن. مەلا بۆنی کرد، بەڵام وەسەر خـۆی نەهێنا. دوبارە سگی کـابرا بای کـردەوە و تینـی بۆ هێنایەوە، کـابرا دوبارە گوتی: بە دەنگی بەرز بڵێن (لاالەالاللە). خەڵکە کە گوتیان و ئەو لەسەرەخۆ فسێکی کەند و لووتی مـەلای پڕ کرد، ئەوجارە مەلا ناچار بوو لووتی خـۆی گرت، نەیدەزانی چ بکات، ئەگـەر هەناسـەی بدایە بۆگـەن دەیکوشـت و ئەگـەر هـەناسـەشـی نەدایە لە داخان دەمرد، بەڵام هەرخۆی ڕاگرت.

کـابرا ئـەوەنـدەی (نۆکـێنـە) خـوارد بوو دوبارە تینـی بۆ هـاتەوە و وەجـوڵەجـووڵ کەوتەوە، ناچار بو گوتی بڵێن (لاالەالاللە). مەلا ئەوجارە خۆی بۆ ڕانەگیراو سەری لە میحـراب و عـەباکەی هێنایەدەر و گوتی: بابـە مەڵێن (لاالەالاللـە)، ئەو پیاوە منی کوشت بە بۆگـەن، بۆیە وا دەڵێ تا تڕ بکـەنی. ڕووی کردە کابرا و عـەباکەی گـرت و گوتی. ئەرێ کابرا تۆ هـاتووی تڕ بکـەنـی یان حیکایەتان وەگێڕی؟ کـابرا لەسـەرەخـۆ گوتـی: مامۆسـتا بۆ حـیکایەت گێڕانەوە هـاتووم، بەڵام ئەگـەر بەڵاش نازڵ بوو، دەبێ سەبری لەسـەر بگرێ. خەڵکەکە دەستیان کرد بە پێکەنین و هـاتنە دەرێ و بڵاوەیان لێکرد.

*****

مـامۆسـتـا مـەلا یەحـیـای بانەیی زۆر زانا و بەدین بووە. قـەت تـەمـاشـای ئافرەتی نامـەحـرەمی نەکردووە. ڕۆژێک دێتـەوە مـاڵ و دەڵێ: مـەلا ژن بەخـوا ئـەمڕۆ تووشـی ئافرەتێکی بێشـەرم بووم. مەلا ژن دەڵێ چۆن؟ مەلا یەحیـا دەڵێ ئەمڕۆ لەسـەر چەقی ڕێگا ئافرەتێک پرسیاری شـەرعی لێکرد‌م و هیـچ شـەرمی نەدەکرد. مەلا ژن دەڵێ: بۆ نەتناسـی؟ دەڵێ ناوەڵڵە، مەلا ژن دەڵێ کوڕە خۆ ئەمن بووم.

هەر لەو بابەتە، ڕۆژێک لە خزمەت مامۆستا مەلا حوسێنی دەشتێوی بووین لەگەڵ مـەلا مـەجـیدی مـزگـەوتی سـەلاحـەدین لە حـوجـرەکـەی مـامـۆسـتـا لە مـزگـەوتی پیرەمەگرون لە سلێمانی، مەلا مـەجید باسی ئافرەتی لینگ ڕووتـی کرد. مـامۆستا فەرمووی: بۆ مەلا مەجید سلێمانی ئافرەتی لینگ ڕووتی لێ یە؟ مامۆستا ئەوەندەی نەڕوانی بوو بیان بینی.

*****

دەڵێن ڕێوی زۆر حـەز لە گۆشـتـی (ژشـک) دەکـا، بەڵام ئەوەندە زۆرزانە هـەرکـاتێ

چاوی بە ژشک کەوت لەبەر زۆری و تیژی دڕکەکانی بە هەرجۆرێک بێ دەیخاتە سەرپشت و میزی بەزگی دادەکا، هەر لەبن کلکی را تا سەر لەغاوانی بە میز شەلالی دەکا و ژشکەکە چوار پەلان داوێ و ڕێوی دەستدەکا بە خواردنی.

*****

جارێک لە (شێتێک) دەپرسن: چ لە هەموو شتێک بەلەزەت ترە؟ لە وەلامدا دەڵێ ئێوە قەت گرویێ بوون؟ دەڵێن نا، دەڵێ: بەلەزەتترین شت ئەوەیە گروێ بی و خۆت بخورێنی.

*****

دەڵێن: جارێک پیاوێک لە ڕێگایەکدا تووشی پیاوێکی ڕژد و بەخیل دەبێ و کابرای بەخیل دوو سەگی پێ دەبێ. کابرا دەڵێ: خالە لەو دوو سەگانە یەکیا ن بدە بەمن. خاوەن سەگ دەڵێ: کامەت دەوێ؟ دەڵێ سەگەڕەش. خاوەن سەگ دەڵێ سەگە ڕەشەکەم لە سپیەکە خۆشتر دەوێ، ئەوت نادەمێ. کابرا دەڵێ دە سەگە سپیەکەم بدەیە، دەڵێ: ئاخر سپیەکە م لە هەر دووکان خۆشتر دەوێ چۆنت بدەمێ؟

*****

جارێک کابرایەکی عەرەب دەست دەکا بە دەستنوێژ هەلگرتن. دەم و چاوی پاک دەشوا و باسکانی دەشوا و مەسحی سەری دەکا و قاچی ڕاستی تا بەلەکی دەشوا و هەلدەستی بچێ نوێژ بکا. دەڵێن خالە خۆ قاچی چەپت نەشت. لە وەلامدا دەڵێ: ئاخر لەبەر ئەو فەرمایشەی پێغەمبەر نەمشت کە فەرموویەتی: (يُحْشَرُوا أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ) یانی ئوممەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا لە کاتێکدا حەشریان دەکرێ، دەم و قاچیان بەهۆی ئاوی دەستنوێژەوە وەک بەفر سپی دەبێ. جا ئەمن بۆیە هەر قاچی ڕاستم شت تا لە بەرانبەر قاچی چەپمدا زۆر سپی دیار بێ.

*****

مەلا ڕەحیمی (سیسیری) کوڕێکی زۆر گەنجی جوانی زیرەکی خەت خۆش بوو. لە فەقێیەتیدا شێت بوو. لە شێتیەکەیدا قسەی خۆشی زۆر دەکردن. جارێک دەیبەن بۆ خزمەت شێخی (بێژوێ) و مامۆستا مەلا محەممەدی کوڕی شێخی کە پیاوێکی زۆر ڕووخۆش و زانا و مویارەک بوو، بە مەلا ڕەحیم دەڵێ: دەی مەلا ڕەحیم ناوی ئەجندەکان بڵێ: مەلا ڕەحیم دەڵێ بەڵێ زۆر باشە، قەلەم و قاقەز بەدەستەوە بگرە هەتا ناویان بڵێم. مامۆستا مەلا محەممەد قەلەم و کاغەز بەدەستەوە دەگری و دەڵێ دەی مەلا ڕەحیم بڵێ تا بیانوسم. مەلا ڕەحیم دەڵێ. حەزرەتی (غوەس) حاجی

کاکە(ئەحمەدی شێخ)، شێخی (بیارە)، شێخە مینی (بیژوە). مامۆستا مەلا محەمەد پێدەکەنی و دەڵێ: مەلا رەحیم بەتەنیشە ناسیمن.

*****

رۆژێک مەلا رەحیم لە سەردەشتێ بوو لە حوجرەی فەقێیان. جەنابی مامۆستا (قازی) کە مامۆستامان بوو تەشریفی هات بۆ دەرس، مەلا رەحیم رووی کردە جەنابی قازی و گوتی جەنابی قازی پرسیارێکت لێ دەکەم، ئەگەر زانیت دەڵێم مەلای چاکی، قازی فەرمووی: دەی مەلا رەحیم بزانم دەڵێی چی؟ مەلا رەحیم گوتی: (قل) لە (قل هوالله)دا مانای چیە؟ قازی بۆی مانا کرد، مەلا رەحیم گوتی نەتزانی. قازی فەرمووی: ئەی مانای چۆنە؟ مەلا رەحیم لەسەرەخۆ گوتی: قوربان ئەوە سێ مانای هەیە، خوای گەورە دەڵێ: جەنابی قازی رووت وەک (قوول) یان وەک (قەل) یان وەک (قیر) رەش بێ. مامۆستا قازی زۆر پێکەنی و گوتی بەڵێ باوابێ.

*****

فەقێکان مەلا رەحیمیان دە حوجرەیەک کردبوو بۆ ئەوەی نەڕوا. کاتی جەماعەتی نوێژی مەغریب، خەتیبی مزگەوتی سور ئیمام بوو لەسەر تاتەکانی پێش حەوزەکەی حەوشە جەماعەتیان دەکرد. لە ناکاو مەلا رەحیم دەرپەڕی و بەردێکی بە دەستەوە گرت و چوو لەو سەری سەفی جەماعەتەکە راوەستا و خۆی راست و چەپ کرد و گوتی: دەڵێم بابیان بگێم، مێشێکیان لێ بکەم؟ چەند کەس لە جەماعەتەکە بە پێکەنینەوە رایان کرد و لەترسان نوێژەکەیان بڕی. بەڵام بەخۆشیەوە ئێستا مەلا رەحیم زۆر باشە و لەناو گەورکاندا مەلایە.

*****

ئەمن و حاجی مەلا سەید رەشید و مەلا ئەحمەدی گزڕەڵ و مەلا مستەفای شێختانی و سەلا مستەفای زێرانی لە شاری سەردەشتێ لە خزمەت جەنابی قازی عەلی دا فەقێ بووین. عادەتی فەقێیان وا بوو ئەگەر شتێکی خۆش، یان گۆشت هەبایە، بەشیان دەکرد و هەرکەس بەشی خۆی هەڵدەگرت. شەوێک مام رەسوڵی کوڕی کوێخا حەسەنی (هەڵوێ) میوان بوو، پیاوێکی زۆر سۆعبەتچی و زۆر لەگەڵ مەلا و فەقێیاندا تێکەڵ بوو. کاتێ نان دانراو گۆشت بەشکرا، مام رەسوڵ دەستی برد بەشی فەقێیەکی رفاند و لەگەڵ فەقێکەدا لێیان بوو بە هەرا، فاقێکە گوتی: ئەمنت پێ کەرە؟ مام رەسوڵ گوتی ئەرێ وەڵڵە، خولاسە بوو بە کێشەیان. هەر فەقێکە دەیگوت ئەتۆ کەری و مام رەسوڵیش دەیگوت: ناوەڵڵە ئەتۆ کەری. ئاخری مەلا سەید رەشید گوتی: بابە کێشە مەکەن، خۆ ئێرە شارە و قازی و شەرع و

قانونی لێ یە، گوتی مەلا محەممەد هەستە بیان بە بۆ خزمەت قازی با شەرعی ئەو دوو کەرە بکا. هەستام بردمن بۆ مالّێ قازی و ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە و گوتم: هێناومن بۆ شەرعی. مامۆستا قازی زۆر پێکەنی و فەرمووی: مەلا محەممەد لە ناو فەقێ یاندا ئەو فەقێیە و لە ناو عەواماندا ئەو مام ڕەسوڵە لە هەموو کەس کەرترن. گوتم قوربان ئێمە ئەوە دەزانین، هاتووینە خزمەتت تا بزانین لەو دووانە کامەیان کەرترن؟ کێشەکە لەسەر ئەوەیە. قازی ئەوەندەی دی پێکەنی و گوتی: ئەو فەقێیە لەو مام ڕەسوڵەش کەرترە، گوتم: قوربان جا دەبێ شتێکی لەسەر بنوسی، دەنا کێشەکەیان نابڕێتەوە، قازی دەستی دایە قەڵەم و نوسی و ئیمزای کرد، کە تەماشام کرد نوسیبووی (هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ) یانی ئایا ئەوانەی زانان وەک نەزانەکان وان؟ نوسیبووی جا لەبەر ئەوە دەبێ ئەگەر مەلا و فەقێ کەریش بن لە خەڵک کەرتر بن.

*****

دەڵێن: (خەتیبێک) چووە سەر مینبەر و دەستی کرد بە خوتبە خوێندنەوە و لە خوتبەکەیدا گوتی: ڕەحمەتی خواتان لێ بێ تا دەتوانن خۆتان لە خەراپە بپارێزن و زۆر لە خوا بترسن و بێ ئەمری خوا مەکەن. چونکە خواوەندی گەورە ڕازی نابێ عەبد و بەندەی گوناح بکەن، خوا غەزەبیان لێ دەگرێ. گوتی نابینن کە خوا لەسەر وشترێک کە دوو سەت درهەمی نەدێنا، چی لە قەومی حەزرەتی (سالح) پێغەمبەر کرد؟

*****

لە باسی حەسادەتدا دەڵێن: خواوەندی گەورە وەحی کردووە بۆلای حەزرەتی مووسا و فەرموویەتی: یا مووسا دەزانی بۆچی ڕزقی ئینسانی ئەحمەق و بەخیل دەدەم؟ لە وەلامدا دەڵێ: ئەی خوای گەورە نازانم. خوا دەفەرموێ: بۆ ئەوەی تا ئینسانە عاقڵەکان بزانن کە تەڵەبی ڕزق و ڕزقی زۆر بە هەوڵدانی زۆر و بە عەقڵ نیە.

*****

جا هەرلە باسی بەخیلی و ئەحمەقیدا دەڵێن: سێ کەسی حەسود و ئەحمەق و بەخیل بوونە هاوڕێ. لە بەینی قساندا یەکێیان بە دووەمی گوت: دەرەجەی حەسادەتەکەت چەندە؟ لە وەلامدا گوتی: قەت پێمخۆش نەبووە چاکە لەگەڵ کەسدا بکەم. دووەمەکە گوتی: بەڕاستی تۆ زۆر پیاوی چاکی. یەکەمەکە گوتی: بۆ ئەتۆ چۆنی؟ دووەمەکە گوتی: ئەمن قەت پێمخۆش نەبووە کە قەت کەس چاکە لەگەڵ

کەسدا بکا. ئەوەی سێیەم وەدەنگ هات و گوتی: کوڕە بابە، بەڕاستی لە دنیادا کەس لە ئێوە چاکتر نیە. گوتیان بۆ ئەتۆ چۆنی؟ لە وەلامدا گوتی: ئەمن قەت پێمخۆش نەبووە کەس چاکە لەگەڵ خۆشمدا بکا.

*****

هەر لەباسی بە خیلیدا دەڵێن: (ئەبو ئەسوەد) ئەوەندە بەخیل بووە، جارێک لەکاتی نان خواردندا عەرەبێک دەچێ سلاوی لێ دەکا، ئەبو ئەسوەد وەلامی دەداتەوە و بێ ئەوەی فەرمووی بکا، دەست دەکاتەوە بەخواردن. کابرا دەڵێ: بەلای ماڵ و منداڵەکانتدا هاتم زۆر باش بوون. ئەبو ئەسوەد دەڵێ: کاتێ خۆشم هاتم هەر زۆر باش بوون، دیارە رێگات بە ویدابووە. کابرا گوتی. ژنەکەت حامیلە بوی، ئەبو ئەسوەد گوتی: دەزانم. کابرا گوتی: منداڵی بوو. لە وەلامدا گوتی: بەڵێ حامیلە دەبێ هەر بزێ. کابرا گوتی: دوو کوڕی بە سەرێکەوە بوو. ئەبو ئەسوەد گوتی: دایکیشی هەر بە جوتیلە دەزا. کابرا گوتی: بەلام کوڕێکیان زۆر نەژیا مرد. ئەبو ئەسوەد گوتی: ئاخر بەشی دوو منداڵی شیر تێدانەبووە. کابرا گوتی: کوڕەکەی دیش مرد. ئەبو ئەسوەد گوتی: ئاخر پێی خۆش نەبووە دوای براکەی بژی. کابرا گوتی: دایکیشیان مرد. ئەبو ئەسوەد گوتی: ئەوە لە تاوانیان مردووە. کابرا گوتی: یارەبی ئەو نانەت بە ژەهری مار بێ. ئەو هەموو موسیبەتە کاریان تێ نەکردی. لە وەلامدا گوتی: خۆ ئێوایە تووڕەش دەبێ.

*****

ئەو چەند شیعرەی (ابن الرومی) زۆر جوانن بۆیە نوسیمنەوە:

وَلِی مَنْزِلُ آ لَیْتُ اَنْ لا أ بیعَهُ
وَ ا نْ لا أریٰ غَیْرِی لَهُ ا لّدهْرَ ما لِکا
عَهَدْ تُ بِهِ شَرْ خَ الشّبا بِ وَ نِعْمَهً
کَنِعْمةِ قومٍ أ صْبَحوُا فی ظلا لِکا
فَقَدْ اَلِفَتْهُ النّفسُ حَتیٰ کأَنّهُ
لَها جسدُ اِنْ غا بَ عوُ رِ زْ تُ ها لِکا
وَحبّبَتْ اَوْطا نَ الرِجالِ اِلَیْهِم
مآ ر بُ قَضّاها الشّبابُ هنا لِکا
اِ ذا ذَ کَروْ اوْطا نَهُمْ ذَکَرَتْهُمُ
عهو دُ الصِّبا فیها فَحنوّا لِذا لِکا

*****

خەتیبی خانەقای مەولانا خالید بووم لە شاری سلیمانی، لە پێش جومعەدا حوجرەکەم پڕ دەبوو لە مەلا، ڕۆژێک باسی حەلاڵ و حەرامی ئەو گۆشت و مریشکانە دەکرا کە لە وڵاتانەوە دەهات، یەکێک لە مامۆستاکان کە پێمخۆش نیە ناوی بەرم، گوتی: کورە ئەوە دەڵێن چی؟ ئەوەی لە لای خۆمان سەری دەبڕن زۆر لەوان خەراپترە، دوێنێ چوومە قەسابخانە سەروپێ بکڕم، تەماشام کرد هەمووی حەرام بوو، خەراپیان سەر بڕیبوون، سەرو پێکەم بۆ نەکڕان، ناچار بووم هاتمەوە دوو کیلۆم گۆشت کڕی، منیش بە پێکەنینەوە گوتم: جا باشە مامۆستا گۆشتەکەش هەر هی ئەو سەروپێیانە نەبووە؟ چۆن ئەوان حەرامن و گۆشتەکە حەڵاڵە؟ مەلاکان دەستیان کرد بەپێکەنین.

*****

مەلا عومەری (مۆریاسی) گوتی: لە شارەزوور مەلا بووم، کابرایەکی جاف هات گوتی: مامۆستا زاری گورگیم پێ بڵێ، گوتم باشە، لە دووای (بسم الله) گوتم: بڵێ (وَ الشَّمْسِ وَ ضُحَاهَا)، ئەمرۆژە ئەوەندەم فێر کرد. ڕۆژی دوایی هاتەوە و گوتم بڵێ: (وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا)، ئەو ڕۆژەش ئەوەندە فێر بوو. ڕۆژی دوایی هاتەوە گوتم بڵێ (وا لنهار ا ذا جلها)، بۆ بەیانی هاتەوە گوتم بڵێ (وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا)، ڕۆژێکی دی هاتەوە، گوتم بڵێ (والسماءِ وَ ما بَنٰها). بۆ بەیانی هاتەوە، گوتم بڵێ (وَالأرْضِ وَ ماطَحٰها). گوتی مامۆستا بم وەسەدەقەت بەسە، نامەوێ فێری بم. گوتم بۆ؟ گوتی: بەخوا مامۆستا وادیارە خواش بە دەست گورگەوە تووش بووە، ئەوە نیە هەر دەڵێ ها لەوێ، ها لەوێ، بە خوا ئەی هات و هاوارە بەمن ناکرێ، ها ئەوە خۆت و زاری گورگی خۆت چۆنی دەبەستی بیبەستە.

*****

جارێک پێشمەرگەیەکی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە خۆشناوەتی دەچێتە ماڵێک. دوای سلاو و بەخێرهاتن، ژنی خاوەن ماڵ دەڵێ: کاکی پێشمەرگە دەبەرت مرم، دایک و باوکت ماینە؟ پێشمەرگەکە بە پێکەنینەوە دەڵێ دایە گیان هەر دایکم ماینە، باوکم ماین نیە ئەسپە.

*****

قازی (ئییاس) زۆر زیرەک بووە. دەڵێن: جارێک لە جێگایەک بوو، لە ناکاو ڕوداوێک ڕوویدا. ئەوانەی لەوێ بوون زۆر ترسان. سێ ئافرەت لە تەنیشت یەک دانیشتبوون، قازی نەیدەناسین. قازی گوتی: ئەو سێ ئافرەتە، یەکێکیان منداڵی لە زگ دایە و یەکێکیان منداڵی لەبەرە و یەکێکیان کچە. گوتیان: جەنابی قازی، چووزانی

کە بەمجۆرەن؟ لە وەڵامدا گوتی: ئاخر لەکاتی ترسدا ئینسان دەست لەسەر خۆشەویسترین شتی دادەنێ. یەکەمیان دەستی لەسەر سگی دانا، بەوەڕا زانیم کە حامیلەیە. دووەمیان دەستی لەسەر مەمکی دانا، زانیم منداڵی لەبەرە. سێیەمیان دەستی بەبەر خۆیەوە گرت زانیم کچە. کە پرسیاریان لێکردن وا بوون.

*****

دەڵێن. جارێک جوولەکەیەک غەیبەتی موسوڵمانان دەکا و دەڵێ: بەڕاستی موسوڵمان زۆر ئەحمەقن. بڕوایان وایە کە لە بەهەشتدا شت دەخۆن، بەڵام داینانێنەوە. قازی دەڵێ: بۆ ئەتۆ ئەوەی دەیخۆی هەمووی دادەنێیەوە؟ دەڵێ نا چونکە خوای گەورە هێندێکی دەکاتە قووتی لەش و گیان. قازی دەڵێ: کەواتە ئەتۆ ئەحمەقی کە ئینکاری ئەوە دەکەی کە خوای گەورە لە بەهەشتدا هەمووی بکا بەقووت.

*****

(بیشری حافی) کە یەکێکە لە ئەولیاکان، کوڕی پیاوێکی زۆر بەدەسەڵات بووە، لە تەمەنی لاویدا زۆر خۆشی ڕابواردوە. دەڵێن: هۆی تۆبە کردنی ئەوە بووە، ڕۆژێک بە کۆڵانێکدا دەڕوا، چاوی بە پارچە کاغەزێک دەکەوێ، هەڵیدەگریتەوە، تەماشا دەکا، ناوی خوای لێ نووسراوە. پاکی دەکاتەوە و دەیبا دەیخاتە ناو کونە دیوارێکەوە. شەوێ خەون دەبینێ و لە خەویدا پێی دەڵێن: ئەی بیشر تۆ ناوی منت پاک کردەوە، ئەوا منیش ناوی تۆم لە دنیا و قیامەتدا پاک کردووە. بەیانی کە لە خەو هەڵدەستێ دەست لە هەموو شتێک هەڵدەگری و تۆبە دەکا. هۆی ئەوەش کە بە بیشری حافی، واتە پێخواس ناسراوە ئەوەیە. ڕۆژێک دەچێتە لای پێڵاودرووێک و داوای قەیتانێکی لێ دەکا، بۆ نەعلەکەی. کابرا بە توڕەییەوە دەڵێ: ئای چەندو داوا لە خەڵک هەیە؟ بیشر نەعلەکانی فڕێدەدا و سوێند دەخوا کە تا ماوە پێڵاو لە پێ نەکاتەوە، تا وەفاتی کرد هەر پێخواس بوو. لە فەرمایشتە بەنرخەکانیدا دەڵێ: عەقوبەتی ئینسانی زانا ئەوەیە کە لە دنیادا چاوی دڵی کوێر بێ. ڕۆژێک فەرمووی: با ئەوانەی ئاگاداری حەدیس و خاوەن حەدیسن زەکاتیان لێ بدەن، عەرزیان کرد قوربان؛ زەکات دان لە حەدیساندا بە چ دەبێ؟ فەرمووی زەکاتی حەدیسان ئەوەیە کە لە هەر دووسەت حەدیسان بە پێنجانیان عەمەل بکەی.

*****

(ئەبو فەرەجی ئیسفەهانی) لە کتێبی (الاغانی)دا دەڵێ: (جەریری) شاعیر باوکی ناوی (عطیە) بووە. ڕۆژێک کابرایەک بە جەریر دەڵێ: ئێستا کێ لە هەموو کەس

شاعیرتره؟ جەریر دەستی کابرا دەگری و دەڵێ: وەرە با وەڵامت بدەمەوە. دەیبا بۆ ماڵی باوکی و بانگی دەکا بابە بابە، لەوکاتەدا باوکی بزنێکی گرتبو دەمی بە گوانیەوە نابوو دەیمژی. کە گوێی لە دەنگی کوڕەکەی بوو هاتەدەرێ و شیری لە ڕیشی دەتکایە خوارێ. جەریر بە کابرای گوت: ئەو پیاوە دەناسی؟ گوتی: نا. جەریر گوتی: ئەوە باوکمە. دەزانی ئەو شیرە چیە بە ڕیشیەوە؟ گوتی: نازانم. جەریر گوتی: ئەوە لەترسی ئەوەی کە مەبادا دەنگی دۆشینی گوانی بزنەکە بێ و خەڵک بزانێ و بێن داوای لێ بکەن، چووە دەمی بە گوانیەوە ناوە ئەوەندە بەخیلە. گوتی: جا کاکە باشترین شاعیر ئەوەیە کە لە باوکێکی ئاوا ببێ و شاعیرانت بۆ بۆڕ بدا.

*****

دەڵێن: حەجاجی سەقەفی عادەتی وابوو، تووشی هەر (کوێر)ێک بوایە پرسیارێکی لێ دەکرد. ڕۆژێک تووشی کوێرێک بوو گوتی: مامۆستا لە دوا ئەو ئایەتەی سورەی (زومەڕ) کە دەفەرمووێ: (أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آناءَ اللَّيلِ) چ ئایەتێکە؟ کوێرە فەوری گوتی: خوا دەفەرمووێ: (قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلاً إِنَّكَ مِنْ أَصحابِ النارِ). دەڵێن: حەجاج دەنگی نەکرد و لەو ڕۆژە بەدواوە پرسیاری نەدەکرد.

*****

جارێک شێخ (حەسەنی بەسری) بە (فەرقەدی) کوڕی یەعقوبی گوت: لەبەر چیە دەڵێن: برینج ناخۆی ؟ لە وەڵامدا گوتی: ئاخر قوربان لەوە دەترسم کە نەتوانم شوکرانەی لەسەر بکەم. شێخ حەسەن فەرمووی: بۆ ئەحمەق دەتوانی شوکرانە لەسەر ئەو ئاوە ساردە خۆشە بکەی کە ئەوەندەی لێ دەخۆیەوە؟

*****

جارێک پیاوێک دێتە لای شێخ حەسەنی بەسری و دەڵێ: قوربان تەڵاقم خواردووە کە حەجاجی سەقەفی جەهەندەمیە، تەڵاقم کەوتووە؟ شێخ لە وەڵامدا دەڵێ: حەجاج کابرایەکی خەراپ و فاسق بوو، نازانم بڵێم چی، خواش غەفوور و ڕەحیمە. کابرا دەچێ بۆلای (ئیبن و سیرین)، ئەویش هەر وای وەڵام دایەوە. لەپاشان دێ بۆلای (عەمری) کوڕی (عابیدی) و عەرزی ئەویش دەکا، ئەو دەڵێ: کوڕم، بچووە لەگەڵ ژنی خۆت ڕابوێرە و غەمت نەبێ، ئەگەر خوای گەورە لە حەجاج خۆش بێ، لە تەڵاقەکەی تۆش خۆش دەبێ ئەگەریش بیباتە جەهەندەمێ ئەوە تەڵاقەکەت ناکەوێ.

*****

جارێک هارونەڕەشید تەڵاق دەخوا و دەڵێ: ئەمن دەچمە دوو (بەهەشتان) و دوو

بەهەشتم دەبن. لە پاشان دەنێری بە دوای زانای گەورە (لەیسی) کوڕی سەعد و باسی تەلاقەکەی بۆ دەکا. لەیس دەڵێ: سوێندم بۆ بخۆ کە لە خوا دەترسی. هارونەڕەشید سوێندی بۆ دەخوا کە زۆر لە خوا دەترسێ. لەیس دەڵێ: خوای گەورە لە سورەتی (الرحمن)دا فەرموویەتی (وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ) یانی ئەوەی لە خوا بترسی ئەوە دوو بەهەشتی دەبێ و بەگوێرەی ئەو ئایەتە تەلاقەت نەکەوتووە.

*****

(فەضلی سەرخەسی) نەخۆش دەکەوێ، کە چاک دەبێتەوە خەڵک دەچن بۆلای، دەست دەکا بە ئامۆژگاری خەڵکەکە و دەڵێ: کوڕینە پیاو نابێ قەت پیاوەتی و چاکەی نەخۆشی و دەرد و بەڵای لەبیر وەچی، چونکە نەخۆشی دەبێتە هۆی پابونەوە لە گوناح و هۆی پاداشت دانەوەی سەبر گرتن و لە خەوی غەفڵەت وەخەبەر هاتن و یاد کردنەوەی نیعمەتی حاڵی لەش ساغی و داوای تۆبە کردن لە گوناح و هۆی هەڵنانی ئینسان بۆ خێر و سەدەقە.

*****

یەکێک لە زانایان لە تەفسیری ئەو ئایەتەی سورەی (یوسف)دا کە لە زمانی حەزرەتی (یەعقوب)ەوە دەفەرموێ: (انی لاجدریح یوسف) واتە ئەمن بۆنی یوسف دەکەم ئەوەیە کە (بای شەماڵ) لە کاتی هاتنەوەی قاسید بۆلای حەزرەتی (یەعقوب) داوای لە خوای گەورە کرد کە ئیجازەی بدا لەپێش گەیشتنەوەی قاسیدەکەدا، بۆنی حەزرەتی (یوسف) بێنی بۆ حەزرەتی (یەعقوب) و خوا ئیجازەی دا و حەزرەتی (یەعقو ب) فەرمووی: ئەمن بۆنی (یوسف) دەکەم. دەفەرمووێ: جا بە ئەمری خوا لەوکاتەوە ئەوەی مەحزون و غەمبار و دڵتەنگ بێ و ئەوەی لە دۆست و ئەحباب دوور بێ و (بای) شەماڵی لێ بدا بە دەنی سووک دەبێ و ئارەزوبان دەکا.

*****

دوعای خەراپ لە منداڵەکانتان مەکەن ، چونکە دوعای دایک و باوک زوو گیرا دەبێ. زانای بەناوبانگ شێخی (زومەخشەری) لاقێکی کوڵ بووە. کاتێ دەچێتە بەغدا و پرسیاری لێ دەکەن، لە وەڵامدا دەڵێ: ئەوە بە دوعای دایکم وام بەسەر هاتووە. بەمنداڵی چوێلەکە پاساریەکم گرت و بەنێکم دەلاقی خست. لە ناکاوێک لە دەستم بەربووە و دوای کەوتم چوو دەکونێکەوە، بەنەکەم راکێشا قاچێکی بە بەنەکەوە هات. دایکم چاوی لێبوو زۆری پێ ناخۆشبوو، دوعای کرد و گوتی: یاخوا رۆڵە قاچت ئاوا بپەڕی. دەستم کرد بە خوێندن و چووم بۆ (خوارەزم)، لە رێگادا قاچم سەرما بردی و دوعای دایکم گیرابوو.

*****

دەڵێن: شێخ (مەعروفی کەرخی) بە زۆری بە ڕۆژو دەبوو. ڕۆژێک بەلای پیاوێکی ئاو فرۆشدا دەڕوا، کابرا بانگ دەکا و دەڵێ: ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی ئاو وەخوا و ڕەحمەت لە ئاو خۆرەوە. شێخ مەعروف دەچێ دەست دەکا بە ئاو خواردنەوە. لەپاشان عەرزی دەکەن قوربان خۆ جەنابت بەڕۆژوو بووی چۆن ئاوت خواردەوە؟ دەڵێ: بەڵێ، بەلام لەبەر دوعاکەی خواردمەوە.

*****

ڕۆژێک خەلیفەی بەغدا ئەبو جەعفەری مەنسور خەلکێکی زۆری لەلابوو، (مێشولە)یەک هەر دەهات بە دەموچاویەوە دەنیشت، دەری دەکرد و گورج دەهاتەوە. زۆری پێ ناڕەحەت بوو. لەوکاتەدا زانای بەناوبانگ شێخی ناسراو بە (موقاتیل) هاتە مەجلیسەکەی. ئەبو جەعفەر گوتی: یا شێخ خوای گەورە بۆچی مێشولەی دروست کردووە، چ سودێکی هەیە؟ شێخ ئاگای لە مێشولەکە نەبوو کە بەمەنسوردوە دەنیشتەوە گوتی قوربان خوا هیچ شتێکی بێ حیکمەت دروست نەکردووە، مێشولەی بۆ ئەزیەت دان و زەزیل کردنی زالمان دروست کردووە. مەنسور دەنگی نەکرد.

*****

یەکێک لە زانایان دەڵێ. ئەمن پێمخۆشە کە هەمیشە لەناو کۆمەڵێکدا بم کە لە من زاناتر بن، نەک لە ناو کۆمەڵێکدا کە ئەمن لەوان زاناتر بم. چونکە ئەگەر لە مەجلیسی زانایاندا بم شتیان لێ فێر دەبم، بەلام کە من لەوان زاناتر بم هیچ فێرنابم.

*****

یەکێک لە پیاوە سەیرە قسەخۆشەکان (ابن والقه طانی) بەغدایی بووە. ڕۆژێک لەکاتی گەرمای مانگی ڕەمەزاندا دەچێتە مەجلیسی وەزیری بەغدا. لەوکاتەشدا (نقیب الاشراف)ی بەغدا لەوێ دەبێ. دەڵێن: نەقیب زۆر بەخیل و نان نەخۆر بووە. وەزیر لە (ابن القطان) دەپرسی لە کوێ بووی؟ لە وەلامدا دەڵێ: قوربان لە مەطبەخی مالی جەنابی نەقیب و الاشراف بووم. وەزیر دەڵێ: جا بەو گەرمای ڕەمەزانە چت دەکرد لەوێدا؟ ابن القطان دەڵێ: قوربان، خۆم فێنک دەکردەوە. وەزیر حالی دەبێ و زۆر پێدەکەنی، بەلام نەقیب زۆر خەجالەت دەبێ، چونکە قسەکەی ابن القطان ئەوە دەگەیەنێ کە لە مەطبەخی مالی نەقیب دا قەت چێشت لێ ناندرێ و هەمیشە سارد و سڕە.

*****

(ابن القطان) ڕۆژێک لەگەڵ ژنەکەی خەریکی نان خواردن دەبێ و ڕوو دەکاتە ژنەکەی و دەڵێ: سەرت ڕووت کە. ژنەکەی سەری ڕووت دەکا و ابن القطان دەست دەکا بە خوێندنی سورەی (قل هواللەاحد)، ژنەکەی زۆری بەلاوە سەیر دەبێ، دەڵێ: ئەوە چیە؟ لە وەلامدا دەڵێ: ئاخر ئافرەت کە ژن سەری ڕوت کرد (مەلائیکە) لەو جێگایە دەڕۆن و شەیاتین دەمێننەوە، جا ئەگەر سورەی (قل هواللە) بخوێنی ئەوانیش دەڕۆن، چونکە من پێمخۆش نیە لە خۆمان بەولاوە کەس حازری سەر سفرەی ئێمە بێ.

*****

ئێستا کۆمەڵێک پەیدا بوون دەڵێن: (تەسبیح) بە دەستەوە گرتن نەک هەر فایدەی نیە، بەڵکو زەرەیشی زۆرە، چونکە ئاگایان لە فەرمایشتی یەکێک لە پیاوچاکان نیە، کە لەکاتی پیریدا تەسبیحی دانەدەنا و هەر بە دەستیەوە بوو. عەرزیان کرد قوربان، خۆ جەنابت تازە موحتاجی تەسبیح نی، بۆ هەر بەدەستەوەیە؟ لە وەلامدا فەرمووی: پیاو نابێ بێوەفا بێ. سەرەتای خوا ناسینم بەهۆی تەسبیحاتەوە بوو، جا چۆن ئێستا لە خۆمی دوور وەخەم؟

*****

یەکێک لە زانایا ن دەڵێ: لە وڵاتی شامێ دوو (قەبر)م دین و زۆرم بەلاوە سەیر بوون. لەسەر کێلی یەکیان نووسرا بوو، تکایە بەبوونی ماڵی دنیا و دەسەلات مەنازە. ئەوە (گۆڕی) کەسێکە کە دەسەلاتی بەسەر (با)دا هەبووە، ئەگەر ئارەزووی بکردایە (با)ی بەر هەڵدا دەکرد و ئەگەر مەیلی لێ نەبوایە (با)ی ڕادەگرت لەسەر کێلی گۆڕەکەی بەرانبەریشی نوسرابوو، باوەڕی پێ مەکەن درۆ دەکا، لاتان وا نەبێ کە ئەوە کوڕی حەزرەتی (سلیمان) بووە، بەڵکو کوڕی پیاوێکی ئاسنگەر بووە و (با)ی لە هەمبانەی کورە دەمەدا کۆ کردۆتەوە و دەماندویەتی و ئەگەر ماندوش بووە (با)یەکەی ڕاگرتووە. جا زاناکە دەڵێ: تا ئەوکاتە قەت نەمزانی بوو کە دوو ( گۆڕ) دژی یەکتر بن و یەکیان ئەوی دی بەدرۆ وەخا.

*****

دەڵێن: یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزانی ساڵێک زۆریان لە مانگ ڕوانی نەیاندی. کابرایەک مانگی دی و بە خەڵکی نیشاندا و دەستیان کرد بە ڕۆژو گرتن. ئێوارەی ڕۆژی بیست و نۆی مانگ پیاوێکی قسەخۆش هەستا چوو لە دەرگای ماڵی کابرای دا و گوتی: هەستە وەرە دەرێ و لەو بەزمەی کە ئەوە بیست و نۆ ڕۆژە تووشت

کردوین ڕزگارمان بکە و مانگمان بۆ وەبینە.

*****

ئایا دەزانن پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی محەممەد دروودی خوای لەسەر بێ لە ڕۆژی دوو شەممە لە دایک بووە و لە ڕۆژی دوو شەممەدا بۆتە پێغەمبەر و لە دوو شەممەدا کۆچی کردووە بۆ مەدینە و لە دوو شەممەدا وەفاتی فەرمووە؟ جا هەر لەبەر ئەوەیە کە بە(بیلالی) فەرموو: (لایغادِرُ تَکَ صیامُ یومِ الاَثنَیْنِ فَاُنّی وُلِدْتُ فی الاَ ثنَیْنِ ، وَ اوْحِیَ الیّ یومَ الاَثنینِ ، وها جرتُ یومَ الاَثنَینِ). ئەی بیلال ڕۆژی دوو شەممە مەفەوتێنە هەر بەڕۆژو بە، چونکە ئەمن لە دوو شەممەدا لە دایک بووم و لە دوو شەممەدا وەحیم بۆ هات و لە دوو شەممەدا کۆچم کرد و لە دوو شەممەشدا وەفاتی فەرمووە.

*****

وا دیارە هەر لە زەمانی کۆنەوە دەسەلاتداران بە ئارەزووی خۆیان کاربەدەستیان داناون و پیاوی عاقڵ و زانایان هەڵنەبژاردوون. دەڵێن: وەزیرێک بە کاتبەکەی دەڵێ: ناو و نازناوی ئەمیر لەسەر (لەوحە)یەک بەجوانی بنوسە، تا لەسەر ئەو بورجە تازەی هەڵاوەسین. کاتبەکە دەنووسی (اَمَرَبِعمارةِ هذاالبرجِ اَبُوفلانٌ) و دەیبا بۆ وەزیر، وەزیر کە تەماشای دەکا تورە دەبێ و دەڵێ: بۆچی (ئەبو)ت بە واو نوسیوە و بە یات نەنوسیوە؟ دەبوو بنوسی (ابی فلان)، کاتبەکە دەڵێ: ئاخر جەنابی وەزیر لەو مەقامەدا دەبێ بە واو بنوسرێ چونکە دەبێتە فاعیل، وەزیر ئەوەندەی دیکە تورە دەبێ و دەڵێ: ناپیاو تۆ کەی چاوت لێ بووە کە ئەمیر لەو جێگایە قورِ و بەردی لەسەر سەری دانێ و کار بکا؟ دەڵێ ئەگەر لەبەر خزمەتی زۆرت نەبوایە دەمزانی چیت لێ دەکەم.

*****

دەڵێن: (زوحاک)ی کوڕی سوفیان زۆر گرِوێ و ناشیرین بوو، کاتێ هاتە خزمەت (حەزرەت) و موسوڵمان بوو، ڕووی کردە پێغەمبەر و گوتی: قوربان ئەمن دوو ژنم هەن زۆر لەو ژنەی تۆ جوانترن، ئەوە لەپێش ئەوەیدا کە ئایەتی حیجاب نازڵ بێ. گوتی: یەکیانت بۆ تەڵاق نەدەم مارەی کەی؟ حەزرەتی (عایشە)ش دانیشتبو. حەزرەتی عایشە خۆی بۆ ڕانەگیرا و گوتی: ژنەکەت لەخۆت جوانترە؟ زوحاک گوتی: نا ئەمن لەو جوانترم. پێغەمبەر بە پرسیارەکەی حەزرەتی عایشە پێکەنی، چونکە کابرا زۆر ناشیرین بوو.

*****

جارێک عەرەبێک لەگەڵ ژنەکەی شیریان لە وشترەکەیان دۆشی و دانیشتن دەستیان کرد بە نان و شیر خواردن. ژنەکەی گوتی: ئەرێ پیاوەکە ژیانی ئێمە خۆشترە یان هی (مەڕوانیەکان)؟ مێردەکەی گوتی: ئافرەت ئەوان خواردنی باشتر دەخۆن، بەڵام ئێمە بەرگ و لیباسمان لە هی ئەوان کۆنترە و ئەوان بە ڕۆژ خۆشتری ڕادەبوێرن، بەڵام ئێمە بەشەو لەوان باشتر دەتوانین وەدەرکەوین.

*****

(سەلمانی فارسی) و(حوزەیفەی یەمانی) ڕۆژێک پێکەوە لە (مەداین) لە ناو (طاقی کیسرا) دانیشتبوون و باسی عەجایباتی ڕۆژگاریان دەکرد. لەوکاتەدا عەرەبێک چەند بزن و مەڕی لە ودەوروبەرە دەلەوەڕاندن و ئێواران دەطاقی کیسرای دەکردن. لە ناو طاقی کیسراشدا بەردێکی مەرمەڕی پان هەبوو، زۆرجاران لەکاتی خۆیدا کیسرا لەسەری دادەنیشت. لەبەرچاوی سەلمانی فارسی و حوزەیفەی یەمانی بزن و مەڕی کابرا هاتن چوونە سەر بەردەکە. سەلمانی فارسی گوتی: ئەوە یەکێکە لە عەجاییباتی ڕۆژگار کە لە جێگای کیسرا بزن و مەڕ بمۆڵن.

*****

عەرەبێک دوعای دەکرد و دەیگوت: ئەی خوای گەورە تۆ ئەمرت پێکردوین کە لەو کەسانە خۆش بین کە زوڵمیان لێکردوین. ئەوە لێیان خۆش بووین بە قسەی تۆ. ئێمەش زوڵممان لە نەفسی خۆمان کردووە، دەتۆش بە کەرەمی خۆت لێمان خۆش بە.

*****

قەدیمیان گوتویانە: خەیاڵ پڵاویش زەرەدی بۆ پیاوی فەقیر هەیە. دەڵێن: پیاوێکی فەقیر (کولەکە) ڕۆنێکی پڕی هەڵاوەسی بوو. گۆچانێکی بە دەستەوە بوو، دەبیران ڕاچووبوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ئەم ڕۆنە دەفرۆشم بە (دە) تمەن و سێ چوار سەر بز نی پێ دەکڕم و زاو وزێ دەکەن و لەپاشان بزنەکان دەفرۆشم و جوتە گایەک و زەوییەک و هێندێک تۆو دەکڕم و دەست دەکەم بە فەلاحەتی. ئەگەر ژنەکەشم کوڕی بوو ناوی دەنێم فلان. کە گەورەش بوو لە قسەم دەرچوو بەو گۆچانە ئاوا لە سەری ڕادەکێشم: گۆچانەکەی ڕاست کردەوە، لە کولەکە ڕۆن کەوت و بەسەر و چاویدا ڕژا و هاتەوە سەر هەواری خاڵی.

*****

خالیدی کوڕی سەفوان و فەرەزدەقی شاعیر قسەی خۆشیان بەیەکتر دەگوت. ڕۆژێک خالید بە فەرەزدەقی گوت تۆ ئەوەندە جوان نی کە دەرحەقت بگوترێ

(لَمّارَأَينَهُ أَكبَرْنَهُ وَ قَطَّعنَ أَيدِيهُنَّ). واتە کاتێ چاویان پێکەوتی ئەوەندەیان پێ جوان بی، ئاگایان لە خۆیان نەمێنی، وەک ژنەکانی میسر کە چاویان بە حەزرەتی (یوسف) کەوت، لەباتی نارنج لەتکردن دەستی خۆیان بری و ئاگایان لە خۆیان نەما. فەرەزدەقیش لە وەلامدا گوتی: خۆ وەنەبێ ئێتۆش وەک ئەو کەسە بی کە کچەکان چاویان پێکەوت و بە بابیان گوت: (یاأَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ). ئەی باوکە ئەو پیاوە ڕاگرە، چونکە زۆر ئەمین و بەتوانایە، وەک کچەکانی حەزرەتی (شوعەیب) بە حەزرەتی (مووسا)یان گوت.

*****

دەڵێن: دوو کەس پێکەوە دانیشتبوون قسەیان دەکرد، یەکیان بەوی دی گوت: ئەوە کێ (بەحر)ی هەڵکەندووە؟ ئەوی دیان لە وەلامدا گوتی: بەخوا کەری، نازانی کە خوا هەڵیکەندووە؟ کابرا گوتی: ددی باشە، ئەی گڵەکەی بردۆتە کوێ؟ لە وەلامدا گوتی: کورە چووزانم خۆ ئەمن بە دیاریەوە نەبووم.

*****

جارێک لە مەجلیسی (بوزورجومیهر)دا باسی زانایانیان دەکرد. یەکێک پرسیاری لێکرد و گوتی: قوربان عالم گەورەترن یان دەولەمەند؟ بوزورجومیهر لە وەلامدا گوتی: عالم. کابرا گوتی. باشە، ئەی بۆچی عالم بە زۆری دەچنە لای دەولەمەندان و دەولەمەند کەمتر دەچنە لای عالمان؟ لە وەلامدا بوزورجومیهر گوتی: ئەوە لەبەر ئەوەیە کە عالم قەدری دەولەمەندی دەزانی، بەلام دەولەمەند قەدری عیلم نازانی. یەکی دی پرسیاری لێکرد و گوتی: ئەی قوربان جەنابت بەهۆی چیەوە بەو پلەو پایە گەیشتی؟ لە وەلامدا گوتی: (بِبُكورٍ كَبُكُورِ الْغُرابِ، وَ حِرْصٍ كَحِرْصِ الْخنزِيرِ ، وَصَبْرٍ كَصَبْرِ الْحِمارِ) بەهۆی هەستانی زووی بەیانیان وەک هی قەلەڕەشە و حیرسی وەک حیرسی بەراز و سەبری وەک سەبری گوێدرێژ.

*****

دەڵێن: موسوڵمانێک بەبێ دینێکی گوت: ئەرێ ئەوە تاکەی موسوڵمان نابی؟ کابرا گوتی: تا خوا حەز دەکا موسوڵمانەکە گوتی: خوا حەز دەکا موسوڵمان بی بەلام شەیتان لێت ناگەڕێ. کابرا گوتی: جا ئەمن لەگەڵ بەهێزەکەیانم.

*****

یەکێک لە مەلایەکی پرسی، ئایا هیچ دەلیل و بەڵگە لەسەر(حدوسی) عالەم هەیە؟ واتە کە دنیا نەبووە و پەیدا کراوە. مەلاکە گوتی: بەڵێ، ئەو هەموو گۆڕان وحەرەکا و سکونە بەڵگە و دەلیلن لەسەر حدوسی عالەم. کابرا گوتی: جاخۆ مامۆستا

حەرەکە و سکونیش هەر بەشێکە لە عالەم. ئەوە وەک ئەوە دەچێ کە بڵێی بەڵگە لەسەر حدوسی عالەم حدوسی عالەمە. مەلاکە گوتی: جا پرسیارەکەی تۆش هەر بەشێکە لە عالەم، هەرکاتێ تۆ پرسیارێکت لێکردم کە بەشێک نەبێ لە عالەم، منیش وەلامێکت دەدەمەوە کە بەشێک نەبی لە عالەم.

*****

دەڵێن: جارێک لە زانایەکیان پرسی و گوتیان ئەرێ قوربان ئەوە بۆ (عەصا)ت بەدەستەوەیە؟ خۆ لە سایەی خواوە نە پیر بووی و نە نەخۆشی. لە وەلامدا گوتی: بۆ ئەوەی کەوا بزانم سەفەریم و مردنم لەبیر نەچێتەوە.

*****

لە کتێبی (عیون الاخبار)دا دەڵێ: (عبداللە)ی کوڕی (حەفص) لە زەکەریای کوڕی نافیع و ئەویش لە باوکیەوە ڕیوایەت دەکا و دەڵێ: حەزرەتی عومەر فەرموویەتی: (إِخْضِبُوا بِا لسّوا دِفَإِنَّهُ أُنسٌ لِلنِّساءِ وَ هَيْبَةٌ لِّلعَدُوِّ)، مووەکانتان ڕەش وەکەن، چونکە ژنەکانتان پێیان خۆشە و دوژمن پێی ناخۆش کە وەک گەنجانتان دەبینێ.

*****

کوڕێک حەز لە کچێک دەکا و دەنێری بۆ خوازبێنی. لە کوڕەکە دەپرسن کارت چیە و چ کاسبیەک دەکەی؟ لە وەلامدا دەڵێ: حەیوان فرۆشم، کچەکەی دەدەنێ و مارەی دەکا. کاتێ دەپرسن، کابرا پشیلە فرۆشە. دەچنە لای قازی شکایەتی لێ دەکەن و دەڵێن: جەنابی قازی ئەو کوڕە گوتی حەیوان فرۆشم، بۆیە کچەکەمان داوەتێ، کەچی پشیلە فرۆشە. کوڕەکە دەڵێ: جا جەنابی قازی خەتای خۆیان بوو، بۆچی نەیانپرسی چ حەیوانێک دەفرۆشی؟ قازی گوتی: ڕاست دەکا، پشیلەش هەر حەیوانە و تازە ژن، ژنی خۆیەتی.

*****

دەڵێن: جارێک (عەقیل)ی برای حەزرەتی (عەلی) لە حەزرەتی عەلی زویر دەبێ و دەچێ بۆ شامێ بۆ لای (موعاویە). ڕۆژێک موعاویە دەڵێ: خەڵکینە ئێوە دەرحەق بە کەسێک کە بۆ برای خۆی باش نەبێ دەڵێن چی؟ فەوری عەقیل دەڵێ: خەڵکینە براکەم بۆخۆی چاک بوو، بەلام بۆمن چاک نەبوو، بەلام موعاویە بۆخۆی خەراپە و بۆ خەڵک چاکە. موعاویە پێی ناخۆش دەبێ و دەڵێ: خەڵکینە ئەوە برازای ئەبو لەهەبە. فەوری عەقیل دەڵێ خەڵکینە پوری موعاویە (حمالة الحطب) بوو، ژنی ئەبو لەهەبی مامم بوو، موعاویە بێدەنگ دەبێ.

*****

له بابەت دۆستایەتیەوە دەڵێن: حەزرەتی (داوود) بە حەزرەتی (سلێمان)ی کوڕی دەڵێ: وریا بە، قەت دۆستی قەدیمی بە دۆستی تازە نەگۆڕیەوە. هەروەها دەڵێ: وریا بە یەک دوژمنیش یەکەم مەزانە و بە هەزار برادەریش مەڵێ زۆرن. هەروەک لەو بارەیەوە شاعیرێکیش گوتویەتی:

لَعَمْرُكَ ما ما لُ ٱلْفَتىٰ بِذَ خِيرَةٍ       وَ لكنَّ إِخوانَ الثِّقاتِ الذَّخائِرُ

واتە بەگیانی تۆ، ئەو ماڵەی کۆی دەکەیەوە نابێتە زەخیرە و فریات ناکەوێ، بەڵام دۆست و برادەری چاک فریات دەکەون و دەبنە زەخیرە. هەروەک پێشینیان گوتویانە: (الرَّجلُ بِلا إِخوانٍ كا لْيَمينِ بِلا شمالٍ). یانی پیاوی بێ دۆست و برادەر وەک دەستی ڕاستی بێ دەستی چەپ وایە.جا هەر لەبەر ئەوەیە کە شێخ (ئەییوبی سەختیانی) خوای لێ ڕازی بێ فەرموویەتی: کە خەبەری وەفاتی برادەرێک دەزانم وەک ئەوەیە کە ئەندامێکم نەمێنێ.

بەڵام (مەئموون) گوتویەتی: ئەوانەی دەبنە برادەرت سێ جۆرن و سێ دەستەن دەستە و تاقمی یەکەمیان وەک خواردن وان هەمیشە پێویستن. دەستە و تاقمی دووەم وەک دەرمان وان، کاتی پێویستی، پێویستن. دەستەی سێیەمیان وەک دەرد و بەڵا وان، یاخوا کەس نەی بێ.

*****

دەڵێن: لە (بوزور جومیهر)یان پرسی گوتیان: برات خۆشتر دەوێ یان برادەر دۆست ؟ لە وەڵامدا گوتی: براش کە دۆست نەبێ خۆشم ناوێ. کاتێ خۆشم دەوێ کە دۆست بێ.

*****

برادەری و دۆستایەتی ئەوەندە پیرۆزە (حەزرەت) فەرموویەتی: ئەگەر دۆست برادەرێکت خۆش ویست ئاگاداری بکە کە خۆشت دەوێ. لە فەرمایشتێکی دیکەدا فەرموویەتی: برادەری لەگەڵ سێ کەسدا مەگرن. یەکەم لەگەڵ ئینسانی بێدین دا چونکە کردەوە خەراپەکانی خۆی لەپێش چاوت شیرین دەکا و ئارەزووی ئەوە بچیە سەر خوو ڕەوشتی وی و هاتوچۆی دەبێتە عەیب و عار و نەنگ بۆ تۆ. دووەم ئینسانی ئەحمەقە، چونکە لەباتی ئەوەی سوودت پێ بگەیێنێ، تووشی زەرەدت دەکا و تا لێی دوور بی باشترە. سێیەم ئینسانی درۆزنە. درۆزن ژیان و ڕابواردنی لەگەڵ خۆش نیە و لای خەڵک باسی تۆ دەکا و لای تۆش باسی خەڵک دەکا. ئەوەندە ئیعتیبار دەبێ ڕاستیش بڵێ باوەڕی پێ ناکەن.

*****

دەڵێن. کابرایەکی (قەنبوور) واتە پشت کۆم دەچاڵاوێک دەکەوێ و پشتی ڕاست دەبێتەوە. کاتێ خەڵک دەچن بۆلای بۆ ئەحواڵپرسی و دەڵێن: زۆر پێ خۆشحاڵین کە پشتت ڕاست بۆتەوە و ڕزگارت بووە. لە وەڵامدا دەڵێ: بابە ڕزگار بوونی چی، ئەوەی خوا غەزەبی لێگرت قەت ڕزگاری نابێ. ئەوەی بەسەرم هاتووە زۆر لە پشت دەرپەڕینەکەم خەراپترە. پشتم ڕاست بۆتەوە و گونم دەرپەڕیوە.

*****

یەکێک لە زانایان دەڵێ: ئەگەر حەزت لە کچێک کرد و ویستت بیخوازی، دیاری بۆ دایکی بەرە ئەو بۆت ساز دەکات.

*****

زانایەکی دی دەڵێ: عەتا و بەخشین بەلای گەنجانەوە ئاسانترە تابەلای پیرانەوە، بە دەلیلی ئەوەی کە حەزرەتی (یوسف) فەرمووی: (لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللّٰهُ لَكُمْ). واتە ئەمڕۆ لۆمەتان لەسەر نیە، خوا لێتان خۆش دەبێ، بەڵام حەزرەتی (یەعقوب) فەرمووی: (سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّي إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ). واتە لێرە بەدواوە داوای لێ خۆشبوون و بۆ دەکەم لە خوای خۆم کە بەڕاستی خوا غەفوور و ڕەحیمە.

*****

دەڵێن: نانەوایەک ڕۆژێ نانێکی بۆ ئەبو کەعبی حیکایەتخوان دەنارد، وەری دەگرت و دەیگوت: ئەی نان: لەعنەت لە تۆ و لەو کەسەی کە بۆی ناردووم و لە منیش کە تا لە تۆم چاکتر دەست کەوێ دەستت لێ هەڵگرم.

*****

قەدیمیان گوتویانە: پێنج شت بەفیڕۆ دەچن. یەکەم چرا و گڵۆپێک کە بە ڕۆژی ڕووناک بایسێن. دووەم بارانێک کە بەسەر زەوی شۆرەکاتدا بباری. سێیەم ئافرەتی جوان کە بە پیاوی نێرەمووک ڕازی ببێ. چوارەم خواردنی چاک بدرێ بە پیاوی مەست پێنجەم چاکە لەگەڵ ئەو کەسە بکرێ کە سپڵە و پێنەزان بێ.

*****

دەڵێن: لە کتێبێکی هیندیدا نوسراوە شەش شت دەوامیان نابێ. یەکەم سێبەری هەور. دووەم دۆستایەتی پیاوی شەڕخواز. سێیەم عیشق و خۆشەویستی ئافرەت. چوارەم سەروەت و سامانی زۆر. پێنجەم زوڵمی زاڵم. شەشەم سوپاس کردنی ئینسانی درۆزن.

*****

لە کابرایەکیان پرسی ئەری ڕاستە دەڵێن. فلان کەس زۆر سەقیل و بەخیلە؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەریوەڵڵە ئەوەندە ڕاستە کە ئەگەر خانوێکی گەورەی بەقەدەر مابەینی بەغدا و کووفەی هەبێ و پڕلە دەرزی بێ و عەر دەرزییەی شەیدا سافیکی پێوە بێ و حەزرەتی (یەعقوب) جوبرائیل و میکائیل لەگەڵ خۆیدا بەری و داوای دەرزییەکی لێ بکا و بڵێ کراسەکەی حەزرەتی (یوسف)ی پێ دەدرومەوە ئێستا نایداتێ.

*****

حەجاجی سەقەفی بە دوکتورەکەی دەڵێ: دەستورێکم بۆ دانێ تا ڕەفتاری پێبکەم و نەخۆش نەکەوم. دوکتورەکەی دەڵێ کچ و ئافرەتی گەنج نەبێ مەی هێنە، گۆشتی ناسک نەبێ قەت مەیخۆ، ئەویش تا چاک نەکوڵێ، تا زۆر موحتاج نەبی دەرمان مەخۆ، میوەی گەیوی نەبێ مەیخۆ، ئەوەی دەیخۆی زۆر چاکی بجوو، تا ئارەزووت نەبێ شت مەخۆ، ئاو لەسەر خواردن وەخۆ، بەڵام دوای ئاوەکە هیچ مەخۆ، قەت میز و گو ڕامەگرە، کە بە ڕۆژ خواردنت خوارد لەسەری بنو، بەڵام کە شەو خواردت پیاسەی لەسەر بکە تا لەشت ساغ بێ.

*****

جارێک بە(جالینووس) دەڵێن: شۆی چیە جەنابت خواردن زۆر کەم دەخوا؟ لە وەڵامدا دەڵێ: ئاخر من خواردن بۆیە دەخۆم تا بژیم، بەڵام خەڵک بۆ ئەوەی دەژی تا خواردن بخوا.

*****

زانایان گوتویانە دەرمان بۆ بەدەن وەک (سابوون) بۆ بەرگ و لیباس وایە، واتە چۆن سابوون بەرگ و لیباس لە چڵک و پیسی پاک دەکاتەوە، بەڵام لیباسەکە کۆن دەکا و دەیدڕێنێ، دەرمانیش بەدەنی ئینسان پاک دەکاتەوە، بەڵام وەک خۆی لێ نایێتەوە.

*****

دەڵێن: پیاوێکی بێ ڕیش لە شێتێکی ڕیشدرێژ دەپرسی، ئەو ڕیشە درێژە چیە؟ شێتەکە لەسەرەخۆ لە وەڵامدا ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوە و دەڵێ: (وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَ الَّذِي خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا) یانی زەوی چاک بە ئەمری خوا شیناوردی زۆر و چاکی لێ شین دەبێ، بەڵام زەوی پیس و خەراپ بە کەمی نەبێ هیچ شین ناکا.

*****

دەڵێن: لە زەمانی زوودا پیاوێکی باش ژنێکی زۆر ناشیرین و ڕووگرژی هەبوو. ڕۆژێک پیاوەکە دەچێتەوە ماڵ و لە ڕێگادا پیاوێک دێتە سەر ڕێگای و دەڵێ: ئەمن لە لایەن خواوە فرستاددم کە خواسێ دوعات لێ قبوڵ دەکا. جا بە ئارەزووی خۆت بۆ دنیایان دەکەی یان بۆ قیامەت. کابرا ئەوە دەڵێ و ون دەبێ. پیاوچاکەکە بە پەشۆکاوی دێتەوە ماڵێ. ژنەکەی دەڵێ: ئەرێ پیاوەکە ئەمڕۆ بۆ ڕەنگت ئاوا گۆڕاوە و بۆچی وا تێکچووی؟ مێردەکەی ڕوداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. ژنەکەی دەڵێ: خۆ پیاوەکە ئەمن خێزانی تۆم و ئەوە چەند ساڵە پێکەوە دەژین و چەند منداڵم لەتۆ بوون، بەخوا دەبێ دوعایەکیان بدەی بەمن. مێردەکەی دەردی زۆر لە دڵدا بوو، جوابی نەدایەوە. ژنەکە کچەکانی هێنا و دەستیان کرد بە گریان و قژ ڕنینەوە و هاوارکردن و گوتیان: بابە ئەگەر دوعایەکیان نەدەی بە دایکمان خۆمان دەسوتێنین، ئەوە چەند ساڵە خزمەتمان دەکا، چۆن دوعایەکی پێ ڕەوا نابینی؟ باوکەکەیان ناچار کرد دوعایەکی دایە. ژنەکە رووی کردە ئاسمان و گوتی: ئەی خوای گەورە زۆر جوانم بکەوە. فەوری وەک کچی چواردە ساڵ گەنج بۆوە و وەک ئافرەتەکەی جاران نەدەچوو.

ئافرەت لە خۆی بایی بوو، نەک هەرجوابی مێردەکەی نەددایەوە، خەیانەتیشی پێدەکرد. ڕۆژێک مێردەکەی ئەوەندە توڕە بوو دوعای لێکرد و گوتی: ئەی خوای گەورە دوعایەکم دا بە ژنەکەم ئاوای بەسەر هاتووە. دوعای دووەم ئەوەیە، خوایە بیکەی بە(بەراز). دەڵێن: بە ئەمری خوا بوو بە بەراز. دوبارە کچەکان دەستیان کردەوە بە گریان و لەبەر باوکیان پاڕانەوە تا بەزەیی پێداهاتەوە و گوتی: ئەی خوای گەورە وەک ئەوەڵ جاری لێ بکەوە. ژنەکە وەک ئەوەڵ جار ناشیرین بۆوە و ئەو پیاوچاکە بەهۆی ژنە خەراپەکەیەوە هەر سێ دوعای لەکیس چوون.

*****

دەڵێن (ئەردەشێری بابەکان)ی ساسانی بە لەشکرێکی زۆرەوە هاتە سەر قەڵاتی شاری (حضر) کە لە بەینی دیجلە و فوڕات دایە لە بەرامبەر شاری (تکریت) بووە. زۆر هەوڵ دەدا قەڵاتەکەی بۆ ناگیرێ. تا ڕۆژێک کچی پاشای (حضر) دێتە سەر وارشی قەڵاتەکە و چاوی بە ئەردەشێر دەکەوێ و عاشقی دەبێ. دەچێ نامەیەک دەنوسێ و لە تیرێکی دەبەستێ و دێ بۆلای ئەردەشێری هەڵدەدا. کە دەیخوێننەوە نوسراوە ئەگەر وەعدەم پێبدەی مارەم کەی، ڕێگایەکت نیشان دەدەم کە بەئاسانی بتوانی قەڵاتەکە بگری. ئەردەشێر فەوری بۆی دەنوسی کە ئەوە بەڵێنم دا و بۆی

هەڵدەداتەوە بۆ سەر قەڵاتەکە. کچەکە ڕێگای بۆ دیاری کردن و چوون (حضر)یان گرت و باوکی کچە و زۆربەی پیاوەکانیان کوشت و ئەردەشێر کچەکەی مارە کرد. تا شەوێک کچەکە هەر ئەملا و ئەولای دەکرد و خەوی لێ نەدەکەوت گوتیان: ئەوە بۆ نانووی؟ لە وەلامدا گوتی: شتێک لە ناو جێگاکەمدایە ژیانی لێ تاڵ کردووم. کە تەماشایان کرد لەبن سەرچەفەکەیدا پەلکە گەلایەکی (ئاسی) تێدابوو. ئەردەشێر گوتی: ئەوە بابت چۆنی گەورە کردووی و چیت خواردووە؟ لە وەلامدا گوتی: هەنگوین و شەکری داومێ. ئەردەشێر گوتی: مادام وەفات بۆ باوکت نەبوو، وەفات بۆ منیش نابێ، ئەمری کرد دەکلکی وەلاغێکیان خست و ڕایانکێشا تا لەت لەت بوو.

*****

(ئەسمەعی) دەڵێ: پیاوێک هات بۆلای (ئەبو حازم) و گوتی: قوربان شەیتان لە کۆڵم نابێتەوە وەسوەسەم دەدا و دەڵێ: ژنەکەت تەلاق داوە، لێت حەرامە. ئەبو حازم گوتی: دیارە تەلاقت داوە وا نیە؟ کابرا گوتی: (سویحانەاللە) بە شەیتان باوەڕ دەکەی و ئەمن بە درۆ دەخەیتەوە؟

*****

(ئەبو موسلیمی نەخەعی) دەڵێ: کە سەری (مەصعەب)ی کوڕی زوبەیریان بڕی و هێنایان لە دارولخەلافەتی (کووفە) لەبەر دەمی (عبدالمليكی) کوڕی مەڕوانیان دانا زۆر نارەحەت بووم. عەبدوالمەلیک گوتی: ئەوە بۆ وا نارەحەتی؟ لە وەلادا گوتم: بیر لە قەزا و قەدەر دەکەمەوە، چونکە ئەمن ئەوە تا ئێستا بەو دوو چاوانەم دیم کە سەری حەزرەتی (حوسێن)یان بە بڕاوی هێنایە ئێرە و لەبەر دەمی عوبەیدی اللەی کوڕی زیادیان دانا. ئەوا ئێستاش دەبینم سەری مەسعەبی کوڕی زوبەیر بە بڕاوی هەر لەو جێگایە لەبەر دەمی عەبدولەلیک دانرا. عەبدولەلیک زۆر نارەحەت بوو دەستوری دا جێگاکەیان ڕوخاند.

*****

دەڵێن: کاتێ (عومەر)ی کوڕی عەبدولعەزیز بوو بە خەلیفە، یەکێک لە دۆستە نزیکەکانی چوو بۆلای. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز گوتی: پێت خۆشبوو بووم بە خەلیفە یان پێت ناخۆشبوو؟ دۆستەکەی لە وەلامدا گوتی: لەبەر خەڵک پێم خۆشبوو، چونکە دزانم بۆ خەڵک زۆرباش دەبێ، بەلام بۆ خۆتم پێخۆش نەبوو، خەلافەت بارێکی زۆر گرانە. عومەر فەرمووی: ڕاست دەکەی زۆر دەترسم بە هیلاک بچم. دۆستەکەی گوتی: ئەگەر بترسی لێت ناترسم. ئەمن لەوە دەترسام کە

نەترسی. بە دۆستەکەی گوت: ئامۆژگاریم بکە. دۆستەکەی گوتی: باوکە گەورەی ئێمە کە حەزرەتی (ئادەم) بوو، بەهۆی خەتایەکەوە لە بەهەشت دەرکرا ئاگات لەخۆت بێ.

*****

کابرایەک لە شاری (بەسرا) داوای (پێغەمبەری) دەکا. بەدەست بەستراوی دەیبەن بۆلای مەئموون لە بەغدا. مەئموون دەڵێ: تۆ پێغەمبەری؟ لە وەڵامدا دەڵێ قوربان جارێ زنجیر کراوم جواب نادەمەوە. مەئموون دەڵێ: بەدبەخت کێ بەسەهووی بردووی؟ کابرا دەڵێ: جا لەگەڵ پێغەمبەران ئاوا قسە دەکرێ؟ سوێند بە خوا ئەگەر زنجیر نەکرامایە بە جوبرەئیلم دەگوت سەرەوبنی بکا. مەئموون دەڵێ بۆ ئینسانی زنجیرکراو جوابی نادرێتەوە؟ کابرا دەڵێ: بەتایبەتی پێغەمبەران لەکاتی وادا دوعایان گیرا نابێ. مەئموون زۆر پێدەکەنی و دەڵێ: کێ زنجیری کردووی؟ دەڵێ ئەو پیاوەی تۆ. مەئموون دەڵێ: ئەمن ئازادت دەکەم بەو شەرتەی بە جوبرەئیل بڵێی سەروبنی کا، جا ئەگەر بەقسەی کردی ئیمانت پێدێنین. کابرا دەڵێ: بەڵێ خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کە دەڵێ: (فَلَا يُؤْمِنُوا حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ) یانی ئیمان ناهێنن تا عەزابی کوشندەیان نیشان نەدرێ. مەئموون گوتی: دەستی بکەنەوە و بەری بدەن، کە دەستیان کردنەوە، کابرا گوتی: ئەی جوبرەئیل ئەو بەزمە بەمن ناکرێ، یەکی دی ڕەوانە بکە سەریان. مەئموون زۆر پێکەنی و کابرای خەڵات کرد و ناردیەوە بۆ بەسرە.

*****

دەڵێن. ساڵێک (سلێمان)ی کوڕی عەبدولمەلیک لەگەڵ (عومەری) کوڕی عەبدولعەزیز لە کێوی عەرەفات بوون. لە ناکاو هەورێکی هێنا و بروسکە و ڕەعدو بەرق و شریخەیەکی زۆر بەقووەتی لێوەهات. سلێمان تاسا و ڕاچەنی و زۆر ترسا. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەستی کرد بە پێکەنین. سلێمان زۆری پێ ناخۆش بوو، گوتی ئەوە بەچی پێدەکەنی؟ لە وەڵامدا گوتی: بەتۆ پێدەکەنم. گوتی بۆ بەمن پێدەکەنی؟ گوتی: ئەو باران و ڕەعد و بەرقە لێرە و لەوکاتەدا بەرەکەت و ڕەحمەتە تۆ ئاوا لێی بترسی، دەبێ لە ڕۆژی قیامەتدا کە تووشی عەزابی خوا بووی چۆن بترسی؟

*****

دەڵێن. (ئەبو یوسف) قوتابی ئیمامی (حەنەفی) بوو. لەو کاتەدا ڕۆژێک هارونەڕەشید لەگەڵ (سیتەزو بەیدە) دەمەقاڵیان دەبێ هارونەڕەشید تووڕە دەبێ و

دەڵێ: هەر سێ تەڵاقم کەوتبێ

ئەمشەو لە ملک و مملەکەتی خۆمدا نانووم.

کە ئێوارە دادێ هارونەڕەشید پەشیمان دەبێتەوە و تینی بۆدێ. دەنێری بەدوا زانایاندا کۆ وەبن و چارەیەکی بۆ وەدۆزن، ئەبو یوسف دەڵێ: جا ئەوە ئاسانە. بابچێ ئەمشەو لە مزگەوت بنووێ، خۆ مزگەوت ملک و مەملەکەتی وی نیە مزگەوت ماڵی خوایە و خوای گەورە فەرموویەتی: (اِنَّ اَلْمَسَاجِدَ لِلّٰهِ) مزگەوت ماڵ و ملکی خوایە و هی کەس نیە. هارونەڕەشید زۆری پێخۆش دەبێ و دەیکا بە گەورەی قازیەکان.

*****

دەبێ ئینسان وەک (ئیبراهیمی ئەدهەم) لێبوردو و لەسەرەخۆ بێ. دەڵێن: ڕۆژێک لەلای گۆڕستانێک دەبێ، سوارێک بەلای دا دڕوا، ڕێگای لێ دەپرسی، لە وەڵامدا گۆڕستانەکەی نیشان دەدا، سوارەکە توڕە دەبێ و دارێکی لە سەری ڕادەکێشی و سەری دەشکێنی. کاتێ کابرا دەزانی ئەوە ئیبراهیمی ئەدهەمە، دێ دەستی ماچ دەکا و داوای لێبوردنی لێ دەکا، لە وەڵامدا دەڵێ، کاتێ دارەکەت لێ دام دوعام بۆ کردی، چونکە سەوابت پێگەیاندم جا لە چیت ببورم؟

*****

دەڵێن: لەکاتی خۆیدا قازی شاری (ساوە) مەشهور بوو بە بەرتیلخۆر. گەورەی شارەکە نەقلی دەکا بۆ شارێکی دی و سوێندی دەدا کە داوای بەرتیل لە کەس نەکا. تا ماوەیەک قەزاوەتی خۆی دەکا، کە دەزانی خەڵک هیچی بۆ ناهێنن، ڕۆژێک زۆربەی خەڵکی شارەکە کۆ دەکاتەوە و دەڵێ: ئەرێ ماڵ نەوێرانینە ئەوەی منی نارد بۆ قەزاوەتی ئەو شارە سوێندی داوم کە داوای هیچتان لێ نەکەم، باشە ئەی ئێوە کێ سوێندی داون کە هیچم بۆ نەهێنن؟

*****

لە زەمانی خولەفاکاندا پیاوێکی (سوننی) دەبێتە گەورەی شاری (قووم). کاتێ خەڵک هاتوچۆی دەکا، نابینێ کەس ناوی (ئەسحاب)ێکی لێ ندرابێ. ڕۆژێک پیاوماقولەکانی شار بانگ دەکا و دەڵێ: وادیارە ئێوە ئەوەندەتان ئەسحابی پێغەمبەر ناخۆش دەوێ کە تا ئێستا کەستان بەناوی ئەسحابەیەکەوە ناو نابرێن. جا ئەگەر تا دوو ڕۆژی دی یەکێک نەهێنن کە ناوی عومەر بێ یان کونیەی (ئەبوبەکر)ی ناوبێ هەر بۆخۆم دەزانم چیتان بەسەر دێنم. دەچن و دووڕۆژ تەواوی شاری قووم دەگەڕێن، کوڕی کابرایەکی غەریبی تازە هاتووی خێلی کەچەڵی گۆجی

ناشیرین دەبیننەوە و دەی هێنن بۆلای و دەڵێن: قوربان ئەوە ئەبوبەکرە. (والی) زۆر تورە دەبێ و دەست دەکا بەقسە پێگوتنیان و دەڵێ هەر بۆیە ناوتان ناوە ئەبوبەکر، چونکە زۆر ناشیرینە؟ پیاوێکی قسەخۆشیان لە ناودا دەبێ دەڵێ: قوربان جاچیمان لێ دەکەی لێمان بکە، چونکە ئەوە خەتای ئێمە نیە، ئاو و گڵ و هەوای شاری (قووم) ئەبوبەکر لەوە جوانتر دروست ناکا.

*****

لە شاری (مەروە) قازیەک ناوی (نووحی) کوڕی (مریەم) بوو. کچێکی زۆر جوانی هەبوو، زۆر کەس داوای دەکرد. قازی باغەوانێکی گەنجی هیندی ڕاگرتبو، ڕۆژێک قازی دەچێ بۆ ناو باغ و بە باغەوانەکەی دەڵێ هێندێک ترێ بێنە. کوڕەکە دەچێ چەند ئێشویەک دێنی، دەیشواتەوە و لەبەر دەمی قازی دادەنێ. قازی کە لێی دەخوا زۆر ترش دەبێ، دەڵێ بچۆ هێندێکی شیرین بێنە، دەچێ هێندێکی دی دێنی، کە قازی لێی دەخوا زۆر لەویدی ترشتر دەبێ، قازی تورە دەبێ و دەڵێ: من دەڵێم بچۆ ترێی شیرین بێنە کەچی تۆ هی ترشتر دێنی، ئەوە فەرقی ترش و شیرین ناکەی؟ کوڕەکە لەسەرەخۆ دەڵێ: بەڵێ فەرقیان دەکەم، بەڵام جەنابت ئەمری پێکردووم ئاگاداری بکەم، نەتفەرموو لێی بخۆم، کەسێکیش لە شتێک نەخوا نازانی چۆنە. قازی زۆری بەلاوە سەیر دەبێ و وەبەر دڵی دەکەوێ و کچەکەی لێ مارە دەکا. (عەبدوڵڵە)ی موبارەک لە کچی قازی و لەو کوڕە باغەوانە بەوەلد دەبێ.

*****

دەڵێن (بارامی گۆڕ) زۆر دەست ڕاست و ڕاوچییەکی زۆر عەجایب بووە. ڕۆژێک جارییەکی زۆرخۆشە ویستی لەگەڵ دەبێ و دەچێ بۆ ڕاوێ. تووشی چەند ئاسکە کێوی دەبن. بارامی گۆڕ دەڵێ: تیرێک داوێم ئەتۆ کوێ دەڵێی تا لەو جێگایەی دەم. ئافرەتەکە دەڵێ دەمەوێ سمی بە گوێیەوە بدرووی. بارامی گۆڕ قسەکەی زۆر پێ ناخۆش دەبێ، بەڵام دەڵێ ئەگەر نەیهاوێمێ دەڵێ درۆی لەگەڵ کردم. ئاسکێک دیاری دەکەن و تیرێکی داوێتێ لە گوێی دەدا. ئاسکەکە لە تاوان قاچ بەرز دەکاتەوە تیرەکە لە گوێی دەربێنێ، بارامی گۆڕ تیرێکی دی داوێتێ و سمی ئاسکەکە بەگوێیەوە دەدرووی.

*****

دەڵێن: هۆی ئەمرکردنی حەجاجی سەقەفی بە دانانی سەر و ژێر بۆ (قورئان)ی پیرۆز ئەوە بووە، ڕۆژێک قورئان دەخوێنێ تا دەگاتە سەر ئەو ئایەتە کە دەفەرمووێ: (إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ) یانی ئەوە کردەوەیەکی خراپە. لەسەر وێ دەکەوێتە شکەوە

که داخوا به ئیسمی وەخوێنی یان به فیعل. دەڵێ: بچن قورئان خوێنێکم بۆ بانگ بکەن. تا قورئان خوێنەکه دێ ئەو دەڕوا. پیاوەکانی لەترسی حەجاج ناتوانن ئیزنی بدەن دەیگرن، تا دوای شەش مانگ حەجاج دێ له زیندانیەکان دەپرسی و نۆرە دەگاته سەر مامۆستا. حەجاج دەڵێ کابرا تۆ لەسەر چ گیراوی؟ مامۆستا له وەڵامدا دەڵێ: قوربان ئەمن لەسەر گوناحی کوڕی حەزرەتی نووح گیراوم. حەجاج قسەکەی وەبیر دەکەویتەوە و زۆر پێدەکەنی و مامۆستا بەردەدا و ئەمر دەکا که زاناکان کۆوە بن و سەر و ژێر بۆ قورئان دانێن. جا لەو کاتەوە، زانایان ئاوا قورئانیان ڕازاندۆتەوە و بۆیان ئاسان کردووین.

*****

دەڵێن. له زەمانی زوودا عەرەبێکی حیجازی دەچێتە (هەمەدان) و حەوت ساڵ ماڵی لەوێ دەمێنیتەوە. کاتێ دەچێتەوە، دەڵێن: هەمەدان چۆن بوو؟ له وەڵامدا دەڵێ: به قورێم گرت، حەوت ساڵی لێ بووم، هەر دەیانگوت هاوین دێ، هاوین دێ هەر نەهات.

*****

شێخ (ئەبو تورابی نەخشەبی) دەڵێ: جارێک له سەفەرێک به ڕێگایەکدا دەڕۆیشتم، نەفسم ئارەزووی نان و هێلکەی کرد. له ڕێگا لام دا بچم بۆ گوندێک نان و هێلکه بخۆم. زۆری پێنەچوو کابرایەک توند گرتمی و بردمی بۆلای گەورەی ئاواییەکه و گوتی: قوربان ئەوە یەکێکه لەو دزانەی که ڕووتیان کردم. بەقسەی کابرا حەفتا داریان لێ دام. لەوکاتەدا پیاوێکی گوندەکه هات چاوی پێکەوتم و ناسیمیەوە. هاواری کرد و گوتی: بابە ئەوە فلان کەسە چۆن ڕاو و ڕووت دەکا؟ دەستی گرتم و بردمی بۆ ماڵەوە،

کاتێ نان یان هێنا، نان و هێلکه بوو، ڕووم کردە نەفسی خۆم و گوتم: دەبخۆ، نەوە دەردت بێ، تا حەفتا داریان لێ نەدای نەت خوارد.

*****

(نەزیر ئاوا) گوندێکی نزیک شاری (قەزوێن) بووە و مڵکی پیاوێک به ناوی (فەخرولەعالی) کوڕی (نظام الملک) بووە. گەورەی گوندەکه لەگەڵ فەخرولەعالی بەینیان زۆرخۆش دەبێ و کابرا زۆر دەچو بۆلای و ئەویش خۆشی دەیست. ڕۆژێک کابرا دەچێ بۆلای، لەوکاتەدا فەخرولەعالی شانەی بەدەستەوە دەبێ و ڕیشی بەشانه دادێنی. کابرا دەڵێ: قوربان ئەوە بۆ ڕیشت به شانه دادێنی؟ فەخرولەعالی دەڵێ: ڕیش به شانه داهێنان غەمان کەم دەکاتەوە. کابرا دەڵێ: قوربان بۆ ئەوەی

غەمی زۆری هەبن و ڕیشی بە شانە دابێنی غەمی نامێنی؟ فەخرولەعالی دەڵێ بەڵێ. کابرا دەڕواتەوە گوند و دوای یەک دوو مانگ دێتەوە بۆلای فەخرولەعالی و دەڵێ: قوربان شانە حازر بکە. فەخرولەعالی دەڵێ بۆچی شانە حازر بکەم؟ کابرا دەڵێ: ئەمن عەرزت دەکەم، ئەتۆش ڕیشت دابێنە، چونکە غەمێکی زۆرم بۆ هێناوی.

*****

دەڵێن: زانیاری لەهەر شتێکدا بێ ڕۆژێک سودی هەر دەبێ. کابرایەکی وێنەگر لە سەفەرێکدا شەوی بەسەردادێ و دەگاتە قەراغ شارێکی. ڕوو دەکاتە ناو شار و دەچێ بۆ ماڵێک و دەبێتە میوانیان. ماڵەکە ئارەقخۆر دەبن. شەوێ ئارەق دەدەن بە میوانەکەیان و سەرخۆشی دەکەن. ئەویش بە سەرخۆشیەوە ڕاستی پارەکەی دەڵێ و خاوەن ماڵەکە پارەکەی لێ دەستێنی و دەیبا لە دەرەوەی شار بەرەڵدای دەکا. بەیانی کە وەهۆش دێتەوە هەر چۆنێ بێ دەچێتەوە ناو شار و دەچێ لەلای گەورەی شارەکە شکایەت دەکا. گەورەکە دەڵێ. ئەو کەسەی وای بەسەر هێنای دەیناسیەوە؟ دەڵێ نا. گەورەکە دەڵێ ئەی گەڕەک و ماڵەکەیان دەناسیەوە؟ دەڵێ نا. چونکە شەو بوو چوومە ماڵیان. گەورەکە دەڵێ: دەی باشە چۆن دەبێ؟ کابرا دەڵێ: قوربان ئەمن وێنەگرم، ئێستا وێنەی خاوەن ماڵ و ژنەکەی دەکێشم و جەنابت ئەمر بفەرموو بە خەڵکیان نیشان بدەن دەیان ناسن. گەورەکە دەڵێ زۆر باشە. کابرا هەرلەوێ وێنەی خاوەن ماڵ و ژنەکەی دەکێشی و دێن بە خەڵکیان نیشان دەدەن، دەڵێن: بابە ئەوە فلان کەسی حەمام چیە، دەیگرن و پارەی کابرای لێ دەستێننەوە.

*****

(جالینووس) حەکیم و زانایەکی زۆر گەورە و ناسراو بووە. دەڵێن: ئەوەندە خاوەن زەکاوەت و فەراسەت بووە. جارێک چاوی لێ دەبێ باڵندەیەک لە بەرزاییەوە دێ لە ناو ئاوێکدا دەنیشێتەوە و شتێک بە دەندوک لەناو ئاوەکە هەڵدەگری و دەقوونی خۆی دەنێ. زۆری پێناچی دەست دەکا بە ڕیقنە کردن. جالینووس لە کردەوەی ئەو باڵندەوە بۆ قەبز بوون شاف دروست دەکا، جا ئەو زانا و حەکیمە گەورەیە لەگەڵ زەکاوەتەکەیدا لە ئاخری تەمەنیدا کە تووشی نەخۆشی زگچوون دەبێ چاری دەردەکەی خۆی پێناکرێ. ڕۆژێک دەڵێن: تۆ بەو هەموو زانیاریەت، ناتوانی چارەی زگچوونی خۆت بکەی؟ لە وەڵامدا دەڵێ: دا تەشتێکم بۆ بێنن پڕلە ئاو بێ، تەشتە پڕلە ئاوەکەی بۆ دێنن و لەبەر دەمی دادەنێن، دەرمانێکی تێدەکا فەوری ئاوەکە دەمەیی. جالینووس دەڵێ: خەڵکینە تەماشا بکەن دەتوانم ئاو لە تەشت دا بمەیێنم بەڵام دەزانن بۆچی ناتوانم زگچوونی خۆم ڕاگرم؟ چونکە عیلم و زانیاری و

تەجرەبە لە بەرامبەر هاتنی قەزا و قەدەردا هیچ فایدەیان نیە. جا ئەوەیە دەڵێن قەزا ڕەد نابێتەوە.

*****

شەوێک دزێک دەچێ لە شوانی مێگەلێک مەڕێک دەدزێ و دەیباتەوە سەری دەبڕێ و کوت کوتی دەکا و دەیخاتە تەشتێکەوە. پشیلەکەیان دەچێ کوتێک دەفڕێنێ. کابرای دز بە جنێوپێدان وەدوای دەکەوێ و بەردێکی ڕێدالێنێ و سەری پشیلەکە دەشکێنێ. پشیلەی بەستەزمان ڕادەکاتە سەر بانی و ڕوودەکاتەوە کابرا و بە زمانی حاڵ دەڵێ: ئەی دزی بێشەرم و حەیا! بۆو پارچە گۆشتە واکیانت دەرچوو. دەبێ خاوەن مەڕی بێچارە قوڕی کوێ بەسەر داکا. ئەگەر دزی خەراپە تۆ بۆ کردت، ئەگەر خراپیش نیە بۆ سەری منت شکاند؟ سزای دزینی کوتە گۆشتێک سەر شکاندن بێ، دەبێ سزای مەڕ دزینەکەی تۆ چ بێ؟

*****

بەداخەوە زۆربەی شیعرە حورڕەکانی ئێستا وەک ئەو قەسیدە وان کە شاعیرێک بردی بۆلای (ملک الشعرای بەهار) تەماشای بکا و تەقریزێکی لەسەر بنوسێ: مەلیک والشوعەڕا کە تەماشای کرد زۆری بەلاوە سەیر بوو، چونکە قەت شیعری وای نەدیبوو. لەباتی تەقریز ئەو شیعرەی بۆ نوسی:

ئەژ نەسر بەدەر ڕەفتەو و شیعرەش نە تەوان خواند
ماننەدی تەکەلتو کە نە پالان و نە زینەست

واتە ئەو نوسراوەی تۆ لە نەسری تێپەڕاندووە و ناتوانی پێی بڵێ: شیعر. وەک کورتانی عەجەمی وایە کە پێی دەڵێن: تەکەلتوکەنە کورتانە و نە زینە. چونکە کورتان پێش و پاشەکەی بەرزن و زینیش دیارە چۆنە.

*****

چەند ساڵ لەمەوبەر خەیاتێکی کوردی قسەخۆش لە بەغدا بوو بە ناوی (بەشیرموشیر) ئێواران تەواوی ئەدیب و نوسەرە کوردەکانی بەغدا لە دوکانەکەید کۆ دەبوونەوە. ڕۆژێک باسی کوردان دەکەن و دەڵێن: زۆرن و ئێستا عێراق ئەوەند ملیونە و لەوە دوو ملیونی کوردن و ئێران ئەوەندەیە چواری کوردە و تورکیە ئەوەندەیە و شەشی کوردە. بەشیرموشیر تورە دەبێ و دەڵێ قسەی قۆڕ، چین چوا سەت ملیونە، قابیلە سەدی کورد نەبێ؟

*****

عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان عادەتی وابوو، ئەگەر یەکێک لە کارمەند

پیاوەکانی لە شارێکی دوورەوەرا چووبایە لای، بە کابرای دەگوت: چوار شت نەبێ باسی ج دەکەی لەلام، بیکە. یەکەم درۆم بۆ مەکە، چونکە کە درۆت کرد بە ڕاستیەکەشت باوەڕ ناکرێ. دووەم چیم لێ پرسی وەڵامی ئەو پرسیارەم بدەوە و شتی دیکەی تێکەڵ مەکە. سێیەم قەت بە بەژن و باڵامدا هەڵمەڵێ، چونکە تۆ قەت وەک خۆم خۆم ناناسی. چوارەم هەڵم مەنێ بۆ خەراپە کردن لەگەڵ خەڵک، چونکە ئێمە بۆ خزمەتی خەڵک بووینە کاربەدەست. لەو چوار شتانە زیاتر چیت پێخۆشە بیڵێ.

*****

جارێک عەبدولمەلیک بەتوڕەییەوە نامەیەک بۆ حەجاج دەنوسی. لە ئاخری نامەکەدا دەنوسی ئەتۆ لە لای من وەک سالم وای. کاتێ نامەکە دەدەن بە حەجاج و دەیخوێنێتەوە مەعنای ئەوە نازانی. نامەکە بە پیاوێکدا دەنێری بۆلای (قوتەیبە)ی کوڕی موسلیم. کاتێ پیاوەکەی نامەکە دەدا بە قوتەیبە، بایەکی لێ دەبێتەوە، کابرا زۆر خەجاڵەت دەبێ. قوتەیبەش کە کابرا ترەکەی لێ بەر دەبێ لەباتی ئەوەی بڵێ: (اُقْعُدْ) واتە دانیشە، لێی غەڵەت دەبێ و دەڵێ: (اُضْرُطْ) واتە تڕ بەردە، کابرا دەڵێ: قوربان بەرم دا. قوتەیبە دەڵێ: کاکە داوای لێبوردنت لێ دەکەم ویستم بڵێم (اُقْعُدْ) زمانم هەڵەنگوت. کابرا گوتی: قوربان جا پێویست بە لێبوردن ناکا، بوو بە سەربەسەر، منیش غەڵەتم کرد و جەنابیشت کردی. قوتەیبە زۆر پێدەکەنی و دەڵێ: ڕاستە هەردووکمان غەڵەتمان کرد، بەڵام غەڵەتەکان فەرقیان زۆر بوو، غەڵەتی من بە دەم بوو، بەڵام غەڵەتی تۆ بە قوون. گوتی: بچووە لای حەجاج تا تووشی غەڵەتی تر نەبووین و پێی بڵێ سالم عەبد و بەندە و ئەسیری کابرایەک بوو قسەی خەڵکی بۆ دێنا و نەمامی دەکرد.

*****

ڕۆژێک عەبدولمەلیک گوتی: ئەمن لە مانگی ڕەمەزاندا لە دایک بووم و لە مانگی ڕەمەزاندا لە مەمک کراومەوە و لە مانگی ڕەمەزاندا خۆم ناسیوە و لە مانگی ڕەمەزاندا قورئانم خەتم کردووە و لە مانگی ڕەمەزاندا کراوم بە وەلی عەهد و لە مانگی ڕەمەزاندا بوومە خەلیفە و لام وایە هەر لە مانگی ڕەمەزانیشدا دەمرم.

*****

دەڵێن ڕۆژێک تووشی شەیتان بوون زۆر نارەحەت بوو، گوتیان: ئەوە بۆ وا داماوی؟ لە وەڵامدا گوتی: لەداخی سیاسەتمەدارەکانی ئەو زەمانە، چونکە هەر یەکەیان بۆتە شەیتانێک و بوونی من سودی نەماوە.

*****

ئیمام (فەخری ڕازی)خوای لێ ڕازی بێ، دەڵێ: لە ساڵی شەش سەت و پەنجا و شەشدا (هۆلاکۆ) عولەما و زانای بەغدای کۆ کردەوە و گوتی: دەبێ بۆم ڕوون کەنەوە داخوا موسوڵمانی زاڵم باشترە یان کافری عادڵ؟ دەڵێ: زۆربەی زاناکان دامان وەڵامیان بۆ نەدرایەوە تا (ئیبن و طاووسی عەلەوی) وەلامی دایەوە و گوتی: کافری عادڵ لە موسوڵمانی زاڵم باشترە.

*****

قەدیمیان گوتویانە ئەگەر لە مەجلیسێ لە خۆت زاناتر دانیشتی پرسیاری لێ بکە تا سوودی لێوەرگری و ئەگەر لەگەڵ یەکی وەک خۆت دانیشتی بەنۆرە قسە بکەن. ئەگەر لەگەڵ نەزان دانیشتی و زانیت لە ئامۆژگاری سوود وەردەگری ئامۆژگاری بکە، بەلام کە زانیت وەری ناگری دەنگ مەکە.

*****

هارونەڕەشید جارێک دەچێ بۆ (بەسرا)، قازی (ئەبو یوسف)ی لەگەڵ دەبێ. قازی شاری (واسط) کە دەزانی هارونەڕەشید بەوێدا دەڕوا داوا لە خەڵک دەکا، لە لای هارونەڕەشید تەعریفی بکەن، بەلام کەس بەقسەی نەکرد، کاتێ هارونەڕەشید نزیک بۆوە قازی هاواری دەکرد و دەیگوت: قازیەکەمان زۆر قازی چاکە. هارەنەڕەشید ڕووی کردە قازی ئەبو یوسف و گوتی: وادیارە ئەو قازییە خەراپترین قازییە، بۆ لە تەواوی خەڵکی ئەو شارە هەر یەکێک دەڵێ: قازییەکەمان قازی چاکە؟ قازی ئەبو یوسف پێدەکەنی و دەڵێ: قوربان لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە ئەوە قازی بۆخۆیەتی هاوار دەکا. هارونەڕەشید زۆر پێدەکەنی و دەڵێ: با هەر قازی بێ.

*****

کاتێ (وەلید)ی کوڕی عەبدولەلیک ویستی مزگەوتی جامیعی (دیمشق) دروست بکا، بە خەڵکی گوت: دەبێ هەر نەفەری خشتێک هەڵگری و بیهێنێ. تەواوی خەڵکی شاری چوون یەکی خشتێکیان هەڵگرت و بردیان. زیاد لە هەمووان کابرایەک دوو خشتی هەڵگرتبوو. وەلید کە چاوی پێکەوت گوتی: تۆ خەڵکی کوێی؟ کابرا لە وەلامدا گوتی: خەڵکی عێراقم. وەلید گوتی: ئای لە خەڵکی عێراق، ئێوە زیادەڕەوی دە هەموو شتێکدا دەکەن، تەنانەت لە تاعەتیشدا.

*****

دەڵێن: لە شاری مەدینە (کوسەیر) مرد بوو. خەڵک زۆری پەرۆش بوو ژن و پیای

مەدینە بۆی دەگریان، تەنانەت ئیمام (محەممەد باقر) لەگەڵ جەنازەکەی بوو، ویستی تەشریفی بچێ دەستێک وەبەر تابووتەکەی بدا، لەبەر ژنان ڕێگای نەبوو. نارەحەت بوو فەرمووی: دە ڕێگام بکەن ئەی ئەوانەی کە حەزرەتی (یوسف)تان تووشی بەڵا کرد. دەڵێن: ئافرەتێک وەدەنگ هات و گوتی: ئێمەی ئافرەت خەراپترین، یان ئێوەی پیاو؟ ئێمە حەزرەتی یوسف مان دەعوەت کردووە بۆ خواردن و خواردنەوە و عەیش و ڕابواردن، بەڵام ئێوەی پیاو حەزرەتی یوسف تان خستە بیرەوە و بەنرخێکی ئەرزان فرۆشتتان و کردتان بە غوڵام و بەندە و ئاخری بەوەش نەوەستان و خستتانە بەندیخانەوە.

*****

دەڵێن: یەکەم کەس کە نوسینی زمانی عەرەبی بەشێوەی نوسینی (کوفی) دانا خەڵکی شاری (ئەنبار)ی عێراق بوو. تا محەممەدی کوڕی عەلی، کوڕی حوسێنی، کوڕی موقلە. ئەوکاتە عەلی کوڕی هیلالی کاتب هێنایە سەر ئەو شێوە نوسینەی ئێستا.

*****

سەبارەت بە فەصاحەت و بەلاغەتی قورئانی پیرۆز دەڵێن: ئەوەندە فەصیح و بەلیغە و مانای زۆر بە لەفزی بچووک ئەدا دەکا، کە جارێک عەرەبێک گوێی لە پیاوێک دەبێ قورئان دەخوێنێ، کاتێ دەگاتە سەر ئەو ئایەتە کە دەفەرمووێ: (فَاصْدَعْ بِماتُؤمَرُ)، عەرەبەکە سووجدە دەبا، دەڵێن: ئەوە بۆ سووجدەت برد، خۆ ئایەتی سوجدە نەبوو؟ لە وەڵامدا دەڵێ: دەزانم کە ئایەتی سوجدە نیە، سوجدەم بۆ فەصاحەت و بەلاغەتەکەی برد.

*****

جارێک کابرایەک لە زانایەک دەپرسی دەڵێ: ئێوە دەڵێن قورئان مانای زۆر شتی تێدایە، زاناکە دەڵێ بەڵێ، کابرا دەڵێ: دە لە قورئان دا وێنەی ئەو قسەم بۆ بێنەوە کە دەڵێن: (الجارُ قَبْلَ الدّارِ) یانی لەپێش کڕین و دروست کردنی خانودا ئەحواڵی دراوسێکانی بپرسە، ئەگەر باش بوون ئەوسا خانوەکە بکڕە یان ئەرزەکە بکە بە خانو. زاناکە دەڵێ: وێنەی ئەوە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێ: (وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً لِلّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فرعونَ إذْ قالَتْ رَبِ ابنِ لِي عِنْدَ كَ بَيْتاً فِى الْجَنَةِ). یانی خوای گەورە وێنەی هێناوەتەوە بۆ ئەو کەسانەی ئیمانیان هێناوە بە ژنی فیرعەون کاتێ گوتی ئەی خوای گەورە خانویەکم بۆ دروست بکە لە خزمەت خۆت لە بەهەشتدا. دەڵێ: ئەوە نیە لەوێ خێزانی فیرعەون ئاسیەی کچی مەزاحیم داوای جاری

قەبلەداری کردووە کە دەڵێ: خانویەکم بدەیە کە جیرانی خۆت بێ؟ کابرا زۆری پێ خۆشبوو گوتی بەڕاستی وێنەیە.

*****

دەڵێن: کاتێ حەجاج (سەعید)ی کوڕی جوبەیری گرت و ویستی شەهیدی بکا گوتی: خۆت سەریشک بە تا چۆن دەڵێی ئاواتِ بکوژم. لە وەلامدا فەرمووی: تۆ سەریشک بە چۆنت پێخۆشە باوابێ، چونکە قیصاص و تۆڵەت لەپێشدایە.

*****

دەڵێن: جارێک حەجاج بە (یەحیا)ی کوڕی سەعید دەڵێ: تۆ لە ناشیرینیدا وەک شەیتان دەچێ. ئەویش لە وەلامدا دەڵێ: باشە بۆ ئەوەندەت پێناخۆشە کە گەورەی ئینسانان وەک گەورەی ئەجیننان بچێ.

*****

دەڵێن: (بەهرامی گۆڕ) جارێک لە ڕاوێ لە پیاوەکانی دوور دەکەوێتەوە، تەماشا دەکا شوانێک لەبن دارێک دانیشتووە، دەچێ بۆلای و لە ئەسپەکەی دادەبەزی و بە شوانەکە دەڵێ: کاکە ئەو ئەسپەم بۆ بگرە کاری ئاوم هەیە. شوانەکە جڵەوی ئەسپەکەی دەگری تەماشا دەکا بە ئاڵتوێن داکوتراوە، لەبەر خۆیەوە چەقۆیەک دەردێنی و دەست دەکا بە لێکردنەوەی (لیران). بەرامی گۆڕ لەسەر میز کردنەکەی چاوی لێ دەبێ، بەڵام بۆ ئەوەی کە کابرا نەزانێ چاوی لێ یە، سەر بەردەداتەوە خۆی دەخافڵێنێ.

لەپاشان بانگی شوانەکە دەکا و دەڵێ: کاکە ئەسپەکەم بۆ بێنە، ئەوەندەم تۆز چووە دەچاوانەوە هیچ نابینم. کابرا ئەسپەکەی بۆ دێنی، بەڵام بارامی گۆڕ بۆ ئەوەی کابرا خەجاڵەتی نەیگرێ تەماشای جڵەوی ئەسپەکەی ناکا و سوار دەبێ، کابرا نازانێ کە ئەوە بارامی گۆڕە، دەڵێ: ئەی پیاوی چاک ئەوە یەکەمجارە کا ڕێگام بکەوێتە ئێرە، جارێکی دی چاوم بێرە ناکەوێتەوە، بارامی گۆڕ دەزانێ کا کابرا مەبەستی چیە دەڵێ: منیش ڕێبوارم و جارێکی دی بێرەدا نایەمەوە. کاتێ بارامی گۆڕ دەچێتەوە، بانگی پیاوەکانی دەکا و دەڵێ: ئاڵتونی جڵەوی ئەسپەکەم با کابرایەک بەخشی، کەس تاوانبار نەکەن بە دزینی.

*****

ئەبو جەعفەری مەنسور ئەمر دەکا پیاوەکانی بەرگی ڕەش بپۆشن و کڵاوی قوو و قووچ لەسەر نێن و شیر دەشان کەن و لە پشتی کالانی شیرەکەیان بنووس (فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ). ئەبو دولامە بەمجۆرە دەچێتە لای ئەب

جەعفەر، ئەبو جەعفەر دەڵێ: حاڵت چۆنە؟ ئەبو دولامە لە وەڵامدا دەڵێ: حاڵم زۆر خەراپە. ڕوخسارم نیوەییە، شیرم بە قونیوەیە، بە بۆیەی ڕەش بۆیە کراوم، (قورئان)م لە دوا خۆمەوە داناوە. ئەبو جەعفەر زۆر پێدەکەنی و خەلاتی دەکا.

*****

بوک و زاوایەک بە جووتە دادەنیشن، پیرێژنێکی زۆر ناشیرین دێ دەچێ لەبەینیاندا دادەنیشی. شێخ (برایمی) حوڕانی چاوی پێدەکەوێ و فەوری دەڵێ:

تَنَبَّهُوا أَيُّها الشَّادُونَ وَ ا بْتَدَرُوا.
اِلِي الْمعازِفِ وَ النَّايَاتِ وَ الْوَتَرِ
وَ خَلِّصُوا الْبدْرَ مِنْ حُوتِ الْخُسُوفِ اُمَا
رَأَيْتُمُ الأرضَ بَيْنَ الشَّمسِ وَ الْقَمَرِ.

دەڵێ: ئاگادار بن ئەی دڵخۆشەکان و بەپەلە دەست بدەنە عود و نایە و کەمان، چونکە مانگ گیراوە، نابینن کە عەرز هاتۆتە بەینی مانگ و ڕۆژەوە.

*****

دەڵێن: ڕۆژێک (لووقمان)ی حەکیم ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد، گوتی: کوڕم ئەگەر ویستت، دۆست و برادەر بگری بۆ تەجرەبە تورەی بکە، جا ئەگەر لەکاتی تورە بونیدا بەئینصاف بوو لە ئەندازەی تێنەپەڕاند ئەوە بە دۆست و برادەی بزانە دەنا وازی لێ بێنە.

*****

کابرایەکی (حەمباڵ) کۆڵێکی گرانی بە پشتەوە بوو، لە ڕێگادا تووشی (شەعبی) دەبێ، کۆڵەکەی دادەنێ و دێ دەڵێ: قوربان پرسیارێکم هەیە. شەعبی دەڵێ: فەرموو. کابرا دەڵێ: قوربان ژنی شەیتان ناوی چییە؟ شەعبی لەسەرەخۆ دەڵێ کاکە ببورە ئەمن شاهیدی مارەکردنەکەی نەبووم.

*****

دەڵێن: عەرەبێک چەند درهەمی قەڵب دەبا بۆلای صەڕاف و دەڵێ: بۆم وەگۆڕە. صەڕافەکە تەماشایان دەکا زێو نابن، قەڵبن. دەڵێ: کاکە پارەکانت قەڵبن. ناوەکەیان مسە، زێو نیە. کابرا دەڵێ: چۆزانی؟ صەڕاف دەڵێ: ئەگەر ڕازی بی یەکیان لەت دەکەم، بەڵام کەوا بوون بۆت نابژێرم. کابرا دەڵێ: زۆر باشە. کە لەتی دەکا وادەبێ. کابرا دەڵێ: باشە پارەکەم بۆ مەکۆڕەوە، بەڵام پێم بڵێ: داخوا کەی دەمرم، دیارە تۆ عیلمی غەیبیت هەیە، دەنا چۆزانی.

*****

زۆر سەیرە، دەڵێن: ئەگەر پیاو غەرق بوو، خنکا و لەپاشان سەرئاو کەوتەوە لەسەر پشت سەراو دەبێ، بەڵام ئافرەت بە پێچەوانە، لەسەر دەم و چاو سەراو دەبێ. هەروەها دەڵێن: هەموو حەیوانێک کە بکەوێتە ناو ئاوەوە، دەکەوێتە مەلە کردن، ئینسان و مەیمون و ئەسپی چەپەک نەبێ، ئەوان غەرق دەبن، مەگەر ئینسانێک فێری مەلە بووبێ.

*****

شێخ (عەبدو لعەزیز)ی ب شیری پیاوێکی زۆر ئەدیب و قسەخۆش دەبێ و دەبێتە قازی میسر. جارێک (فەریق برایمی) فەتحی کە وەزیری دیفاع دەبێ، دەچێتە مەجلیسی. لەبەینی قسەی خۆش و نووکتەدا دەڵێ: ئەرێ جەنابی قازی ئەوە ڕاستە دەڵێن: (پێغەمبەر) درووودی خوای لەسەر بێ لە حەدیسدا فەرموویەتی: (قاضٍ فی الْجَنَّةِ وَ قاضِیانِ فی النّارِ). یانی هەرلە سێ قازی دووانیان دەچنە دۆزەخەوە؟ چونکە قازی وا هەیە بە نەزانین فتوا دەدا. ئیواشە دەزانێ، بەڵام لە حەق لا دەدا، قازی واش هەیە زانا و عادڵە. قازی لەسەرەخۆ دەڵێ بەڵێ: بەڵام ئەوەش بزانە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ: (فریقٌ فی الْجَنَّةِ وَ فَریقٌ فی السَّعیرِ). واتە هەرلە دوو فەریق، فەریقێک دەچێتە بەهەشت و یەکێک دەچێتە دۆزەخ.

*****

هەر ئەو قازی عەبدولعەزیز بەشیرە، ڕۆژێک عەباکەی دادەنێ و دەچێ دەستنوێژ هەڵگرێ، تا دێتەوە یەکێک لە دۆستە ئەدیبە هونەرمەندەکانی دەچێ وێنەی سەرە کەرێک لەسەر عەباکەی دەکێشێ. کاتێ قازی لە دەستنوێژ هەڵگرتن دێتەوە و عەباکەی لەبەر دەکاتەوە و چاوی بە وێنەکە دەکەوێ، لەسەرەخۆ دەڵێ: ئەرێ کوڕینە ئەوە کامەتان دەم و چاوی خۆی بە عەباکەی من سڕیوەتەوە؟

*****

ئافرەتێک دەچێتە لای قازی شکایەت لە کابرایەک دەکا. قازی دەڵێ. (جامَعَکِ شُهُودُکِ). یانی شاهیدت لەگەڵ خۆت هێناوە؟ بەڵام ئافرەتەکە بە پێچەوانە حاڵی دەبێ، وا دەزانێ قازی دەڵێ: شاهیدەکەت کاری وای لەگەڵ کردووی؟ ئافرەتەکە زۆر خەجالەت دەبێ. کاتبی قازی تێدەگا و دەڵێ: خوشکم جەنابی قازی دەڵێ: (جاءَ شُهُودُکِ مَعَکِ) واتە شاهیدت لەگەڵێ؟ ئافرەتەکە دێتەوە سەرخۆ و دەڵێ: بەڵێ، بەڵام ئەی بۆ قازی وەک تۆی نەگوت؟

*****

جارێک لە مەجلیسێکدا باسی حەق گوتنیان دەکرد، گوتیان: ئینسان دەبێ حەق

بلێ، با لەسەر گوتنەکەش تووشی ئەزیەت و ئازار ببێ. لە مەجلیسەکەدا کاربەدەستێکی گەورەی لێ دەبێ دەڵێ: لە قسەی وەرا کەوتەوە یادم کە باوکم بەڕەحمەت بێ، جارێک لەسەر حەق گوتنێک زۆری لێدام. شێخ عەبدولعەزیزی قسەخۆش دەڵێ: لام وایە لەوکاتەوە قەت حەقت نەگوتۆتەوە؟

*****

(محەممەد)ی بابلی قسەخۆش و نوکتەباز، جارێک لە تەماشا کردنی موسابەقەی غارغارێندا ئافرەتێکی لە تەنیشت دەبێ، ڕوو دەکاتە ئافرەتەکە و دەڵێ: تۆ لەسەر کام ئەسپ یاری دەکەی؟ ئافرەتەکە زۆر زیرەک دەبێ، لە قسەکەی حاڵی دەبێ و لە وەڵامدا دەڵێ: بۆ دەبییە شەریکم لەسەر سواری ئەسپەکە؟ بابلی زۆر لەو ورياتر دەبێ، دەڵێ: شەریکی تۆ ناکەم، بەڵام شەریکی مێردەکەت دەکەم.

*****

پیاوێکی کاتۆلیکی (ئیرلەندی) زەلامێک دەکوژێ. دەیگرن و لەلای قازی ڕاستی دەڵێ. دەڵێ بۆ پارەکەم کوشتووە. قازی دەڵێ چەندی پێبوو؟ کابرا دەڵێ: (نیو جونەی). قازی دەڵێ: چیت لەو پارە کەمە کرد؟ دەڵێ دام بە ئاردق. قازی دەڵێ چیدی پێبوو؟ کابرا دەڵێ خواردنەکەی نەبێ هیچی دی پێنەبوو. قازی دەڵێ خواردنەکەت چ لێکرد؟ کابرا دەڵێ نانەکەم خوارد و گۆشتەکەم فرێدا. قازی دەڵێ گۆشتەکەت بۆ فرێ دا؟ کابرا دەڵێ ئاخر ئەمرۆژە ڕۆژی جومعە بوو بە دینی منیش خواردنی گۆشت لە ڕۆژی جومعەدا حەرامە.

*****

کابرایەک لەسەر دزی دەگرن و دەیبەن بۆلای قازی. قازی لە حوکمەکەیدا دەنوسێ: دەبێ پازدە هەزار لیرەی نەغد بدا. کاتێ بۆ کابرای دەخوێننەوە دەڵێ: جەنابی قازی لێت ناشارمەوە، بۆ ئەوەی ئەمری جەنابت بێتەدی پێویستبم بە عەمەلیاتێکی دی هەیە.

*****

یەکێک سەیارەیەک دەدزێ. دەیگرن و دەیبەن بۆلای قازی. قازی دەڵێ کوڕم ئەو سەیارەت بۆ دزی؟ کابرا لە جوابی قازیدا دەڵێ: قوربان سەیارەکە لەبن دەرگای قەبرستانێکدا ڕاگیرابوو، وەمزانی کە خاوەنەکەی مردووە. قازی دەڵێ: سەیارەکە بدەوە بە خاوەنەکەی و ئەمجارە عەفووبە. بەڵام بەو شەرتە کە جارێکی دی نەتهێننەوە لام. کابرا دەڵێ جەنابی قازی زۆر سوپاس، ئەگەر جارێکی دی پۆلیس گرتیانم ئەوەیان پێدەڵێم.

*****

دەڵێن: ژنان زۆریان پێناخۆشە ڕاستی تەمەنی خۆیان بڵێن. جارێک ئافرەتێک دەبەن بۆلای قازی. قازی دەڵێ کچم عومرت چەندە؟ ئافرەتەکە ڕادەوەستێ و دەنگ ناکا. قازی دەڵێ: ئەگەر درەنگ وەڵام بدەیتەوە تەمەنت زیاد دەبێ. ئافرەتەکە لەترسی تەمەن زیادی فەوری دەڵێ بە قوربانت بم جەنابی قازی ئەوەندە ساڵەم.

*****

جارێک دادگا حوکمی ئیعدامی کابرایەک دەدا و تا وەختی ئیعدام کردنەکەی دەیبەن بۆ زیندان. لەوێدا دەبێتە برادەری زیندانەوانەکە. ڕۆژێک برادەرەکەی شوشەیەک ئارەق دەکڕێ و دەچێ لە لای برادەرەکەی دەست دەکا بە ئارەق خواردنەوە. لەکاتی مەستیدا دەڵێ: دەکاکە وەرە پەرداخێک وەخۆ. (واللەالعظیم) پیالەیەکی مردوو زیندوو دەکاتەوە. کابرا زۆر پێدەکەنی و دەڵێ دەبۆم هەڵگرە بۆ دوای ئیعدام کردنەکەم.

*****

دەڵێن: جارێک دوکتۆرێک لە ناو کۆمەڵێکدا خۆی هەڵدەنایەوە و دەیگوت: ئەوەتی ئەمن تەداوی خەلک دەکەم کەس نەهاتۆتەوە لام گلەیی هەبێ. کابرایەک وەدەنگ هات و گوتی ئاخر دوکتۆر هەمووت کوشتوون، چۆن بێنەوە گلەیی بکەن.

*****

پیاوێکیان بردە لای دوکتۆر گوتیان: عەقڵی تێکچووە. دوکتۆر گوتی: قەت جاری وا هەبووە کە لە ماڵەوە گوێت لە دەنگێک بێت و خاوەن دەنگەکە نەبینی یان قسەی لەگەڵ بکەیت و قسەت لەگەڵ بکا؟ گوتی بەڵێ بەزۆری. دوکتۆرکە گوتی: دیارە شێت بووە. گوتی بەتایبەتی لەچ کا تێکدا ئاوا دەبینی؟ کابراگوتی لەکاتێکدا کە بە تەلەفۆن قسە دەکەم.

*****

ئافرەتێک دەچێتە خزمەت حەزرەتی عومەر شکایەت لە مێردەکەی دەکا و دەڵێ: قوربان مێردەکەم بە زۆری بە ڕۆژ بەڕۆژو دەبێ و بە شەو تا بەیانی نوێژ دەکا. حەزرەتی عومەر دەڵێ: دیارە زۆر پیاوی چاکە. ئافرەتەکە دوو سێ جار ئەو قسە دووبارە دەکاتەوە، حەزرەتی عومەر هەر ئەو وەلامەی دەداتەوە. (کەعبی ئەسەدی) لە خزمەتی دا دەبێ دەڵێ: قوربان ئەو ئافرەتە شکایەت لە مێردەکەی دەکا بە کینایەوە دەڵێ لەگەڵم نانوێ. حەزرەتی عومەر دەڵێ: دەی وەک لە مەبەستی گەیشتووی دادیشی بپرسە. کەعب بە ئافرەتەکە دەڵێ: بچۆ مێردەکەت بانگ بکە.

ئافرەتەکە دەچێ مێردەکەی دێنێ. کەعب بە مێردی ئافرەتەکە دەڵێ: خێزانەکەت گلەیی لێت هەیە. کابرا دەڵێ: لەسەر نان و نەفەقە شکایەتی لێکردووم؟ کەعب دەڵێ: نا. ئافرەتەکە وەدەنگ دێ و دەڵێ:

(اِلبِي خَلِيلِي عَلَى فِراشي مَسْجِدَهْ. زُهْدُهُ فى مَضجَعِي وَ تَعَبُّدَهْ. نَهارُهُ وَ لَيلُهُ ما يَرْقُدَهْ... فلستُ فى اَمرِ النِساءِ اَحْمَدَهْ.)

واتە، ئەی خوایە خۆشەویستەکەم لەسەر جێگا، لە سوجدە دایە. لەجێگادا زوهد و عیبادەت دەکا. شەو و ڕۆژ نانووێ. ئەمن سەبارەت بە کاری ژنان لێی ڕازی نیم. مێردەکەی لە وەلامدا دەڵێ:

(زَهَدْتُ فى فِراشِها وَ فى الحَجَلْ . إنيّ امرَؤٌ اَذهَلَنِي ما قَدْ نَزَلْ. فى سُورةِ النَّحْلِ وفى السَبْعِ الطِوالِ. وَ فى كتاب اللهِ تَخْوِيفُ جَلَلْ.)

ئەمن زوهد و تەقوای خوا دەکەم لەسەر جێگا و لە ژووری بووک دا. ئەمن پیاوێکم کە نزولی ئایەتی قورئان منی تۆقاندووە. بەتایبەتی سورەی نەحل و حەوت سورەتە درێژەکان، بەڕاستی کەلامی خوا زۆر ترسێنەرە. ئنجا کەعب دەڵێ:

(إنَّ لَها حَقاً عَلَيكَ يا رَجُلْ. نَصِيبُها فى اَرْبَعٍ لِمَنْ عَقَلْ. فَاَعْطِها ذاكَ وَدَعْ عَنكَ العِلَلْ.)

کاکە ئەو ژنە حەقی بەسەرتەوەیە، ئەوەی عەقڵی هەبێ دەبێ هەر لە چوار شەودا جارێک بچێتە لای ژنەکەی. دە ئەتۆش ئەو حەقەی بدەیێ و ئەو بەهانانەی ببڕە. لەپاشان کەعب گوتی: خواوەندی گەورە تا چوار ژنی بۆ تۆ حەلال کردووە، یانی تۆ بۆت هەیە سێ شەو نەچی بۆلای، بەلام شەوی چواردەم حەقی ژنەکەیە دەبێ لە لای بی. حەزرەتی عومەر کە ئەو قەزاوەتەی لە کەعب دی، فەرمووی: بەخوا سەرم سوڕماوە، نازانم کامە کارەت عەجایب ترە؟ حالی بوونت لە کینایەی ئافرەتەکە یان قەزاوەتەکەت. فەرمووی: برۆ ئەوا کردمی بە قازی شاری بەسرە. کەعب هات بوو بە قازی شاری بەسرە، تا لە شەڕی (جەمەل)دا لەگەڵ حەزرەتی عایشە کوژرا.

*****

ئافرەتێک مێردەکەی دەمری، تەنیا باغێکی هەنجیری لەپاش بەجێ دەمێنێ. ئافرەتەکە حەفتەی جارێک دەچوو هەنجیرەکەی دەچنین و دەی بردن لە بازاڕ دەیفرۆشتن و گوزەرانی پێدەکردن. ئاخری کابرایەک پێیان فێر بوو. شەوەکی دەچوو دەیچنین. ئافرەتەکە چوو لە لای حاکم شکایەتی کرد حاکمەکە زۆر زیرەک بوو. بە ئافرەتەکەی گوت: ئەمرۆ هێندێک (جۆ) بەرە و هەر هەنجیرێکی زانیت بۆ بەیانی دەگا دەنکە جۆیەکی تێڕۆکە. ئافرەتەکە بەقسەی حاکمی کرد. ڕۆژی دوایی

کەچوو تەماشایان بکا، هەنجیرەکان چنرا بوون. چووە بە حاکمی گوت. حاکم داروغەی بانگ کرد و گوتی: بچۆ لە لای هەموو هەنجیر فرۆشێک هەنجیر بکڕە و هەر یەکە بەجیا ناوی دوکاندارەکەی لەسەر زەرفەکەی بنوسە و بۆم بێنە. داروغە چوو لە لای هەموو هەنجیر فرۆشەکان هەنجیری کڕی و ناوی دوکاندارەکەی لەسەر نوسی و هێنانی بۆ حاکم. حاکم کە تەماشای کردن لە زەرفی یەکیاندا هەنجیرەکان دەنکە جۆکەیان تێدابوو. دوکاندارەکەی بانگ کرد و گوتی: ئەو هەنجیرەت لە کێ کڕیون؟ گوتی: لە فلان کەسی. ناردی کابرایان هێنا. کابرا ڕاستی دزییەکەی گوت و پارەی هەنجیرەکانی بۆ ئافرەتەکە لێ ستاندەوە.

*****

پیاوێک کوڕێکی دەبێ دەینێرێتە لای مەلا (قورئان) بخوێنێ. لەپاش ماوەیەک ڕۆژێک باوکەکەی بە کوڕەکەی دەڵێ: کوڕم داوەرە بزانم گەیشتوویە چ سوڕەتێک؟ کوڕەکە گوتی: گەیشتوومە سوڕەی (اُقسِمُ بِهذا اَلبلدِ وَ والدٍ بِلاَ وَلَدٍ) باوکەکەی پێکەنی و گوتی: ئەشەدەم ب(الله) ڕاست دەکەی، کەسێک ئەتۆی کوڕ بێ، بێ کوڕە.

*****

کوڕێک دەچێتە بەغدا. لەپاش ماوەیەک نامەیەک بۆ بابی دەنوسی و هەرچەند دەکا ناسیاوێکی دەست ناکەوێ نامەکەی پێدا بنێرێتەوە بۆ باوکی. نامەکە هەڵدەگری و دەڕواتەوە و دەڵێ: بابە زۆرم پێ ناخۆشبوو خەبەری منت دردنگ پێ بگا، کەسیش نەبوو نامەکەی پێدا بنێرمەوە، ئەوە بۆ خۆم هێنامەوە فەرموو ودیخوێنە.

*****

زانایەکی (شەرع) زان لە زانایەکی (نەحو) زان دەپرسێ و دەڵێ: دەزانم جەنابت زۆر نەحو زانێکی باشی، بەڵام با پرسیارێکی شەرعیت لێ بکەم. زاناکە دەڵێ: فەرموو. شەرع زانەکە دەڵێ: ئەگەر نوێژکەرێک لە نوێژەکەیدا سەهوی کرد و لەپاشان دوو سوجدەی سەهوی برد و لە سوجدەی سەهوەکەیدا سەهوی کردەوە، چی لە سەرە؟ نەحو زانەکە تۆزێک ڕاما و لەپاشان گوتی: هیچی لەسەر نیە. شەرع زانەکە گوتی: بۆ؟ نەحو زانەکە گوتی: چونکە لە عیلمی نەحودا (تەصغیر) تەصغیر ناکرێتەوە، ئەو دوو سوجدەش تەواوکەری نوێژن، کەواتە هەر وەک تەصغیر تەصغیری نیە، تەواویش تەواوی نیە.

*****

ئاغایەک قلیان کێش دەبێ. ڕۆژێک بە پیاوەکەی دەڵێ: داوەرە پشکۆیەک لەسەر

قلیانەکە دانێ. کابرا بە مەقاش پشکۆیەک هەڵدەگری و دەیبا لەسەر قلیانەکەی دادەنێ. ئاغا بۆ گاڵتە پێکردن قلیانەکە دەبزێوێ و پشکۆکە بەردەداتەوە. پیاوەکەی بە مەقاشەکە هەڵیدەگریتەوە و بۆی لەسەر دادەنێتەوە، ئاغا دوبارە بەری دەداتەوە. پیاوەکەی تورە دەبێ و بە دەستی پری دەداتێ و لەسەر قلیانەکەی دادەنێتەوە و دەڵێ: ئۆف دەستم سووتا. ئاغاکە لەسەرەخۆ دەڵێ: هیچ نیە، دەستی شەیتانی سووتا. پیاوەکەی دەڵێ: ناوەاللە ئاغا دەستی پیاوەکەی نەسووتا. دەستی ئاغاکەی سووتا.

*****

ڕۆژێک (وەلید)ی کوڕی (یەزید) دەچێ بۆلای هیشامی کوڕی عەبدولمەلیک. وەلید مەندیلێکی زۆر گران بەهای لەسەر دەبێ، هیشام تەماشای دەکا و دەڵێ: ئەو مەندیلەت بە چەند کڕیو؟ وەلید دەڵێ: بە هەزار درهەم. هیشام پێی زۆر دەبێ و دەڵێ: هەزار درهەم؟ وەلید دەڵێ: تۆ هەزار درهەمی مەندیلەکەی من بە زۆر دەزانی بۆ گەورەترین ئەندامی بە دەنم کڕیوە کە سەرە، بەڵام ئەو دە هەزار درهەمەی کە دوێنێ جەنابت دات بە جارییەک بۆ نزمترین ئەندامت پێت زۆر نەبوو؟

*****

(ئەسمەعی) دەڵێ: ڕۆژێک (قورئان)م دەخوێند، کابرایەکی عەرەبم لە لا دانیشتبوو، گەیشتمە سەر ئایەتی (والسّارِقُ وَ السّارِقَةُ)، گوتم (والسّارقُ و السارقةُ فا قْطَعوُا أيديهما جزاءً بما كسبا نكا لاً مِنَ اللّهِ وَ اللّه ُغفورٌ رحيم). کابرای عەرەب نەخوێندەوار بوو، تەماشای کردم و گوتی: ئەوە کەلامی کێ یە؟ گوتم قورئانە و کەلامی خوایە. گوتی: کەلامی خوا نیە. گوتم چوزانی کەلامی خوا نیە؟ گوتی: چۆن غەفوور و ڕەحیم بێ دەستیان دەبڕێ؟ ئەسمەعی دەڵێ: تەماشا دەکەم بە غەڵەتم خوێندۆتەوە، لە باتی واللّه عزيزٌ حكيم، بە وا للّە غفورٌ رحيم خوێندۆتەوە. دەڵێ: کە ڕاستم کردەوە گوتی: ئەوە کەلامی خوایە.

*****

ڕێبوارێک زۆری برسی دەبێ، دەچێتە ماڵێک دەڵێ: زۆرم برسییە، ڕەحمەتی خواتان لێ بێ نانێکم بدەنێ. خاوەن ماڵەکە دەڵێ: باوەڕت پێناکەم درۆ دەکەی. کابرا دەڵێ: دە بەتاقیم بکەوە، کیلۆیەک نان و کیلۆیەکم گۆشت بۆ دانێ بزانە چۆنت بۆ دەخۆم.

*****

یەکێک بە دۆستێکی دەڵێ: کە مردم چ دەکەی؟ لە وەڵامدا دەڵێ: لەپێشدا دەتشۆم

و کفنت دەکەم و دەتنێژم. کابرا گوتی: دە کاکە ئەوەی ئەوکاتە بۆم دەکەی بەکفن ئێستا بۆم بکرە، دەیکەم بە کراس و ئەگەر مردم بە ڕووتی بمنێژە.

*****

دۆستێکی (ئیبن و سەبابە) لە نامەیەکدا بۆی دەنوسێ دەڵێ: بەو خوایەی کە هەمووومان دەچێنە بەر دیوانی هیچم نیە، بڕێکم پارە بۆ بنێرە. لە وەلامدا بۆی دەنوسێتەوە و دەڵێ: ئەگەر درۆ دەکەی، خوا وەڕاستی بگێڕی.

*****

ئەفسەرێک بە سەربازێک دەڵێ: دا وەرە سەگە. سەربازەکە لە وەلامدا دەڵێ: گەورەم وا مەڵێ، چونکە بۆخۆت ئەفسەرمانی.

*****

(جاحیظ) دەڵێ: کابرایەک هات گوتی: نامەیەکم بۆ بنوسە بۆ فلان دۆستەت تا فلان ئیشم بۆ بکا. دەڵێ: لە نامەکەدا بۆم نوسی ئەو پیاوە ناناسم، حەقێکی بەسەرمانەوە نیە. ئەگەر کارەکەی بۆ بکەی هیچ سوپاست ناکەم و ئەگەر بۆشی نەکەی لۆمەت ناکەم. نامەکەم چەسپ کرد و دام بە کابرا. کابرا چوو بوو لە دەرەوە هەڵی پچڕی بوو، خوێندبوویەوە. هاتەوە ژوور و گوتی: ئەوە چیت نوسیوە؟ گوتم ئاخر ئەو جۆرە نوسینەم عەلامەت و نیشانەی ئەوەیە کە زۆر موبالات بەو کارە دەکەم. گوتی: ڕەببی ئەو دەستەت بە بڕین چی و لەعنەتی خوات لێ بێ. گوتم ئەوە بۆ وا دەڵێی؟ گوتی: ئاخر ئەوەش عەلامەت و نیشانەی منە، کە ویستم سوپاسی یەکێک بکەم.

*****

دەڵێن: باوکێک لە کوڕەکەی پرسی، ئەگەر پێم بڵێی خوا لە کوێیە، دینارێکت دەدەمێ. کوڕەکە زۆر وریا بوو گوتی: بابە گیان ئەگەر تۆ پێم بڵێی لە کوێ نیە، ئەمن دوو دینارت دەدەمێ.

*****

دەسەلاتدارێک قەسرێکی زۆر عەجایب دروست دەکا. ڕۆژێک تەواوی خەڵکی شارەکە بانگ دەکا و لە زوریەیان دەپرسێ سەبارەت بە قەسرەکە داخوا چ عەیبێکی هەیە. دەڵێن: زۆر بێ عەیبە. تا نۆرە دەگاتە سەر پیرە مێردێک و دەڵێ: مامە ئەو قەسرە چ عەیبێکی هەیە؟ کابرا دەڵێ: گەورەم تەنیا دەرگاکەی عەیب دارە. دەڵێ: دەرگاکەی بۆ عەیبدارە؟ دەڵێ: چونکە ڕۆژێک پێی دا دەچیتە دەر و ناگەڕێتەوە.

*****

پیاوێکی (قەلەڕەشی) لەکاتی پایزدا کە ترێ نایاب دەبێ ، بارێک ترێ دە بابۆ سەلیم ئاغای (کەناوێ). سەلیم ئاغا بە پیاوەکانی دەڵێ: بارێکی گەنم بۆ داگرن. کابرا بارە گەنم دەباتەوە و ساڵێ دوایی دوبارە بارەترێ دێنیتەوە و بارە گەنم دەباتەوە. تا دوو سێ ساڵ، هەموو پایزێک بارە ترێ دێنی و بارە گەنم دەباتەوە ئاخر جار کە بارە ترێکە دێنی سەلیم ئاغا بە پیاوەکەی دەڵێ: بارێکی مێوژ بۆ تێکەوە. بارە مێوژی بۆ دادەگرن و جارێکی دی کابرا نایەتەوە.

*****

دەڵێن: کابرایەکیان برد بۆلای قازی بۆ شاهیدی. شاهید لەسەردراوەکە گوتی: جەنابی قازی ئەو پیاوە بە شاهید ناشێ، چونکە دە هەزار دیناری هەیە و حەجی نەکردووە. شاهیدەکە گوتی: قوربان جەنابی قازی حەجم کردووە. شاهید لەسەردراوەکە گوتی: جەنابی قازی ئەگەر ڕاست دەکا حەجی کردووە، پرسیاری لێ بکە داخوا زەمزەم چۆن بوو؟ قازی پرسیاری ئاوی زەمزەمی لێ دەکا. لە وەڵامدا دەڵێ: جەنابی قازی لەپێش ئەوەدا کە بیری زەمزەم لێ بدرێ ئەمن چووم بۆ حەج.

*****

دەڵێن: لە پیاوێکیان پرسی مەبەست لەو کەسانە کێن کە خوای گەورە لەو نایەتەدا بە خەسارەتمەند لە قەڵەمیان دەدا کە دەفەرموێ: (قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً)، یانی پێتان بڵێم خەسارەتمەند لە کردەوەی خۆیدا کێ یە؟ کابرا لە وەڵامدا گوتی: خوا بەو کەسانە دەڵێ کە لەکاتی کاڵەکاندا چەقۆوی پێ نەبێ.

*****

کابرایەک لە ڕێگادا زۆری برسی دەبێ، لا دەداتە کلیسایەک ڕاهیبەکە دەچێ چوار نانی بۆ دێنی و تا دەچێ قاپێک نیسکینەی بۆ بێنی چوار نانەکە دەخوا. ڕاهیب دەچێ چوار نانی دی بۆ دێنی، تا دێتەوە نیسکینەکە دەخوا. تا دوو سێ جار تا ئەوی بۆ دێنی ئەویتریان دەخوا. کاتێ کابرا هەڵدەستی بڕوا، ڕاهیبەکە دەڵێ: ئەوە بۆ کوێ دەچێ؟ لە وەڵامدا دەڵێ: دەچم بۆ ئەردەن بۆلای دوکتۆر، مەعیدەم زۆر نەخۆشە هیچم پێناخورێ بزانم بۆم ناشوا. ڕاهیبەکە دەڵێ: کاتێ چویتە لای دوکتۆر و مەعیدەی بۆ شتی بێرەدا مەیەوە.

*****

جارێک لە شێخ (حەسەنی الکستی) دەپرسن دەڵێن: ئەرێ قوربان گوڵی بێ بۆن هەیە؟ لە وەڵامدا ئەو چوار خشتەکیە دەخوێنیتەوە کە دەڵێ:

وَ عالِمُ لا نَفْعَ فی عِلْمِهِ
وَلَمْ تَكُنْ أعمالُهُ صالِحة
فَهُوَ بِحُكْمِ الْعقلِ بينَ الْمَلا
كَوَرْدةٍ ليسَ لَها رائِحَه *

یانی عالمێک کە عیلمەکەی سودی نەبێ بۆ خەڵکی و کردەوەی چاکی نەبێ، ئەو عالمە بە حوکمی عەقڵ لە ناو خەڵکدا وەک گوڵی بێ بۆنە.

*****

پیاوێکی بەخیلی ڕژدی سەقیلی ڕەزا گران، زۆر هاتوچۆی لای پیاوێکی قسەخۆش دەکا. ڕۆژێک بە پیاوە قسە خۆشەکە دەڵێ: جەنابت کێت پێ لە هەموو کەس شاعیرترە لە وەڵامدا دەڵێ: (ابن الوردی) کە دەڵێ:

(غِبْ وَزُرْ غِبّاً تَزِدْ حُبّاً فَمَنْ اَكْثَرَ التَردادِ أعياهُ الْمَلَلْ.) یانی کەم کەم وەرە تا خۆشەویست تر بی و ئەوەی زۆر هاتوچۆ بکا زۆر ماندوو دەبێ و خۆشەویست نابێ.

*****

یەکێک دەڵێ: (سَمِعْتُ أعْمىً مَرّةً قائِلاً یا قومِ ما أصْعَبَ فَقْدُ الْبصر.) یانی گوێم لە کوێرێک بوو دەیگوت: خەڵکینە، نازانن کوێری چەند ناخۆشە؟ دەڵێ: (أجابَهُ أعْوَرُ مِنْ خَلْفِهِ عِنْدِیَ مِنْ ذالِك نِصْفُ الْخَبَرْ.) کابرایەک چاوێکی کوێر بوو، وەڵامی دایەوە و گوتی: ڕاست دەکەی، ئەمن نیوەی ناخۆشی کوێری دەزانم.

*****

دەڵێن: خەبەریاندا بە زانایەک کە فلا ن دۆستەت زۆر نەخۆشە، لە نامەیەکدا بۆی نوسی:

نُبِّئْتُ أنكَ مُعْتَلٌّ فَقلتُ لَهُمْ
نَفْسِی الْفداءُ لَهُ مِنْ كُلِّ مَحْذورِ
يا ليتَ عِلّتَهُ بی ثُمَّ كان لَهُ
أجرُ الْعليلِ وَأنّی غيرُ مأجُورِ

خەبەریان دامێ کە تۆ زۆر نەخۆشی. پێمگوتن یا خوا ئەمن بەفیدای ئەو بم و خۆزگە نەخۆشیەکەی وی بۆمن دەهات و سەوابەکەی بۆ ئەو دەبوو، با ئەمن بێ ئەجر و پاداشت بومایە.

*****

شاعیرێک دەڵێ:

إنّی بُلیتُ بِأرْبعٍ لَمْ یخلقوا
إلاّ لِشدةِ شقوقی وَعَنائی
أبلیسُ و الدّنیاونَفسی وَالهَوی
کیفَ الخلاصُ وَکُلهمْ أعدائی

ئەمن موبتەلا بووم بە چوار شت کە لام وایە ئەی چوار شتە هەر لەبەر بەدبەختی و نارەحەتی من دروست کراون. جا چۆن لە دەست ئەو چوارە ڕزگارم دەبێ کە هەر چواریان دوژمنی منن. کە شەیتان و دنیا و نەفس و هەوان.

*****

کابرایەک ناوی عیسا دەبێ، شاعیرێک زەمی دەکا و دەڵێ:

سمّوکَ عیسا وَلَمْ تأتِ بِمَکْرَمِةٍ
وَلَمْ تشابِهْهُ فی فضلٍ و لا أدبٍ
و ما اتیتَ بشییٍ مِنْ فضائِلِهِ
إلاّ بأنک مِنْ امٍ بِغیرِ أبٍ

بەخۆت مەنازە کە ناویان ناوی عیسا، تۆ هیچ کەرامەتێکت نیە و لە فەضل و گەورەیی و ئەدەبدا وەک ئەو ناچی، تەنیا لەودا وەک ئەو دەچی کە دایکت مەعلوومە، بەڵام باوکت نا.

*****

جارێک شاعیرێکی خەڵکی شاری (بەسرا) لە عەشیرەتی (بەنی دارم) بە (فەرەزدەق) شاعیر دەڵێ: شیعرەکانت زۆر وەک شیعرەکانی من دەچن، دایکت قەت چۆتە بەسرا؟ فەرەزدەق دەڵێ: دایکم نەچووە، بەڵام باوکم زۆر جار چۆتە بەسرا و میوانی بەنی داریان بووە.

*****

ئەبو عەلای مەعەرری) دەڵێ:

إذا ما ذَکَرنا آدَمَا وَفِعالَهُ
وَتزْوِیجُهُ أبْنَیهِ لِبِنْتَیْهُ فی الخَنا
عَلِمْنا بِأنّ الخلقَ مِنْ نسلِ فاجرٍ
وَأنّ جمیعَ الخلقِ مِن عُنْصُرِ الزِنا

ئەگەر ئێمە باسی حەزرەتی (ئادەم) و کارەکانی بکەین، بەتایبەتی کە کچی خۆی لە کوڕی خۆی مارە کردووە، دەبێ هەموو کەس وەلەدەلزنا بێ، بەڵام شەرعی وی

ئەسخ بۆتەوە.

*****

دوبارە شاعیرێک دەڵێ:

وَإنْ رَماكَ الدَّهْرُ فی مَعْشَرٍ قَدْ اَجْمَعَ النّاسُ عَلى بُغْضِهِمْ
فدا رِهِمْ ما زِلتَ فی دا رِهِمْ وَ أرْضِهِمْ ما دُمْتَ فی أرْضِهِمْ

ئەگەر گۆڕانی چەرخی زەمانە تۆی بردە ناو کۆمەڵێکەوە کە خەڵک زۆریان ناخۆش دەویستن، مادام لە خاکی واندای مودارایان لەگەڵ بکە و تا لە ئەرزی واندا بی ڕازیان بکە.

*****

( ئەسمەعی) دەڵێ: جارێک ڕێگام کەوتە ناو خێڵێکی عەرەبان و چوومە ماڵێک کیسێکم پارە پێ بوو دام بە ژنی ماڵەکە و گوتم ئەو پارەم بۆ هەڵگرە تا دەچم فلان کاری دەکەم و دێمەوە. دەڵێ: کە هاتمەوە و داوای پارەکەم کرد حاشای کرد، چوو لە لای شێخەکەیان شکایەتم لێکرد، بانگیان کرد و گوتی: درۆ دەکا پارەی لای من دانەناوە. شێخەکە گوتی: جا مادام شاهیدت نیە سوێندی لە سەرد، سوێندی بدە گوتم ئەی قوربان ئەو ئایەتەت نەبیستووە کە دەفەرمووێ: (فَلاَ تَقْبَلْ لِسارِقَةٍ يَمِيناً وَانْ حلَفَتْ بِرَبِ العالَمِينَ) یانی بە سوێندی دز باوەڕ مەکە با بەخواش سوێند بخوا شێخ گوتی: ڕاست دەکەی. هەڕەشەی لە ژنەکە کرد و ڕاستی گوت و پارەکەی بـ لێ ستاندمەوە. لەپاشان شێخ ڕووی تێکردم و گوتی: ئەو ئایەتە لە چ سورەتێـ دایە؟ گوتم: لە سورەی (ألا جُودِی بِوَصْلِکَ وأصْبَحِينا وَلاَ تَبْغِی وِصالَ ال قِصرِينَ) یانی تکایە بە وەسڵی خۆتم شاد بکە و داوای وەسلی بێ عەقلان مەکـ شێخ گوتی: (سوبحان اللّه) ئەمن وەمزانی لە سورەی (إنا فَتَحْنالَکَ فَتحاً مُبِينـ دایە. ئایا دەزانی کە (رَبّکَ فَکَبّر) یان (کُلٌ فی فَلَکٍ) لەهەر دوولاوە دەخوێندرێنەوە

*****

جارێک سەربازێک لە شەڕ ڕادەکا و دێتەوە. گەورەکەی دەڵێ: خوا بەخێر نەهێنیتەوە، ئەوە بۆ هەڵاتی و خۆت ڕانەگرت؟ سەربازەکە دەڵێ: ئاخر گەور ئێستا کە زیندووم جنێوم پێ بدەی پێمخۆشترە لەوەی کە بکوژرامایە و بتگو تا خوا عەفووی کا.

*****

شاعیرێک دەڵێ:

یَعیبُ الناسُ کُلُّهُمُ الزَّما نا

مَا لِزَمَانِنَا عَيْبٌ سِوَانَا
نَعِيبُ زَمَانَنا وَالْعَيْبُ فِينا
وَلَوْ نَطَقَ الزَمانُ إِذًا هَجانَا

واته خەڵک هەمووی لۆمەی زەمانە دەکا و زەمانی ئێمەش هەر ئێمەی عەیبدارین. ئێمە زەمانە عەیبدار دەکەین بەلام عەیبەکەی لە خۆمان دایە. ئەگەر زەمانە زمانی ببوایە زۆری لۆمە دەکردین.

*****

دەڵێن: کاتێ (حاتەمی طائی) دەمری، براکەی دەیەوێ وەک ئەو ناوبانگ دەرکا و سەخاوەت بنوێنێ. دایکی دەڵێ: کورم خۆت ماندوو مەکە، تۆ قەت وەک حاتەم نابی. دەڵێ: دایە بۆ ئەمن برای ئەو نیم؟ بۆ وەک ئەو نابم؟ دایکی دەڵێ: چونکە بە منداڵی کە مەمکم بۆ ئەو دەردێنا، نەیدەگرت تا مەمکەکەی دیم نەدایە بە منداڵێکی دی، بەلام تۆ کە چاوت بە منداڵێک دەکەوت تا دەرت نەکردایە مەمکەکەت نەدەگرت.

*****

جارێک لە (ئەعمەش) دەپرسن دەڵێن ڕاستە دەڵێن: کەسێک لە شەو و ڕۆژی جومعەدا بمری خوا عەزابی قەبری لەسەر هەڵدەگری؟ لە وەلامدا دەڵێ: وانیە بۆ شەو و ڕۆژی دیکەی لێ قات بوون؟ لە شەممەدا عەزابی دەدا.

*****

پیاوێکی زۆر ناشیرین دەچێ بۆ وەلاتی (یەمەن) تەماشا دەکا ئەو لە هەموو خەڵکی یەمەن جوانترە، دەڵێ:
لَمْ أَرَ وَجْهاً حَسَناً مُنْذُ دَخَلْتُ الْيَمَنا
فَيا شَقاءَ بَلْدَةٍ أَحْسَنُ مَنْ فِيها أَنا

یانی لەو ڕۆژەی هاتوومە یەمەن جوانێکم نەدیوە، ئای چەند بەدبەختە ئەو شارە کە جوانترین کەسی ئەمن بم.

*****

شێخ (ئەبو لفەتح ) دەڵێ:
إِلىٰ حَتْفِي سَعىٰ قَدَمِي
أَرىٰ قَدَمِي أَراقَ دَمِي

واتە پێی خۆم بردمی بۆ لەبەین چوون. دەبینم هۆی خوێن ڕژانم هەر پێی خۆم بوو.

*****

ئیمامی (شافیعی) دەفەرمووێ:

لَوْاَنَّ بِالْحَبْلِ الْغِنیٰ لَوَجَتَّنی بِنجُوْمِ أفلاکِ السّماءِتعلقی

ئەگەر دەوڵەمەندی بە خۆهەڵاوەسین بوایە، منت دەدی خۆم وەئەستێرەکانی ئاسمانێ هەڵداوەسی. (لکِنَّ مَنْ رُزِقَ الْحِجیٰ حُرِمَ الْغِنیٰ ضدانِ مفترقانِ أیّی تَفَرُّقِ)، بەڵام بەزۆری ئەوەی عەقڵی درایە لە دەوڵەمەندی مەحروم دەکرێ. زانیاری و عەقڵ و دەوڵەمەندی دوو شتی پێچەوانەی یەکترین و زۆر لێک دوورن. (فَاذا سَمِعْتَ بِاَنَّ محروماً اَتیٰ ماءًلِیَشْرِبَهُ فَغا ضَ فَصَدِّقِ.) ئەگەر بیستت هەژارێک چۆتە سەر ئاوێک، ئاو وەخوا و خنکاوە باوەڕ بکە. (اَوْاَنّ مَحظوظاً غَدافی کَفِهِ عُودُ فَاَوْرَقَ فی یَدَیْهِ فَحَقِقِ.) یان ئەگەر بیستت دەوڵەمەندێک دارێکی بەدەستەوە بوو لە دەستیدا شین بۆوە، بە درۆی مەزانە. (وَمِنَ الدّ لیلِ علی الْقضاءِوَ کَوْنِهِ بُؤْسُ اللّبیبِ وَطیبُ عَیْشِ الأَحْمَقِ.) کەواتە هەموو شتێک بەقەزا و قەدەرە. بەڵگەش لە سەر قەزاو قەدەر، دەست کورتی و هەژاری ئینسانی ئەدیب و قسەخۆشە و خۆش گوزەرانی پیاوی ئەحمەقە.

*****

بە کابرایەکی عەرەبیان گوت: ئەوە مانگی ڕەمەزان هات خۆتی بۆ حازر کە. لە وەڵامدا گوتی: جا با هەر بێ، بەخوا بەهۆی سەفەرانەوە چاوی پێ ناکەوم.

*****

شاعیرێکی قسەخۆشی دیکە دەڵێ:

عَتِبْتُ علی الدّ نیا بِتَقْدِیم جا هِلٍ

وَ تاْخیرِ ذی لُبٍّ فَاَ بْدَ تْ لِیَ العُذْرا

لۆمەم لە دنیا گرت و گوتم: تۆ زۆر سەیری بەپێچەوانەی عەقڵ ڕفتار دەکەی. لە وەڵامدا عوزری هێنایەوە و گوتی: عەفووم کە، بۆ لۆمە کردن نابم ، چونکە:

بَنوُ الجهلِ اَبْنا ئِی وَاُمّاً اُو لُو النُّهیٰ

فَاِنَّهُمْ ا بْناءُضَرَّتِی الاُ خْریٰ

ئەوانەی نەزان و نەفام و جاهیلن کوڕی منن، بەڵام خاوەن عەقڵ و زاناکان کوڕی هەوێکەمن.

*****

سەبارەت بە ڕزق و ڕۆزیش زانایەک دەڵێ:

الرزقُ کا لْغیثِ بینَ النّا سِ مُنْقَسِمٌ

هَذ ا غریقُ وَ هذا یَشْتَهِی المطرَ

رزق و ڕۆزی وەک باران وایە، لەبەینی خەڵکدا دابەشکراوە، دەبینی یەکێک بەهۆی بارانەوە غەرق دەبێ و دەخنکێ، یەکی دی خوا خوایەتی باران بباری.

*****

ئافرەتێک زۆر هەژار و دەست کورت دەبێ. ڕۆژێک دەچێ بۆلای (قەیسی) کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە و دەڵێ: قوربان هاتوومە خزمەتت بۆ شکایەت لە جرج و مشکان، ئەوە چەند وەختە کە یەکیان ڕوو دە ماڵەکەی من ناکا. قەیس حاڵی دەبێ و دەڵێ: بەڕاستی کینایێکی جوانە. بە پیاوەکەی دەڵێ: کوڕم بچۆ کندووەکانی بۆ پڕ بکە لە گەنم و جۆ.

*****

شاعیرێکی دی بە فارسی دەڵێ:

ئەگەر غەم را چو ئاتەش دود بودی

جیهان تاریک بودی جاویدانە

ئەگەر غەم و ناڕەحەتی دنیا وەک ئاور دووکەڵی ببوایە، هەتا هەتایە بەهۆی دووکەڵی غەم و خەفەتەوە دنیا تاریک دەبوو. وە ئەگەر هەر چوار قوڕنەی دنیا بگەڕێی زانایەکی دڵخۆشت دەست ناکەوێ.

*****

شاعیر دەڵێ:

شنیدەئەم کە بەهیشت ئان کەسی تەوانەد یافت

کە ئاردزو بردسانەد بە ئاردزومەندی

بیستوومە کە کەسێک بەهەشتی دەست دەکەوێ کە ئارەزووی ئاردزومەندێک بەجێ بێنێ.

*****

شاعیرێک دەڵێ:

ئەز دوور بەدیداری تو ئەندر نگەریستەم

مەجروح شود ئان چیهرەی پڕ حوسن و مەلاحەت

یانی لە دوورەوەڕا لە دیداری تۆم ڕوانی و تەماشام کردی، بەهۆی ڕوانینەکەی منەوە ئەو ڕەنگ و ڕوخسارە جوانەت بەداخەوە ڕوشا و برینداربوو.

ئەز غەمزەیی تو خەستە شود ئازوردە دلی مەن.

وین حوکم خودایست جەڕاحەت بە جەڕاحەت.

لەولاشەوە بە غەمزەی چاوی مەستی تۆ دڵی من بریندار و ناڕەحەت بوو. جا با

برینداری ڕوخساری تۆ و دڵ برینداری من، وەک خوا فەرموویەتی: تۆڵە بە تۆڵە بێ و هیچمان لە هیچمان گلەیی نەکەین.

*****

شاعیر دەڵێ:

ڕاد مەردی بە دەهر دانی چیست
با هونەر تەرز و خەلق دانی کیست
ئانکە با دوستان بدانەد ساخت
وانکە با دوشمنان بدانەد زیست

دەڵێ: دەزانی لە دنیادا کێ عاقڵ و زانایە و کێ لە هەموو کەس هونەرمەندترە؟ ئەو کەسە کە بزانی دۆستان بگری و لەگەڵ دوژمنان بزانی بژی و مودارا بکا.

*****

شاعیر دەڵێ:

غەڕرە مەشەو بەدانکە جیهانت عەزیز کەرد
ئەی بەس عەزیز را کە جیهان کەرد زود خوار
ماردست این جیهان و جیهان جوێ مارگیر
وەز مارگیر مار بەرئارد شەبی دەمار

یانی کاتێ دنیا پلە و پایەی دا بەتۆ، وریا بە لە خۆت بایی نەبی، چونکە دنیا زۆر جار ڕوو لە ئینسان وەردەگێڕی و دەیهێنیتەوە سەر هەواری خاڵی. ئەو دنیایە وەک مارە و دنیا پەرستیش وەک مارگر، زۆرجاری وایە مار شەوێک بە مارگردوە دەدا و دەماری لە ڕۆزگار دەردێنی.

شاعیر دەڵێ:

ئەگەر مەمالکی ڕوی زەمین بەدەست ئاری
وەز ئاسمان بروبایی کلاهی جەبباری
وە گەر خەزاینی قارون و مولک جەم داری
نەیەرزەد ئانکە وجودی بیازاری

ئەگەر تەواوی گورەی زەی بێتە ژێردەسەڵاتی تۆوە و کڵاوی دەسەڵات لەسەر سەری ئاسمان بفڕێنی و خاوەنی خەزنەی قارون و جامی جەم بی، ئەوەندە ناهێنی کە تۆ دڵی ئینسانێک برەنجێنی.

*****

شاعیر دەڵێ:

یەکی پرسید ئەزان شوریدە ئەییام
کە تو چ دوستداری کوفت دشنام.
هەر چیز دیگەر کە میدەهەندەم
بەجوز دشنام مینتەت می نەهەندەم

*****

یەکێک لە پیاوێکی دێوانە و شێتی پرسی کە تۆ چیت خۆش دەوێ؟ لە وەڵامدا گوتی: جنێو پێدان، پێمخۆشە جنێوم پێبدەن، چونکە هەرشتێکی تر کە بمدەنێ منەتم لەسەردا دەنێن جنێو نەبێ.

*****

پرسیار و وەڵام
هەر سوئالی کز ئان لبی سیراب
دوش کەردەم هەمە بداد جەواب
دەڵێ: هەر پرسیارێکی شەوێ دی لە خۆشەویستە دەم پاراو و لەفزشیرینەکەم کرد، وەڵامی دامەوە.
گوفتەمەش جو زشەبەت نەبایەد دید؟
گوفت پەیدا بە شەب بوەد مەهتاب
بە دۆستەخۆشەویستەکەم گوت: وا دیارە کە بەشەو نەبێ تۆ نابیندرێی؟ لە وەڵامدا گوتی: ئاخر مانگ بەشەو وەدەر دەکەوێ
گوفتەم ئاتەش بە چیهرەئەت کە فرۆخت
گوفت ئان کو دلی تو کەرد کەباب
گــوتم ئەرێ ئەوە کێ ئەو ئاگــری ئەوینەی لە ناو چاوانی تودا هەڵکرد و پێی فرۆشتی؟ لە وەڵامدا گوتی: ئەو کەسەی کە دڵی تۆی وەک کەباب برژاندووە.
گوفتەم ئەز حاجب تو تابەم رووی
گفت کەس روی تابەد ئەز میحراب
گوتم ڕوو لە برۆیانت وەرگێرم؟ لە وەڵامدا گوتی: جا کەسی موسوڵمانت دیوە ڕوو لە میحراب وەرگێڕی؟
گوفتەم ئەندەر عەزاب عیشقی تۆئەم
گوفت عاشق نیکی بوەد بە عەزاب
گوتم ئەوە بۆ بەزەییت بەمندا نایەتەوە لە عەزابی عیشقی تۆدا مردم. لە وەڵامدا

گوتی: قەیدیٚ ناکا، عاشق بە عەزابەوە جوانە.

دەڵێن: پیرێژنێک کچێکی زۆر جوانی بە ناوی (مەهەستی) و سێ مانگای هەبوو لە گوندی (تەکاو). کچەکەی زۆر خۆش دەویست.

*****

ڕۆژیٚ چەندجار دەیگوت: ڕۆڵە یاخوا مەرگم وەپێش مەرگیت کەوی. تا ڕۆژێک کچەکە چاوەزار کاری تێکرد و نەخۆش کەوت. کچ کە وەک مانگی شەوی چواردە بوو، وەک مانگی یەک شەوە باریک بوو یەکێک لە مانگاکانی پیرێژن چوو بۆ ژوورەوە و سەری خستبۆ ناو دیزێکەوە و بۆی نەهاتبۆوە دەرەوە سەر بە دیزەوە ڕادەکاتە دەرەوە. پیرێژن کە چاوی پێدەکەوی زۆر دەترسی و وەدەزانی کە ئەوە حەزرەتی ئیزرائیلە هاتووە گیانی بکێشی. هاوار دەکا و دەڵیٚ: ئەی بە قوربانت بم خۆ ئەمن مەهەستی نیم. ئەوەتا مەهەستی کچم لەو ژوورە دایە، نەخۆشەکە ئەوە.

*****

زوربەی مێژوونووسان دەڵێن: یەکەم کەس کە شیعری داناوە حەزرەتی (ئادەم) بووە کە سەبارەت بە کوشتنی (هابیلی)کوری دەڵیٚ:

تَغَيَّرَتِ اَلبِلادُ وَمَنْ عَلَيْها فَوَجْهُ الارْضِ مُغَبَّرٌ قَبِيحُ

یانی وڵات و ئەوەی لەسەر وڵاتە گۆڕاوە و ڕووی زەوی زۆر تۆزاوی و ناشیرین بووە.

تَغَيَّرَ كُلُّ ذِي طَعْمٍ وَلَوْنٍ
وَكُلَّ بَشا شَةِ الوجهِ الصبيحُ

واتە هەرچی خاوەن تام و ڕەنگ بوو گۆڕاوە و ڕووخۆشی ڕووخۆشان زۆر کەم بۆتەوە.

فَوا أُسَفا على هابِيلَ إبنِي
قَتيلُ قَدْ تَضَمَّنَهُ الضريحُ

دەڵیٚ: ئەی داخی بە جەرگم بۆ هابیلی کوڕم کە کوژرا و گۆڕ دەباوەشی خۆی گرت، بەڵام دەڵێن زمانی حەزرەتی ئادەم سریانی بووە و شیعرەکەیان وەرگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

*****

تەماشا ئەو شیعرە کەن چەند جوانە کە (سەنائی غەزنەوی) لە مەتحی شێخ (بایەزیدی بەستامی)دا داینایوە و دەڵیٚ:

روزەها بایەد کە تا گەردون گەردان یەک شەبی

عاشقی را وەصل بەخشەد یا غەریبی را وەطەن

دەڵێ: دەبێ چەندین ڕۆژ بێن و بڕۆن و هاتوچۆ بکەن، تا چەرخی گەردوون بە ڕێکەوت شەوێکی عاشقێک بە مراد و بە وەسڵی مەعشووقە بگەیێنێ، یان غەریبێک بگەڕێتەوە بۆ وەڵاتەکەی.

هەفتەها بایەد کە تا یەک مشت پەشم ئەز پوشتی میش

زاهیدی را خەرقە گەردەد یا حیماری را ڕەسەن

دەڵێ: کار هەروا ئاسان نیە، دەبێ چەندین حەوتوو تێپەڕن تا چنگێک خوری لە پشتی مەڕێک دەکرێتەوە، جا یان دەکرێ بە خەرقەی عابیدێک، یان دەیڕیسن و دەیوەننەوە بۆ ئاو ساری کەرێک.

ماهەها بایەد کە تا یەک پەنبە دانە زئاب و گل

شاهیدی راحلە گەردەد یا شەهیدی را کەفەن

چەندین مانگی پێدەوێ تا قۆزاخەی لۆکە لەنێو ئاو و گڵ بێتە دەرێ و بپشکوێ و ساز بکرێ. جا یان دەیکەن بە بەرگی جوانێک، یان دەیکەن بە کفنی موسوڵمانێک.

سالەها بایەد کە تا یەک کودەکی ئەز ذات طەبع

عالمی دانا شەوەد یا شاعیری شیرین سوخەن

سالەهای پێدەوێ تا منداڵێک هەڵدەکەوێ دەبێتە زانایەک یان دەبێتە شاعیرێکی قسەخۆش.

عومرەها بایەد کە تا یەک سەنگی خارا ز ئافتاب

دەر بەدەخشان لەعل گەردەد یا عەقیق ئەندەر یەمەن

دەڵێ: دەبێ چەندین عومر تێپەڕن تا بەردێکی ڕەق بەهۆی تیشکی ڕۆژەوە ببێتە لەعلی بەدەخشان یان عەقیقی یەمەنی.

قەرنەها بایەد کە تا ئەز نوطفی حەق پەیدا شەوەد

با یەزیدی دەر خوراسان یا ئووەیسی دەر قەرەن.

دەڵێ: چەندین قەرنی پێدەچێ تا خواوەندی گەورە بە لەتف و کەرەمی خۆی بایەزیدێک لە وڵاتی خوراسان و وەیسەلقەرەنێک لە ناو خێڵی قەرەنیاندا بەهرەمەند دەکا.

*****

شێخ ( عومەر یافی) لە باسی گەورەیی ئال و بەیتدا دەڵێ: (سَفِينَةُ نُوحٍ آلُ بيتِ محمدٍ. فَمَنْ كانَ فيها راكِباً صادَفَ النَّجا.) ئال و بەیتی (پێغەمبەر)

دروودی خـوای لەسـەر بێ وەک کـشـتی حـەزرەتی (نووح) وان، ئەوەی دەست بە داوێنی ئەوان بگری و بە ڕێگای ئەواندا بڕوا ئەوە ڕزگاری دەبێ.

وَ اَمّا الّذی عَنها تخلف هالِکٌ غریقٌ ببحرِ الغَیّی لَمْ یَلْقَ مَخْرَجا.

دەڵێ: بەڵام ئەوانەی پەیڕەوی ئال و بەیت نەکـەن و لە ڕێبـازی ئەوان لا بدەن و موخالەفەیان بکەن، ئەوە بەهیلاک دەچن و لە دەریای بێ پایانی گومڕاهیدا غەرق دەبن و ڕێگای دەرباز بوون نابیننەوە.

*****

مامۆستا مەلا (عیصام الدین )ی شەفیعی دەڵێ:

ساقیا گۆ نگار فرخ را

کە بیەنداز پەردەیی ڕوخ را

بوسەها ئەز وەی ئارەزو دارەم

وَلِیَ فیها مآربَ ئُخرا.

ئەی ساقی بە یارە نازدارە ڕوو خۆشەکەم بڵێ: پەردە لەسـەر ڕووخساری لابا، چونکە ئارەزووی چەند ماچێکم هەیە لێی بکەم و چەند کارێکی دیکەشم پێیە.

مامۆستـا مەلا (عیصـام الدین )ی شـەفیعی زۆر بەجوانی موعجیزەی ئایەتی (عـەصـا)ی حـەزرەتی (مـوسـا)ی لەو شـیـعـرەدا بەکـار هێناوە. یان چەند ناسک خەیاڵەکە بە کوردی دەڵێ:

من کە شەیدای عیشقی تۆم مەستم

چی دەڵێ دوژمنم ع دەربەستم

لەبی لەعلت خنێوی دابوو بەمن

ڕقی بنیا دەمە منیش گرتم

*****

یان (حافظ)ی شیرین کەلام چەند جوان دەڵێ:

جایەکە بەرق عصیان بەر (ئادەم ) صفی زدە.

ما را چگونە زیبەد دەعوی بیگوناهی.

لە جێیایەکی کە بەرق و بروسکەی گوناح لە حەزرەتی ئادەم بدا کە صفی اللّەیە، ئێمە چۆن دەتوانین داوای بێگوناحی بکەین یان کە دەڵێ:

چو بشنەوی سوخەنی ئەهلی دل من گو کە خەطاست

سوخەن شناس نەئی جان مەن خەطا ئین جاست

*****

کاتێ گوێت لە قسەی ئەهلی دڵ و عارفان و پیاوچاکان بوو، کە لەگەڵ عەقڵ و زانیاری تۆدا نەدەهاتەوە، مەڵێ ئەوە وانیە، خەتاکە لە قسەی وانەوە نیە، بەڵکێ تۆ نەگەیشتوویە ئەو پلە و پایە کە لە قسەکەیان بگەیت، کەوایە خەتاکە لە تۆوەیە یان کە دەڵێ:

موشکلی دارەم ز دانشمەندی مەجلیس بازپرس

تۆ بەفەرمایان چرا خود تۆبە کەمتەر میکونەند

دەڵێ: موشکیلێکم هەیە، تکایە تۆ لە وەکالەتی منەوە بچۆ لە زانا و واعیزی مەجلیس بپرسە و بڵێ ئەوە بۆ ئەوان کە بە خەڵک دەڵێن تۆبە بکە، زۆر بەکەمی بۆ خۆیان تۆبە دەکەن، هۆیەکەی چیە؟

*****

دەڵێن: لە درۆزنێکیان پرسی: ئەرێ قەت ڕاستت گوتووە؟ لە وەڵامدا گوتی: لەوە دەترسم، ئەگەر بڵێم (نا) ڕاست بڵێم دەنا وەڵامم دەدانەوە.

*****

دەڵێن: ئاغایەکی مەنگوڕ برایەکی دەمری، کاتێ دەیشۆن و کفنی دەکەن و دەیبەن بۆ سەر قەبران و دەینێژن، مەلا تەلقینی دادەدا و لەکاتی گەڕانەوەدا براکەی دەڵێ: کاکە جا بڵێم چی؟ ئەگەر تەماشا گفت و لفت و قسەکانت دەکەم، کە ئەوەندە زمان لووس و قسەخۆش بووی، دەڵێم وەی بەقوربانی ئەو دەم و لێوەت بم، بەڵام کە بیر لە کردەوەکانت دەکەمەوە، دەڵێم ئی منت دەعەمەلان.

*****

خوێنەری بەڕێز ئاخر سەرخەرمانم لە وەرزی سەرخەرمانانندا خەرمانی شێخ (نظامی گەنجەویە)، جا ئەوە پاکی دەکەم و هەڵبژاردەکەی بە سەرکێ خەرمانلۆغەکەمدا دەکەم، کە لام وایە تەمەن زۆر زەحمەتە مۆڵەتم بدا تا ساڵێکی دیکە و بچمەوە سەر خەرمانان و سواڵێکی دیکەتان بۆ بکەمەوە، کە بە فارسی دە فەرمووێ:

دەرین چەمەن کە ز پیری خەمیدە شد کە مەردم

ز شاخەهای بەقا بەعدە زین چ بەهرە بەرەم

ئاخ، تازە هیچم بۆ ناکرێ، چونکە لە ناو چەمەن و باغ و باغاتی ژیانی دنیادا پشتم چەمیوەتەوە و داری قەدم دووڵا هاتۆتەوە، تازە لە لەخێ داری بەقا و ژیان دەتوانم چ بەهرەیەک بەرم؟

نە سایەییست ز نەخلەم نە میوەیی کەس را

که توند بادی حەوادیس بریخت بەرگ و بەرەم

بەداخەوە دار خورمای قەد و بالام نە سێبەری هەیە کەس لەبنی دانیشی و تاوێک وەحەسێ، نە میوەی بۆ کەس پێوەیە تۆزێکی لێ بکاتەوە و بیخوا. چونکە بای کارەساتی دنیا هەڵی کردو گەڵا و بەرەکەی هەڵوەراندووە و هیچی پێوە نەهێشتووە.

دو رشتە پر ز گوهەر بود دەر دەهان ما را

جەفای چەرخ گوسست و بریخت ئان گوهەرەم

دوو ریز گەوهەری نایابی پڕ بەناو زارم لە ناو دەمم دا بوون، بەڵام چەرخی جەفاکار زۆر بەبێ بەزەیی هات هەمووی هەڵوەراندن

گوهەر بریخت ز دور جەم ستارەسان چو دەمید

ز سەو بی مەشرق حرمان ستارەی سەحەرەم

چۆن ئەستێرە رادەکشێن و هەڵدەوەرن، کاتێ ئەستێرەی بێبەشی و مەحرومبونی من هەڵات ئاوا گەوهەرەکانی هەڵوەراندن.

نهال چون سەمەر ئەفشاند راست گەر دەدلیک

خەمید نەخلی قەدەم چون فشاندە شد سەمەرەم

لەخەداری خاوەن بەرو میوەکە بەرەکەی لێبوەوە ڕاست دەبێتەوە، بەڵام دار خورمای قەدی من بەپێچەوانەوە، کاتێ بەرەکەیان لێکردەوە دولا هاتەوە

نشست برف گران بەر سەرەم ز موی سفید

ز پەست گەشتەنی بامی قەدەم دەرخەتەرەم

بەهۆی سپی بونی مووی سەرمەوە بەفرێکی گران لەسەر سەرم باریوە، ئەوە قەیدێ ناکا، بەڵام لەوە دەترسم بانی وجودم بتەپی، لەبەرگرانی ئەو بەفرە.

ز قوللەی کە بەرو بەرف باشد ئاب ئایەد

ئەزین سەبەب کە بشکست بال و پەرەم.

ئاخر لومەم مەکەن کەوا نارەحەتم، چونکە توقە سەری کێوێک کە بەفری پێوە بوو. بەفرەکەی دەتوێتەوە و ئاوی لێ دێتەخوارێ، جا هۆی ئەوەیە کە من لە ئێستاڕا پەڕ و باڵم شکاوە.

دوتا شودەم کە نە یالایەدەم بە خون دامەن

کە خونفشان شودە چەشم ئەز تەراوشی جگەرەم

بەخۆڕایی نیە کە دوولا هاتومەوە؛ لەبەر ئەوەیە کە مەبادا داوێنم خۆیناوی بکەم، چونکە بەهۆی لەت لەت بوونی جەرگمەوە چاوم. خوێنی لێ دەتکێ و خوێن فشارەی

کردووه.

بەسوی ئەوجی فەراغەت چونان کونەم پەرواز

ئەزین حەضیض کە بشکستە ئەست بال و پەرەم

ناچارم بفرم و پەرواز بکەم بۆ ئەوجی فەراغەت و بەرزایی لەو جێگا نزمە، چونکە بەراستی، تازە پەڕ و باڵم شکاوە.

زمەن کەسی نەکونەد یاد زانکە نەتوانەم

ز زحفی حال کە بەرخاتری کەسی گوزەرەم

کاکە گیان: تەنانەت کەسیش یادی من ناکاتەوە، چونکە ئەوەندە حاڵم زەعیف و پەریشانە، توانای ئەوەندەشی نیە کە بەخەیاڵی کەسیش دابچێ.

بە یاضرا نەکونەد فەقر دیدەئەم ز سواد

ئەگەر چی بە روز فروزەند شومعی ماە خورەم

چاوم وایان بەسەر هاتووە فەرقی ڕەش و سپی ناکەن و شەو و ڕۆژیان بەلاوە وەک یەکە، با بە ڕۆژ ڕۆژیش بەدەرەوە بێ یان بە شەو مانگە شەو بێ.

چونان لەرزە بە دەستەم فتاداد ئەز ردعشە

بەبەزمی دە هرچ سان ساغری نیشات خورەم

دەستم ئەوەندە لەرزۆک بوون و لە کەڵک کەوتوون، تازە لەبەزم و ڕەزمی دنیادا چۆن دەتوانم پیاڵەی شەرابی ژیان و خۆشی بە دەستەوە بگرم. جا خوێنەری بەڕێز، بۆ ئاسان خوێندنەوەی هێندێک کوردی فارسی نەزان بە ڕێنوسی کوردیم شیعرە فارسییەکان نوسیەوە بۆ ئاگاداریت.

جا لە کۆتایی ئەو سواڵ و کۆکردنەوەی ئەو خەرمانلۆغەدا عەرزتان دەکەم، ئەگەر خوا کردی و لە چاپ درا و کەوتە بەردەستی ئێوەی بەڕێزی کورد زمان و خوێندتانەوە و بە دڵتان بوو، بە دوعایەکی بەخێر، یادم بکەنەوە. منیش هەر لە ئێستارا دوعاتان بۆ دەکەم و دەڵێم:

آ زا لَ اللّٰهُ عَنکُمْ کُلَّ آفَةٍ+کَنوُنِ اَلجَمْعِ فِی حالِ الاِ ضا فَه

**برای دووره ولاتتان : محەممەدی شلماشی**

**١٥/ ٨/ ١٩٩٩**

## بەرهەمەکانی خاوەنی خەرمان لۆغە

١- تەفسیری سورەتی فاتیحا

٢- باوەشێنی دل ، کۆمەلە شیعرێکە

٣- ئاوێنە ، شێست و دوو چیرۆکی مەسنەوی مەولانای رۆمی

٤- تیشکی مینبەر ، وتاری رۆژانی هەینی عەرەبی و کوردی

٥- کۆری ئامۆژگاری

٦- وتاری رەمەزان

٧- ژیانی پێغەمبەران

٨- مەجلیسی ئامۆژگاری

٩- دەنگی مینبەر ، وتاری رۆژانی هەینی عەرەبی و کوردی

١٠- مەجلیسی ئەولیا بەرگی ١ و ٢

١١- مەولود نامە

## ئەو بەرهەمانەی خاوەنی خەرمان لۆغە کردوویەتە کوردی

١- بینەوایان ، ڤیکتۆر هۆگۆ ، لە عەرەبییەوە کراوە بە کوردی

٢- بێ سەرپەرشتان ، لە فارسییەوە کراوە بە کوردی

٣- دیمەنی مەرگ ، لە فارسییەوە کراوە بە کوردی

٤- چیرۆکە کورتەکانی تولستۆی ، لە فارسییەوە کراوە بە کوردی

٥- سەد غونچە لە گولزاری شێری خودا ، لە عەرەبی و فارسییەوە کراون بە کوردی

٦- چەند داستانێکی عاشقانە ، لە فارسییەوە کراوە بە کوردی ، بەلام ئێستا چاپ نەکراوە

له کۆتاییدا پڕ بەدڵ سوپاسی دۆستی خۆشەویست کاک حامیدی گەوهەری دەکەم کە بەڕاستی لەو خەرمان لۆغەدا زۆری زەحمەت کێشا تا بەتەواوی لە کەوو ، قەڵبیرو ، بێژینگی دا و ئاوا بە پوختی و ڕێک و پێکی هاتە بەردەستی ئێوەی بەڕێز.